سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی ١٨

زریان حاجی

# ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا

## لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا

١٣٢- ٢٣٢ك / ٧٤٩- ٨٤٧ز

لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی شارستانییە



ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا

زریان حاجی

بابەتی کاریگەری و پێکدادان و ململانێی شارستانیەتەکان، یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی کە لە ئەمڕۆدا زۆرێک لە ناوەندە ئەکادیمی و ستراتیژیی و بیریار و فەیلەسووفان و میدیاکانی جیهانی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە، کە هەوڵ دەدەن لایەنە شاراوەکانی کلتووری و سیاسی و زانستی و فیکرییەکانی ناو هەر یەک لەو شارستانیەتانەی جیهان دەربخەن و لە ڕاددەی کاریگەریی بوون و پەیوەندیی و ململانێی نێوانیان بکۆڵنەوە، تا لەو ڕێگایەوە دیاردە و ڕووداوەکانی جیهان شیکار بکەن، لێرەوە چەندین تیۆری گەورە لە بوارەکانی بەدواداهاتنی شارستانیەتەکان و دروستبوون و نەمانی شارستانیەتەکان بە کاریگەریی یەکتری هاتوونەتە کایەوە.

سەرباری گرنگیی بابەتەکە و زۆریی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەری کراون، کە چی تا ئێستا وەک پێویست لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەگ و ڕیشە مێژووییەکانی نەکراوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە فەرامۆشکردنی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە و دەرنەختنی ڕۆڵ و کاریگەرییەکانی شارستانیەتەکان لەسەر یەکتری لە مێژوودا، بە تەواویی لێکۆڵینەوەکانی ئەم سەردەمە تووشی ناتەواوی و بێ ناوەڕۆکیی دەکات.

لێرەوەیە کە گرنگیی بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە دەردەکەوێت بە ناونیشانی (ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا، کە لێکۆڵینەوەیەکی فیکریی مێژوویی شارستانییە).

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (١٨)

# ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا

## لەسەردەمی عەبباسیی یەکەمدا
## ١٣٢ – ٢٣٢ك / ٧٤٩ – ٨٤٧ز

### لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی، شارستانییە

نووسینی:
زریان حاجی

چاپی یەکەم
١٤٣٣ ك    ٢٠١٢ ز

ناوی کتێب: ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامیدا،
لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا ١٣٢ – ٢٣٢ك / ٧٤٩ – ٨٤٧ز
نووسینی: زریان حاجی.
لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی و
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی، ژمارە (١٨).
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٣١٥ )ی ساڵی (٢٠١٢)ی دراوەتێ.
چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٢.
چاپخانە: شڤان.
تیراژ: (٥٠٠) دانە.
ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

ئەم پەرتووكە لە بنەڕەتدا تێزی ماستەری نووسەرەكەیەتی، كە وەك بەشێك لە پێداویستیەكانی بەدەستهێنانی پلەی ماستەر لە بواری مێژووی شارستانیەتی سەدەكانی ناوەڕاست، لە ساڵی (٢٠٠٨ز)پێشكەشی بەشی مێژووی كۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەكانی زانكۆی سلێمانی كردووە، پلەی ماجستێری بەپلەی (زۆرباش) پێ بەدەست هێناوە.

لیژنەی گفتوگۆ پێك هاتبوون لە:

پ.د. زرار صدیق تۆفیق ـ سەرۆك

پ.ی.د. قادر موحەممەد حەسەن ـ ئەندام

د. عەتا عەبدوڕڕەحمان محێدین ـ ئەندام

پ.ی.د. حوسامەددین عەلی غالب نەقشبەندیی ـ ئەندام و سەرپەرشتیار

پێشکەشە بە:

* ئەندامانی خێزانەکەم کە فێری خۆشەویستی و بۆ یەك ژیان و دڵسۆزی و سۆزدارییان کردم و زۆر خۆشیی ژیانیان پێ بەخشیم.... بە تایبەتی بە دایکی خۆشەویست و بە ئەمەکم و بە دادەی ئازیز و دڵسۆز و خۆشەویستم (دڵسۆز خان) کە بە دڵسۆزیی خۆی، لە پشتی سەرجەم سەرکەوتنەکانمەوەیە.

سوپاس و پێزانین:

* زۆر سوپاسی مامۆستا و سەرپەرشتیاری بەڕێزم (پ.ی.د. حوسامەددین عەلی غالب) دەکەم، کە بە سەرنج و تێبینی ورد و دید و بۆچوونی زانستییانە، ڕێنمایی پێویستی کردووم و نامەکەی بەهێز و دەوڵەمەند کردووە.

* سوپاسی برای گەورە و هاوڕێ و مامۆستای خۆشەویستم بەڕێزم (د. سەلاح کانەبی ئیسماعیل) دەکەم، کە هەردەم هاندەرم بووە و یارمەتیداوم لە هەردوو قۆناغی بەکالۆریۆس و ماستەردا و کاری بۆ ئاسان کردووم.

* سوپاسی برا و هاوڕێی خۆشەویستم (د. پشکۆ حەمەتاهیر ئاغجەلەریی) دەکەم، کە وەك برا بەردەوام هاندەر و پشتگیرم بووە.

* سوپاسی مامۆستایانی بەڕێز و برایانی گەورە (د. ئاراس فەریق زەینەڵ و د. سەروەر عەبدوڕڕەحمان عومەر) دەکەم کە هەمیشە پشتگیر و هاریکارییان کردووم و بەتەنگ کارەکانمەوە بوون لە هەردوو قۆناغی بەکالۆریۆس و ماستەردا.

* سوپاسی مامۆستایان (پ.ی.د. دلێر ئەحمەد حەمەد و پ.ی.د. کەمال عەلی موحەممەد و پ.د. موحسین موحەممەد حسێن) دەکەم، کە لە کۆرسی خوێندنی ماستەرەکەمدا ڕێنماییان کردووم.

* سوپاسی بەڕێزان (پ.ی. د.زرار صدیق تۆفیق، د.عەتا عەبدوڕڕەحمان محێدین، گۆران ئیبراهیم (کە پوختەی ئینگلیزییەکەی بۆ وەرگێڕام)، م. فەرهاد ڕەفیق، کاك مەریوان عەبدول، کاك هاوار کەمال، کاك کارزان لە چاپەمەنی ڤینوار) دەکەم، کە هەریەکەیان بە جۆرێك هاوکارییان کردووم.

* سوپاسی کارمەندانی کتێبخانەکانی (ناوەندی زانکۆی سلێمانی، گشتی سلێمانی، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، کتێبخانەی ئەوقافی سلێمانی، کتێبخانەی مۆزەخانەی سلێمانی، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی و

کتێبخانــەی ناوەنــدی زانکــۆی ســەلاحەددین و کتێبخانــەی (المــصطفی)ی ئەلکترۆنی کە لێیەوە زۆرێکمان لە سەرچاوەکانی کتێبخانەی ئەسکەندەریەی تایبــەت بــە لێکۆڵینەوەکــەمان دەســت کــەوت)) دەکــەم، کــە لــە پــەیــداکردنی سەرچاوەکاندا زۆر هاوکارییان کردووم.

# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

(إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ)

صدق الله العظيم

# پێشەکی

بابەتی کاریگەری و پێکدادان و ملململانێی شارستانیەتەکان، یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی کە لە ئەمڕۆدا زۆرێك لە ناوەندە ئەکادیمی و ستراتیژی و بڕیار و فەیلەسوفان و میدیاکانی جیهانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە، کە هەوڵ دەدەن لایەنە شاراوەکانی کلتووری و سیاسی و زانستی و فیکرییەکانی ناو هەر یەك لەو شارستانیەتانەی جیهان دەربخەن و لە ڕاددەی کاریگەری بوون و پەیوەندی و ململانێی نێوانیان بکۆڵنەوە، تا لەو ڕێگایەوە دیاردەو ڕووداوەکانی جیهان شیکار بکەن، لێرەوە چەندین تیۆری گەورە لە بوارەکانی بە دوادا هاتنی شارستانیەتەکان و دروست بوون و نەمانی شارستانیەتەکان بە کاریگەری یەکتری هاتوونەتە کایەوە.

سەرباری گرنگی بابەتەکەو زۆری ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەری کراون، کەچی تائێستا وەك پێویست لێکۆڵینەوە لەسەر ڕەگ و ڕیشە مێژووییەکانی نەکراوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە فەرامۆش کردنی لێکۆڵینەوەی بابەتەکە و دەرنەخستنی ڕۆڵ و کاریگەرییەکانی شارستانیەتەکان لەسەر یەکتری لە مێژوودا، بەتەواوی لێکۆڵینەوەکانی ئەم سەردەمە تووشی ناتەواوی و بێ ناوەڕۆکی دەکات. لێرەوەیە کە گرنگی بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمە دەردەکەوێت بە ناونیشانی (ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانی لەناو شارستانیەتی ئیسلامیدا لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا ١٣٢ – ٢٣٢ك / ٧٤٩ – ٨٤٧ز، لێکۆڵینەوەیەکی فیکری مێژوویی شارستانییە)، لە دوولایەنەوە: لەلایەك هەوڵێکی زانستییە بۆ بە ئەکادیمییانە دەرخستنی یەکێك لە ناوازەترین سەردەمەکانی کاریگەر بوون و ئاوێتەبوونی دوو شارستانیەتی گەورە لە

ناسكترین ماوەی تەمەنی هەردووكیاندا، كە بریتییە لـە پوكاندنـەوەی یـەكێكیان كـە شارستانیەتی یۆنانییە و پەرەسـەندن و بوژاندنـەوەی ئـەوی تریـان بـە كاریگـەری و لەسـەر پاشمـاوەی یەكـەم كـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییە. لایـەنێكی تـری گرنگـی لێكۆڵینەوەكەی ئێمە لەوەدا دەردەكەوێت كە بۆ یەكەم جارە بابـەتێكی لـەم جـۆرە ببێتە پرۆژە و ماددەی خاوی لێكۆڵینـەوە و تێزێكـی زانستی، لانـی كـەم بـە زمـانی كوردی، كە لەم بوارەدا گەلێك هەژارە.

هەڵبەتــە لــە پــێش ئێمــەدا چــەند كارێــك هەیــە كــە دەچــنە چوارچــێوەی لێكۆڵینەوەكــەی ئێمــەوە، ئــەو كارانــەش بەرهەمەكــەی ڕۆژهــەڵاتناس (دیلاســی أولیری)یە بەناونیشانی:

(How Greek passed to the Arabs, London 1957) كـە دوو جار وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، جارێك بە ناونیشانی (العلوم الیونانیة وسبل انتقالها الى العرب، تـر.د.وهیـب كامـل) جـارێكی تـریش بـە ناونیـشانی (انتقـال علـوم الإغريق الى العرب، تر.متى بيثون و يحيى الثعالبي) هەروەها هەردوو كتێبـی (د.أمـيرة حلمي مطر: الفكر الإسلامي و تراث اليونـان) و كتێبـی (د.عـصام الـدين محمـد علـي: بواكير الثقافة الاسلامية و حركة النقل و الترجمة من أواخر القرن الأول حتى منتـصف القرن الرابع الهجري)و كتێبی (مريم سلامة – كار: الترجمة في العصر العباسي، مدرسـة حنين بن إسحق و أهميتها في الترجمة، تر.د.نجيب الغزاوي) هـەروەها كتێبـی (الـتراث اليوناني في الفكر الإسلامي، تـأليف و ترجمـة: د. عبـدالرحمن بـدوي، مكتبـة النهـضة المصرية، القاهرة، ١٩٤٦م)، كـە ئـەم كتێبانـە بـە ناڕۆشـنی و سـادەیی و پچڕپـچڕی باسیان لە بابەتەكەی ئێمە كردووە، ئەویش لە بەشێكی دیاری كراو و زۆر كەمدا، یان لە چەند دێڕێكدا، ئەمە سەرباری نائەكادیمی بوونی ئەم سەرچـاوانە، ئەمـە جگـە لـە كتێبەكەی (د.رشيد الجميلي: حركة الترجمة في المشرق الاسـلامي في القـرنين الثالـث و الرابع للهجرة) كە نامەی زانستیی نووسەرەكەیەتی، بەڵام ئەم كتێبەش بـەهۆی زۆری و چرپوپڕی بابەتەكانی ناوی و زۆری دووبارە بوونەوەی بابەتەكانی وەك پێویـست لـە بابــەتی لێكۆڵینەوەكــەی ئێمــە نــەدواوە، ئەمــە جگــە لــەوەی كــە مەبەســتی ئــەم

لێکۆڵینەوەیـە لـە مەبەسـتەکەی ئێمـەوە دوورە و ئـەم مەبەسـتی لـە بزووتنـەوەی وەرگێڕانە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بەگشتی، واتـە وەرگێـڕان لـە (یۆنـانی و فارسـی و هندییەوە..... هتد) نەك تەنها لە یۆنانییەوە، هەروەها باس لە سەدەکانی سـێیەم و چـوارەمی کۆچـی دەکـات کـە دیـسان بەشـێکی زۆرکـەمی لێکۆڵینەوەکـەی ئێمـە دەگرێتەوە کە ئێمە باس لـە سـەدەی دووەم و سـەرەتای سـەدەی سـێیەمی کۆچـی دەکــەین و تــەنها باسیــشمان هــەر لــە وەرگێــڕان نــەکردووە، بــەڵکو بەشــێکی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە.

ئەم هۆکارانەو چەند هۆکـارێکی تـری لاوەکـی وەك نـوێیی بـوون و زیندوویـەتی بابەتەکە پاڵیان بە ئێمەوەنا تا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین.

ئاشکرایە هەر کارێکی ئەکادیمی و زانستی کاتێك کە ئەنجام بـدرێت، بـێ گرفـت نابێـت، لـەم ڕوانگەیەشـەوە ئێمـە لـەکاتی بـە ئـەنجام گەیانـدنی لێکۆڵینەوەکەمانـدا دووچاری چەند گرفتێك بووینەوە، لە دیارترینیان: سەرباری زۆری سەرچـاوە لەسـەر بابەتەکە، کەچی لە کتێبخانـەکانی بەردەسـتی توێـژەردا هەنـدێکی کـەمیان هـەبوو، ئەمەش وای کرد کە زۆرتر ماندووببین و هەروەها ماوەیەکی زیاتر لەکاتمان بڕوات لـە بەدەستخستنی سەرچاوەدا، بـەم جـۆرەش توانیمـان تاڕاددەیـەکی زۆر بەسـەر ئـەم گرفتەدا سەرکەوین و زۆرینەی هەرە زۆری سەرچـاوە پەیوەندیـدارەکانی تایبـەت بـە لێکۆڵینەوەکەمان بەدەست بخـەین، یـەکێکی تـر لـە گرفتـەکان داڕشـتنی نـاوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە بوو بە سوود وەرگرتن لەو سەرچاوانەی کـە بـەکارمان دەهێنـا، بـەڵام مەبەستمان بـوو بـە شـێوەیەکی نوێگـەری بێـت و دوور بێـت لـە لاسـایی کردنـەوە و گێڕانەوە، ئەمەش پێویستی بـەوە دەکـرد کـە لۆژیکییانـە لـە هەنـدێك شـوێندا و بـە جورئەت و ئەمانەتەوە بۆچوونەکان دەربـبڕدرێت و ئەنجامی نوێش بەدەستەوە بـدات کە جیاواز بێت لـە بۆچـوونی هەنـدێك سەرچـاوە، بـەڵام هەنـدێك جـار سەرچـاوەکان یارمەتیدەر نەدە بوون بۆ مەبەستەکەمان، یـان ڕاسـتەوخۆ لـە بابەتەکـە نـەدەدوان، ئەمەش ماندووبوونێکی زیاتری پێویست بوو تا سەرجەم سەرچاوەکان بخوێنینەوە و

لـه ناوەڕۆکـەکانیان ئاگـادار ببین، ئەمانـەو چـەند گرفتێکـی لاوەکـی تـر کـە لێـرەدا پێویست بەباس کردن ناکات.

بە شێوەیەکی مەنهەجی لێکۆڵینەوەکەمان دابەش کردووە بەسەر چوار بەشدا و هەربەشێکیش بەسەر دووباسدا، تا بتوانین لەو چوارچێوەیەدا سـەرجەم لایەنـەکانی بابەتەکە بخەینە ڕوو، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لەبەشی یەکەم شارستانیەت و بنەماکانی شارستانیەتی یۆنانیمان باس کردووە، کە وەك دەروازەیەك وایە بۆ چوونە ناو باسەکەوە بۆ ئەوەی چـەند بابـەتێك هـەر لـە سەرەتاوە بناسێنین و کاتێك لە بەشەکانی تردا دێینە سەر باس کردنیان، ئاشـکرابن و خوێنەر لە مەبەستەکان تێبگات، لە باسی یەکەمدا باسی شارسـتانیەتمان کـردووە لـــە هـــەردوو ڕووی زمـــان و زاراوەوە، بنەچـــەکانی ئـــەم زاراوەیـــەمان لـــە ڕووی زمانەوانییـــەوە دەرخـــستووە، هـــەروەها وەك زاراوە لـــە مانـــای شارســـتانیەت کۆڵیوینەتەوە و بۆچوونی چـەند بیرمەنـد و فەیلەسـوفێکمان وەرگرتـووە لـە کـۆن و نوێدا و پاشان لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو بۆچـوونانەدا وەك ئـەنجامێك بۆچـوونی خۆمـان خستۆتە ڕوو. لە باسی دووەمدا باسی بنەما سەرەکییەکانی شارستانیەتی یۆنانیمان کردووە، کە مەبەست پێی شارستانیەتی (یۆنانی و سەرەتای ڕۆمانییەکانە)، پاشـان باسـی دیـارترین فەیلەسـوف و زانـستەکانی شارسـتانیەتی یۆنانیمـان کـردووە، کـە کاریگەرییان هەبووە لەسەر شارستانیەتی ئیـسلامیی ولـە سـەردەمی بووژاندنـەوەی شارستانیەتی ئیسلامیدا ڕۆڵیان هەبووە.

لە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەماندا باسی یەکێك لە ڕێگا گرنگەکانی گەیشتنی شارسـتانیەتی یۆنانیمـان کـردووە بـە شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، ئـەویش لـە ڕێگـای فتوحاتی ئیسلامیەوەیە، لە باسی یەکەمدا باسی ڕۆڵی ئەو گەل و نەتەوە نامسوڵمان (أهل الذمة) و ناعەرەبانەمان کردووە کە لە ئەنجامی فتوحاتی ئیسلامییەوە خۆیان و ناوچەکانیان کەوتبوونە ژێر سایەی خەلافەتی ئیسلامییەوە، لە گەیاندن و کاریگەریی خستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بە شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، چـونکە ئـەم گـەل و نەتەوانە بە تایبەتی (أهل الذمة) لە (سریانەکان) بە هەردوو لقی (یعاقبة و نسطوري)

و جوولەکـە و (صـابیئەکان) هـەڵگری شارسـتانیەتی یۆنـانی بـوون و بۆخۆشـیان لـە پێـشدا بەشـێك بـوون لـە ئیمپڕاتۆرییـەتی ڕۆمـانی، ئـەمیش پـاش تێکـەڵبوون و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ مسوڵمانان و بە پەیڤین کردن و هەروەها مامەڵـە و بەشـدارییان لە پۆستە باڵاکانی خەلافەتدا، زیاتر ڕۆڵیان دەرکەوت، بـە شـێوەیەك کـە جۆرێـك لـە قۆرخکارییان پێوەدیار بوو، بەتایبەتیش لە هەردوو بـواری (پزیـشکی و وەرگێڕانـدا) کە ئەم بابەتەمان ڕوونکردووەتەوە. لە باسی دووەم باسی فەتحکردنی ناوەنـدەکانی شارستانیەتی یۆنانیمان کردووە لە ڕۆژهەڵات، کە ئەمانە بوون (أسكندرية، أنطاكيـا، حـران، نـصيبين، الروهـا، جنديـسابور) و کاریگـەریی هەریـەك لـەم شـارانەمان ڕوونکردووەتـەوە لـە گەیانـدن و کاریگـەربوونی شارسـتانیەتی یۆنـانی لەسـەر شارستانیەتی ئیسلامیی و ئەمەش پاش فتوحاتی ئیسلامیی، ئەمە جگـە لـەوەی کـە باسی درووسـتبوونی هەریـەك لـەو شـارانەو چـۆنێتی بوونیـان بـە ناوەنـدی زانـستی یۆنانیمان کـردووە و کـاتی فتوحـاتی ئیـسلامیی بـۆ سـەریان و شـێوازی کاریگـەریی هەریەکەشیانمان لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی ڕوون کردووەتەوە.

لە بەشی سـێیەمدا باسـی ڕێگـای دووەمـی گەیـشتنی شارسـتانیەتی یۆنانیمـان کـردووە بـۆ شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، ئـەویش ڕۆڵـی بزووتنـەوەی وەرگێڕانـە لـە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا کە دەتوانین بە ڕێگای ڕاستەوخۆی گەیشتنی ئەو شارستانیەتە ناوی بـەرین بـە شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، ئـەمیش پـاش ئـەو هـەموو بەرهەم و کتێبە زۆرانەی کە لەم سەردەمەوە وەرگێڕدرانە سـەر زمـانی عـەرەبی، لـە باسی یەکەمدا باسمان لە سەرەتای وەرگێڕان کردووە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا تا کاتی گەیشتنی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، کە بە سـەردەمی زێڕینـی بزووتنـەوەی وەرگێڕان دادەنرێت، هەروەك لە ڕۆڵی هەریەك لە خەلیفە دیارەکانی خەریك بوو بـەم بابەتـەوە دواویـن و جیـاوازیی سـەردەمەکانیانمان دەرخـستووە، وەك (أبـو جعفـر المنصور و هارون الرشيد و المأمون و الواثق) باسمـان لـە دروسـتبوونی دەزگایـەکی بەنرخ و بەبایەخی وەك (بيت الحكمة) کـردووە کـە بـە دامەزرانـدنی ئیـدی وەرگێـڕان چووە قۆناغێکی نوێوە و وەرگرتنی شارستانیەتی یۆنانی بوو بەکارێکی بـە دەزگـا و

ڕێکخـــراو، پاشـــان باســـی دیـــارترین هۆکارەکـــانی بووژاندنـــەوە و پەرەســـەندن و پاڵنـــەرەکانی بزووتنـــەوەی وەرگێڕانمـــان کـــردووە لـــە ســـەردەمی یەکـــەمی عەبباسییەکاندا. لە باسی دووەمدا هاتوینەتـە سـەر باسـی دیـارترین وەرگێڕکارانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، وەك کۆڵەکەی بزووتنەوەی وەرگێڕان و باڵوێزانی گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی و هەروەك باسمان لە بەرهەمەکانیان و شێوازەکانیشیان کردووە لە بواری وەرگێڕاندا.

لە بەشی چوارەم دا کە دوا بەشی لێکۆڵینەوەکەمانە، باسـی ڕەنگدانـەوەی ئـەو زانـستانەمان کـردووە کـە لـە سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکاندا بـە کاریگـەریی شارستانیەتی یۆنانی لەناو شارستانیەتی ئیسلامیدا ڕەنگیان داوەتـەوە، ئەمـەشمان کردووە بە دووباس، لە باسی یەکەم لە بارەی ئەو زانستانەوە دواوین کە بـە زانـستە پەتییـەکان (العلـوم الـصرفة) ناسـراون و تیایـدا باسـی ڕەنگدانـەوەی هەریەکـە لـە زانستەکانی (پزیشکی و بیرکاری و گەردووناسی و فیزیا و میکانیك (علم الحیل))مان کـردووە و سـەرجەم لایەنـەکانی ئـەو ڕەنگدانەوەیـەمان لـە وەرگێڕانـی کتێبـەکانی ڕۆژئاوا لەسەر بابەتەکەو ڕەنگدانەوەی لەسـەر بیریـار و فەیلەسـوفان و بیرمەنـدانی ئەم بوارانەشمان ناساندووە و لە بەرهەمەکانیان دواویـن. هـەروەها لـە باسـی دووەم باسی ڕەنگدانەوەی زانـستەمرۆڤایەتییەکانمان کـردووە، کـە بـریتین لـە زانـستەکانی (فەلسەفە و جوگرافیا و مۆسیقا)، بەهەمان شـێوەی باسـی یەکـەم لـەم زانـستانەش دواویـن و لایەنـەکانیمان دەرخـستووە و لـە دیـارترین بەرهەمـە وەرگێڕدراوەکـان و بیرمەندان و ڕەنگدانەوەکانی ئەم زانستانە دواوین.

لە کۆتایشدا دیارترین ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکەمان بە چـەند خاڵێـك خـستۆتە ڕوو.

ماوەتەوە بڵێین، کە سەرباری زۆری مانـدووبوونی لێکۆڵـەر و هـەروەها چـەندین جار خوێندنـەوەی وردی بـەڕێز سەرپەرشـتیار بـۆ بابەتەکـە، بـەڵام پێمـان وایـە کـە بابەتەکە بێ کەموکوڕی نییـە و هەڵـەی تیادایـە، چـونکە ئەمـە کـاری مرۆڤـە، کـاری مـرۆڤیش هـەرگیز تـەواو نابێـت و هەڵـەش کاتێـك دەکرێـت کـە کـار بکرێـت و لـەم

ڕوانگەیەشەوە ئەگەر هەڵەمان هەبێت واتە کارمـان کـردووە و مانـدووبووین پێـوەی، بۆیە هیواداریـن بەو چاوە و بڕوانرێتە کارەکەمان و هەڵەکانمان بە ڕەخنـەی بنیاتنـەر بۆ ڕاست بکرێتەوە.

# شیکردنەوەی سەرچاوەکان

بەمەبەستی وەرگرتنی زانیارییەکانی لێکۆڵینەوەکەمان سوودمان لە گەلێك لە ژێدەر و سەرچاوە وەرگرتووە، کە بریتین لە سەرچاوەی ڕەسەن (المصادر) و سەرچاوە نوێیەکان (المراجع) و سەرچاوەی کوردی و ئینگلیزی و گۆڤار و گوتارەکان و سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکان، بەڵام زۆرترین ئەو سەرچاوانەی کە سوودمەند بووین لێی ئەم سەرچاوانەی خوارەوەیە:

١- چەند سەرچاوەیەك هەیە کە لەسەرجەم بەش و باسەکاندا بەشێوەیەکی گشتی دووبارە بوونەتەوە و زانیارییەکی زۆریان بەدەستەوەداوە، ئەوانیش (٥) سەرچاوەن کە بریتین لە:

أ- کتێبی (طبقات الأطباء و الحکماء)ی (إبن جلجل م.٣٨٤ك / ٩٩٤ز)، ئەم کتێبە سوودێکی زۆری لێ وەرگیراوە، بەتایبەتی لە باسی پشتگیریکارانی بزووتنەوەی وەرگێڕان و هەروەها وەرگێڕکاران و بەرهەمەکانیان، کە ئەم کتێبە بۆخۆی، سەرباری پوختی زانیارییەکانی، بە سەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت دەربارەی بابەتە زانستییەکان و وەرگێڕکاران و بەرهەمەکانیان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا و لە سەردەمانی دواتریشدا.

ب- کتێبی (الفهرست)ی (إبن الندیم م.٣٨٥ك / ٩٩٥ز)، ئەم کتێبە بە شێوەیەکی گشتی لە سەرجەم بەش و باسەکانی لێکۆڵینەوەکەماندا سوودمان لێ وەرگرتووە، گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە باسی لە سەرجەم بەرهەمە نووسراو و وەرگێڕدراوەکان و نووسەرەکانیان و چۆنیەتی وەرگرتنی زانستەکان و وەرگێڕانیشیانی لە شارستانیەتی یۆنانییەوە کردووە، هەروەك باسی لە ژیاننامە و کاتەکانی مردن و شوێن و وڵاتەکانی هەریەك لە نووسەر و وەرگێڕکارەکان کردووە.

ج- کتێبی (طبقات الأمم)ی (إبن صاعد الأندلسي م.٤٦٢ك/١٠٦٩ز)، ئەم کتێبە سەرباری زانیارییەکانی لە بارەی شار و ناوەندە زانستییەکانی شارستانیەتی

یۆنانی، باسیشی لە چۆنیەتی وەرگرتنی زانیارییەکان کردووە، هەروەها زانیاریشی تیادایە لەبارەی نووسەران و وەرگێڕکاران و بەرهەمەکانیان.

د- کتێبی (أخبار العلماء بأخبار الحکماء)ی (القفطي م.٦٤٨ك/١٢٥٠ز)، یەکێکی ترە لە سەرچاوە بەنرخەکانی لێکۆڵینەوەکەمان، کە زانیارییەکی زۆری تیادایە لە بارەی سەرجەم فەیلەسوف و دانایانەوە کە هەتا سەردەمی نووسەر ژیاون و هەروەها چەندین زانیاری تری تیادایە تایبەت بە وەرگێڕان و چۆنیەتی گەیشتنی شارستانیەتی یۆنانی و کاریگەرییەکانی.

هـ- کتێبی (عیون الأنباء في طبقات الأطباء)ی (إبن أبي أصیبعة م.٦٦٨ك / ١٢٦٩ز)، ئەم کتێبە بە باشترین کتێب دادەنرێت لە ڕووی چڕی و پڕی زانیارییەکانیەوە لە بارەی وەرگێڕاکاران و پزیشکان و هەروەها شارستانیەتی یۆنانییەوە، ئەم کتێبە گرنگییەکەی لەوەدایە باسی لە کار و بەرهەمەکانی زۆرینەی پزیشکان کردووە لە یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان و هندییەکان و مسوڵمانەکانیش، کە سەرجەم نزیکەی ٤٠٠ کەسایەتی باس کردووە، لە دووبەش پێك هاتووە و یەکێکە لەو سەرچاوە باشانەی لە زۆرترین شوێندا لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەماندا سوودمان لێ وەرگرتووە.

٢- سەرچاوە بلدانییەکان (البلدانیون)، ئەم سەرچاوانە کە بە بلدانییەکان ناسراون بە پلەی دووەم دێن لە ڕووی زۆری سوود لێوەرگرتنیانەوە کە بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ هەردوو بەشی دووەم و سێیەم سوودیان هەبووە، ئەم سەرچاوانە سەرباری زۆری زانیارییەکانیان لەبارەی جوگرافیای ناوچەکانەوە، چەند زانیارییەکی تری بەکەڵکیشیان تیادا بووە بۆ بابەتی مێژوو بە گشتی و هەروەها زانیاری لەبارەی ناوەندەکانی خوێندن و فتوحات و هەروەها وەرگێڕان و کاریگەریی شارستانیەتیان لەخۆ گرتووە، لەوانەش: کتێبی (کتاب البلدان)ی (الیعقوبي م. ٢٩٢ك/٩٠٤ز)، وە کتێبی (المسالك والممالك)ی (إبن خرداذبة م.٣٠٠ك/٩١٢ز)و کتێبی (المسالك و الممالك)ی (ألأصطخري م.٣٤١ك/٩٥٢ز)، هەردوو کتێبی (التنبیە و الإشراف) و (مروج الذهب و معادن الجوهر)ی (المسعودي م.٣٤٦ك/٩٥٧ز)، کە

سوودێکی زۆرمان لـیّ وەرگرتـووە بەشـێوەیەکی گشتی لەسـەرجەم بەشـەکاندا، بـە هۆی تاڕاددیەك نزیکی لە سەردەمەکەمانەوە چەندین کەوانەمان لێیەوە وەرگرتـووە، هـەروەها کتێبـی (الـديارات)ی (الشابـشتي ٣٨٨ك / ٩٩٨ز)، ئـەم کتێبـە سـوودێکی زۆرمـان لێـی وەرگرتـووە بەتایبـەتی بـۆ باسـی دێـر و کەنیـسە و خوێنـدنگاکان و بارودۆخی (أهل الذمة)کان بە شێوەیەکی گشتی. هـەروەها کتێبـی (معجـم البلـدان)ی (ياقوت الحموي م.٦٢٦ك/١٢٢٨ز) ئەم سەرچاوەیە یەکێکە لـەو سەرچـاوە باشـانەی کـە دەتوانرێـت بـە ئەنیـسکلۆپیدیایەکی جـوگرافی مێـژوویی دابنرێـت، کـە چـەندین زانیاری بەرفراوانی لە بارەی شار و هەرێم و ناوچەکان و مێـژووی تیادایـە، هـەروەها کتێبی (كتاب مختصر الدول)ی (إبن العـبري م.٦٨٥ك/١٢٨٦ز)، ئـەم کتێبـە چـەندین زانیاری بەنرخی تیادا بـووە تایبـەت بـە هەردووبەشـی دووەم و سـێیەم کـە سـوودی زۆرمـان لـیّ وەرگرتـووە بـۆ بابـەتی (أهـل الذمـة)و بەشـدارییان لـە شارسـتانیەتی ئیسلامیی و ناوچەکانیان و هەروەها بۆ وەرگێڕان و بزووتنەوەی وەرگێڕان. هەروەها کتێبـی (الـروض المعطـار في خـبر الأقطـار)ی (الحمـيري م.٧٢٧ك/١٣٢٧ز)، ئەمانـەو چەندین سەرچاوەی تری گرنگ کە لە شوێنی خۆیان لەناو لێکۆڵینەکەو هـەروەها لـە لیستی سەرچاوەکاندا ئاماژەیان پێی دراوە.

٣- کتێبەکانی (الطبقات و التراجم) لـە ڕاسـتیدا کـەڵك لـە چـەند کتێبێکـی ئـەم بوارە وەرگـیراوە، بەتایبـەتی بـۆ ژیاننامـەی کەسـەکان و کـار و بەرهەمـەکانیان کـە هەندێکیان زانیاری بەبایەخداریان لەخۆگرتووە، نەك تەنها بـۆ کەسـەکان، بـەڵکو بـۆ ڕووداوە مێژووییـەکانی بابـەتی لێکۆڵینەوەکـەشمان بەگـشتی. لـە دیـارترین ئـەو سەرچـاوانەش کـە لـەم بـوارەدا سـوودمان لیّ وەرگرتـوون کتێبـی (معجـم الأدبـاء)ی (يـاقوت الحمـوي م.٦٢٦ك / ١٢٢٨ز) و کتێبـی (وفيـات الأعيـان)ی (إبـن خلكـان م.٦٨١ك/١٢٨٢ز)، و کتێبـی (تـاريخ مـشاهير الاسـلام والعـبر)ی (الـذهبي م.٧٤٨ك / ١٣٤٨ز)، و کتێبی (الوافي بالوفيات)ی (الصفدي م.٧٤٦ك/١٣٤٥ز)ن.

٤- سەرچـاوە وێژەییـەکان (ئەدەبییـەکان)، بەشـێوەیەکی گـشتی لـە ڕەوش و بارودۆخی (أهـل الذمـة) و هـەروەها بابـەتی کاروبارەکـانی نـاو دەربـاری خەلافـەت و

تێکەڵ بوون و ئاوێتە بوونیان لەگەڵ مسوڵمانان و بوارەکانی پەیڤین کردنیان و چەندبابەتێکی تر وەك وەرگێڕان و شێوازەکانی سوودمان لێیان وەرگرتووە، لەو کتێبانەش وەك هەرسێ کتێبی (البيان والتبيين) و (البخلاء) و (الحيوان)ی (الجاحظ م.٢٥٥ك/٨٦٩ز) کە بەهۆی نزیکی لە سەردەمی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە لەلایەك و وەك ڕووناکبیرێکی ئەو سەردەمەش ئاگاداری هەندێك لە ڕووداوەکانی لێکۆڵینەوەکەمان بووە و وەك بزووتنەوەی وەرگێڕان بابەتە وەرگێڕدراوەکان و چەندین بابەتی تر کە سوودێکی زۆرمان لێی وەرگرتووە. هەروەها هەردوو کتێبی (عيون الأخبار) و (المعارف)ی (إبن قتيبة الدينوري م.٢٧٦ك / ٨٨٩ز)، کتێبی (العقد الفريد)ی (إبن عبدربه م.٣٢٨ك/ ٩٣٩ز)، کتێبی (الأغاني)ی (الأصفهاني م.٣٥٦ك/٩٦٦ز)، کتێبی (الآثار الباقية عن القرون الخالية)ی (البيروني ٤٤٠ك/ ١٠٤٨ز) و کتێبی (نهاية الأرب في فنون الأدب)ی (النويري م. ٧٣٢هـ / ١٣٣٢م)، هەردوو کتێبی (مآثر الإنافة في معالم الخلافة) و (صبح الأعشى)ی (القلقشندي م.٨٢١ك / ١٤١٨ز).

٥- سەرچاوەکانی مێژوو بە گشتی، لەو سەرچاوانەی کە سوودمان لێیان وەرگرتووە هەندێکیان دەچنە چوارچێوەی بواری مێژووی گشتییەوە کە لە هەندێك بواری وەك فتوحات و هەروەها چەند زانیارییەکی مێژوویی تایبەتی سوودمان لێی وەرگرتووە، لەو سەرچاوانەش وەك کتێبی (فتوح الشام)ی (الواقدي م.٢٠٧ك/ ٨٢٢ز)، وەکتێبی (تاريخ خليفة بن خياط)ی (خليفة بن خياط م.٢٤٠ك/ ٨٥٤ز)، وە کتێبی (فتوح البلدان)ی (البلاذري م. ٢٧٩ك/ ٨٩٢ز) و کتێبی (أخبار الطوال)ی (الدينوري م.٢٨٢ك/٨٩٥ز)، (تاريخ اليعقوبي)ی (اليعقوبي م.٢٩٣ك / ٩٠٥ز)، ئەم کتێبە بەتایبەتی بۆ بابەتی یۆنانییەکان و شارستانیەتییەکەیان و کاریگەری لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی سوودێکی زۆرمان لێی وەرگرتووە. هەروەها کتێبی (تاريخ الرسل و الملوك)ی (الطبري م.٣١٠ك / ٩٢٣ز)، هەردوو کتێبی (المقدمة)و (تاريخ إبن خلدون: العبر)ی (إبن خلدون م.٨٠٨ك/ ١٤٠٥ز)، کە سوودمان لێیان وەرگرتووە بە تایبەتی لە هەندێك بۆچوون دەربارەی شارستانیەت و هەڵسەنگاندنی چەند بابەتێکی

گرنگی وەك وەرگێڕان و پەیڤین و دروست بوونی شارستانیەتەکان. هەروەها کتێبی (تاریخ الخلفاء)ی (السیوطي م. ٩١١ك / ١٥٠٥ز)، ئەمانەو و چەندین سەرچاوەی تر کە لە شوێنی خۆیاندا بەکارمان هێناون و لە لیستی سەرچاوەکاندا ئاماژەمان پێ کردوون.

٦- کتێبەکانی گرووپە ئیسلامییەکان کە بە (الملل و النحل)ناسراون، سوودێکی بەرچاومان لەم سەرچاوانە وەرگرتووە بە تایبەتی لە بواری باسکردن لە گرووپە ئیسلامییەکانی وەك (المعتزلة و الجبرية و القدرية... هتد) و لە گرووپە مەسیحییەکانی وەك (اليعاقبة و نسطوريةکان) و بابەتی فەلسەفەی گریك و گرووپەکانی و چەندانی تریش. لە دیارترین ئەو سەرچاوانەش: (مقالات الإسلاميين و إختلاف المصليين)ی (الأشعري م.٣٣٠ك/ ٩٤١ز)، و کتێبی (الفرق بين الفرق و الفرق الناجية منهم)ی (البغدادي م.٤٢٩ك/ ١٠٣٨ز)، کتێبی (فضل الإعتزال و طبقات المعتزلة)ی (القاضي عبدالجبار م.٤١٥ك / ١٠٢٤ز)، کتێبی (التبصير في الدين و تميز الفرق الناجية عن الفرق الهالكين)ی (الأسفراييني م.٤٧١ك/ ١٠٧٨ز)، و کتێبی (الملل و النحل)ی (الشهرستاني م.٥٤٨ك/١١٥٣ز)، و کتێبی (الإعلام بما في دين النصارى)ی (القرطبي م.٦٧١ ك/ ١٢٧٢ز)، و کتیبی (صون المنطق و الكلام عن فن النطق و الكلام) (السيوطي م.٩١١ك/١٥٠٥ز).

٧- سەرچاوە زمانەوانییەکانیش چەند سەرچاوەیەکمان بەکارهێناوە، کە سوودمان لێ وەرگرتوون بەتایبەتی لە بواری زاراوەکان و هەروەها دەرخستنی ماناکانیان بەتایبەتی لە باسی یەکەم بەشی یەکەم و لە باسی دووەم بەشی چوارەمدا، ئەوانەیش: کتێبی (مقاييس اللغة)ی (إبن زكريا م.٣٩٥ك / ١٠٠٤ز)، کتێبی (لسان العرب) ی (إبن منظور م.٧١١ك / ١٣١١ز)، کتێبی (مختار الصحاح)ی (الرازي م.٦٦٦ك/ ١٢٦٧ز)، کتێبی (معجم القاموس المحيط)ی (فيروز آبادي ٨١٧ك / ١٤١٤ز)، وە کتێبی (تاج العروس)ی (الزبيدي م.١٢٠٦ك/ ١٧٩١ز).

٨- شایەنی باسە سەرباری سەرچاوە ڕەسەنەکان کە لە سەرەوە لە هەندێکیان دواین، چەندین سەرچاوەی نوێ (المراجع)مان بەکارهێناوە کە نزیکەی دوو

ئەوەندەی سەرچاوە ڕەسەنەکان دەبێت، و تا ڕاددەیەکی باش ڕێگا نیشاندەر بوون بۆمان لە ئەجامدانی لێکۆڵینەوەکەماندا، لەوانەش وەك سەرچاوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی (د.یلاسی أولیری)

(How Greek passed to the Arabs, London 1957) هەر دوو وەرگێڕانەکەی بۆ زمانی عەرەبی، ئەوانیش (العلوم الیونانیة وسبل انتقالها الی العرب، ترجمة: د.وهیب کامل، و انتقال علوم الإغریق الی العرب، ترجمة: متی بیثون، یحیی الثعالبي)، و کتێبی:

(DR. T. J. DE BOER:THE HISTORY OF PHILOSOPHY IN ISLAM, t. EDWARD R. JONES, B.D)

و وەرگێڕدراوە عەرەبییەکەی (تاریخ الفلسفة في الاسلام)، ئەم کتێبانە سەرباری ئەوەی کە باسیان لە چەند بەشێکی لێکۆڵینەوەکەمان کردووە، زانیارییەکانیان پڕ پڕ و پوختن، بەڵام بەپێی خۆیان توانیومانە سوودیان لێوەربگرین.

هەروەها کتێبی (شمس العرب تسطع علی الغرب)ی (زیغرید هونکە) ئەم کتێبە گرنگییەکەی لەوەدایە کەزانیارییەکانی چڕوپڕە و لە چەند شوێنێکدا باسی لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەی کردووە، بۆیە ئەم سەرچاوەیە لە چاو سەرچاوە ڕۆژهەڵاتناسییەکانی تردا زۆرترین سوودمان لێی وەرگرتووە. جگە لەمانەش چەندین سەرچاوەی تری ڕۆژهەڵاتناسیمان بەکارهێناوە، لەوانەش کتێبی (حضارة الإسلام)ی (ف.بارتولد) و کتێبی (حضارة الاسلام)ی (جوستاف.أ. ڤون.جرونباوم) و (حضارة العرب)ی (غوستاف لوبون) و (الحضارة العربیة)ی (جاك ریسلر) و (المسلمون فی تاریخ الحضارة)ی (إستانوودکب)و (إیران في عهد الساسانیین)ی (آرثر کریستنسن) و (فتح العرب لمصر)ی (الفرید بتلر) و (قصة الحضارة)ی (ول دیورانت) کە سوودی باشمان لە بۆ چوونەکانی وەرگرتووە بەتایبەتی لە بواری لێکدانەوەی شارستانیەتەکاندا، کتێبی (التراث الیوناني في الحضارة الاسلامیة) کە لێکۆڵینەوەی چەند ڕۆژهەڵاتناسێکە و لەلایەن (د.عبدالرحمن بدوي) وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی، ئەم کتێبە بەتایبەتی لە دوو لێکۆڵینەوەی ناوی سوودمان وەرگرتووە کە

لــه لیــستی سەرچــاوەکاندا ئاماژەمــان پێــی داوه. ئەمانــەو چــەندین سەرچــاوەی ڕۆژهەڵاتناسانی تر کە سوودمان لێیان وەرگرتووه.

هەروەها چـەندین سەرچـاوەی عـەرەبیمان بـەکارهێناوە کـە لەلایـەن نووسـەرە عەرەبەکانەوە نووسراون، لەوانەش: (د. رشـید الجمیلـي: حرکـة الترجمـة في المـشرق الاسلامي في القرنين الثالث و الرابع للهجرة) لەم سەرچاوەیەدا چەند زانیارییەکی باشی تیایــە لــەبارەی بزووتنــەوەی وەرگێــڕان و ســەرەتای بزووتنەوەکــە و کــار و بەرهەمــەکانیان و وەرگێڕکــاران، بــەڵام زانیارییــەکانی تێکــەڵ و پێکــەڵ و ســادە و دووبارەن، کتێبی (السریان و الحضارة الاسلامیة)ی (د. الشحات السید زغلـول) ئـەم کتێبـە چـەند زانیارییـەکی باشـی تیادایـە لـەبارەی بزووتنـەوەی وەرگێـڕان و ڕۆڵـی سریانیەکان تیایدا و هـەروەها باسـی ڕۆڵـی سـریانیەکان بەگشتی لـە شارسـتانیەتی ئیسلامیدا کراوە و لەو بوارەدا سەرچاوەیەکی بەبایەخ بووە. هەروەها کتێبی (ضحی الاسلام)ی (أحمد أمین) یەکێکی تربوو لـە سەرچـاوە باشـەکانی کـە لەچـەند بوارێـك بەتایبەتی بۆ بەشـەکانی دووەم و سـێیەم سـوودمان لێ وەرگرتـووە، ئەمانـەو چـەند کتێبێکی تری وەك هـەردوو کتێبـی (تـاریخ الفلـسفة الیونانیـة مـن منظـور شـرقي) و (مدخل لقراءة الفکر الفلسفي عند الیونان)ی (د. مصطفی النشار) و کتێبی(دراسات فی تاریخ العلوم عند العرب)ی (حکمت نجیب عبدالرحمن) و هەردوو کتێبی (تاریخ العلوم عند العـرب) و (تـاریخ الفکـر العربـي الی أیـام إبـن خلـدون)، هـەروەها کتێبـی (أعـلام الحـضارة العربیــة في الاســلام)ی (زهــیر حمیــدان)، و کتێبــی (التعریــب في القــدیم و الحدیث)ی (د. محمد حسن عبدالعزیز) کە لە بەشی سێیەم تا ڕادەیك سـوودمان لێـی وەرگرتووه. هەروەها هەردوو کتێبـی (تـراث العـرب العلمـي في الریاضـیات و الفلـك) و (علمـاء العـرب ومـاأعطوه للحـضارة)ی (قـدري حـافظ طوقـان)، ئەمانـەو چـەندین سەرچاوەی تری گرنگ لـە سەرچـاوەی عـەرەبی و گۆڤـار و گوتارەکـان و سەرچـاوە ئەلکترۆنییەکان، کە لە سـوودوەرگرتن و گرنگـی و بایـەخیان بـۆ لێکۆڵینەوەکـەمان، نـەك لـەو سەرچـاوانەی تـر کـەمتر نـین، بـەڵکو لـە شـوێن و جێگـای تایبەتیـشدا بۆچوونەکانی ناویان سوودی تەواویان لێ وەرگیراوە.

## بەشی یەکەم: شارستانیەت و بنەماکانی شارستانیەتی یۆنانی

### باسی یەکەم: شارستانیەت

یەکەم: لەڕووی زمانەوانییەوە

دووەم: لەڕووی زاراوە و تێگەیشتنەوە

### باسی دووەم: قۆناغە سەرەکییەکانی شارستانیەتی یۆنانی:

یەکەم: قۆناغی پەرەسەندن و دروستبوون

(قۆناغی کۆن Archaic Period)

دووەم: قۆناغی پەرەسەندن و دەرکەوتن

(قۆناغی کلاسیکی Clissical Period)

سێیەم: لاوازبوون و داڕمان

(قۆناغی هیلنستی Hellenistic Period)

# باسی یەکەم: شارستانیەت

**یەکەم: لە ڕووی زمانەوانییەوە:**

لە ڕووی زمانەوانییەوە هاوواتاییەکی نزیك لەنێوان زۆربەی زمانە زیندووەکانی ئەوروپادا هەیە، سەبارەت بە زاراوەی (شارستانیەت)[1]، ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە سەرەتای ئەم زمانانە لەیەك بنەچەی لاتینییەوە بابەتەکەیان وەرگرتبێ، کە لەوێدا وشەی (Civilities) بە واتای (شار) هاتووە، هەروەها (Civis) کە بە واتای (دانیشوانی شار) دێت، یاخود (Civilis) بە واتای مەدەنی (سڤیل)، یان ئەوەی کە پەیوەندی بە دانیشتوانی شارەوە هەیە و (Cities) کە ئەمەش بەو دانیشتوانە ڕۆمانییانە وتراوە کە پلەیەکی بەرزتریان بەسەر دانیشتوانە ڕۆمانییە بەربەرەکاندا هەبووە[2].

گەر لەم مانایانەش بکۆڵینەوە، دەبینین هەمان ئەم وشانەیە کە لە زمانەکانی تری دوای خۆیدا ڕەنگی داوەتەوە و زاراوەی شارستانیەتی لێوە داتاشراوە، لە زمانی ئینگلیزیدا وشەکە بووە بە (Civilization)، ئەمەش بە بەراورد لەگەڵ زمانە لاتینییەکەدا دەبینین لە هەردوو وشەی (Civitas) کە بە واتای شاردێت و هەروەها (Civilis) کە بە واتای شارنشین دێت داتاشراوە، هەروەك لەزمانی فەرەنسیشدا کە لەوێدا بە (Civilisation) دەردەبڕدرێت بە هەمان شێوە ئەم

---

(١) د.أحمد محمود صبحي، د.صفاء عبدالسلام جعفر: في فلسفة الحضارة (اليونانية – الاسلامية – الغربية)، دار وفاء لدنيا الطباعة و النشر، الاسكندرية، ط١، ٢٠٠٦، ص٧.

(٢) محمد نصر عارف: الحضارة – الثقافة – المدنية، دراسة لسيرة المصطلح ودلالة المفهوم، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ط٢، ١٤١٥هـ / ١٩٩٤م، ص٣٣ "د.ابراهيم محمد تركي: في فلسفة الحضارة قضايا ومناقشات، دار وفاء لدنيا الطباعة و النشر، الاسكندرية، ط١، ٢٠٠٦م، ص٢٩ " د.عصام احمد بشير: الحضارة تاريخ المصطلح ودلالة المفهوم. لە سایتی ئینتەرنێتی WWW.ALTAREEKH.COM وەرگیراوە.

زاراوەیـە لـە (Civilis) داتاشـراوە[1]، ئەمانـەی سـەرەوە وەك زمانـە گـەورەكانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، لـە بەرامبەریـشدا زمـانی عـەرەبی وەك زمـانی شارسـتانیەتی ئیسلامیی زاراوەكە بە (حضارة) دەردەبڕێت، ئەم زاراوەیـەش بنەماكـەی (حـضر)ە، لەتەواوی فەرهەنگـە عەرەبییەكانـدا بـە واتـای (إقامـة في الحـضر) نیـشتەجێبوون لـە ئاوەدانیدا دێت، بەمەش جیاوازی كراوە لەنێوان كەسـەكاندا بـەوەی كـە ئـەو كەسـە كەسـێكی (حـضری) شارنـشینە، نیـشتەجێیە، یـان كەسـێكی (بـدوی)یـە، كۆچـەری دەشـتەكی، هـەروەها هـاتووە كـە (حـضر) پێـچەوانەی (بـداوة)یـە و بـە جیـاواز لـە كۆچەری حساب دەكرێت[2]. بە تێڕوانینیشمان لەم بابەتانەی سەرەوە كە لـە زمـانی عەرەبیـدا واتـا زمانییەكـەی شارسـتانیەت هـەمان واتـای یۆنانییـە، دەگەینـە ئـەو دەرەنجامـەی كـە كاریگـەریی وەرگێڕانـی یۆنـانی و شارسـتانیەتی یۆنـانی لەلایـەن وەرگێڕ و زانامسوڵمانەكانەوە، ئەم لێكچوونە زمانییەی درووست كردووە[3].

بەتایبـەتی كاتێـك ئـەوە بـزانین كـە زاراوەی (حـضارة) لـە قورئـانی پـیرۆزدا نەهاتووە، هەروەها (حضر) كە لەفەرهەنگە زمانییەكاندا (حضارة)ی لێوە داتاشراوە،

---

(١) د.حسن إسماعيل: الدلالات الحضارية في لغة المقدمة عنـد إبـن خلـدون، دار الفـارابي، بـيروت، ط١، ٢٠٠٧، ص٣٤"د.محمد جلال إدريس: العلاقات الحضارية، دار القلم –دمشق، ص١٥ " خالـد ابو الفتوح: الحضارة، مجلة البيان، العدد١٤٦، لندن، السنة الرابعة عـشر، مـايو / فبرايـر ٢٠٠٠م، ص١٢٩.

(٢) ابن زكريا: معجم مقايس اللغة، تح عبدالسلام محمـد هـارون، ط٢، ١٤٢٠هــ /١٩٩٩م / دار جيل، بيروت –لبنان، ج٢، ص٧٥، ٧٦ " ابن منظور: لسان العرب، دار صـادر – بـيروت (د.ت)، ج٤، ١٩٦ – ١٩٧ (مادة حضر)" الرازي: مختار الصحاح، تح محمـود خـاطر، ١٤١٥هــ، ١٩٩٥م، بيروت – لبنان، ص٥٩ " الفيروز آبادي: القاموس المحيط، (د.ت)، مؤسسة الرسالة / بـيروت، ج١، ص٤٨١ – ٤٨٢ " ابراهيم مصطفى وآخرون: المعجم الوسـيط، دار الـدعوة، مجمـع اللغـة العربيـة، ص١٨٠ – ١٨١ " الزبيدي: تـاج العـروس مـن جـواهر قـاموس، (د.ت)، وزارة الارشـاد والانبـاء بالكويت، ج١١، ٣٧ /(مادة حضر).

(٣) خالد ابو الفتوح: م.س، ص١٢٨.

تیایدا بەواتای تر هاتووە[1] هەروەك ئایەتەكانی (كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ)[2]هەروەها لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت (وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُمْ مِنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَعْرُوفًا)[3] دیارە واتای ئەم ئایەتانەش بۆخۆی جیاوازە لە مانای(حضارة) شارستانیەت. لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ ئەوە بكەین كە لەنێو زمانەكاندا لەبری زاراوەی شارستانیەت هەردوو زاراوەی (Culture – الثقافة) ڕۆشنبیری و (Civil –المدنیە) بەكاردەهێنرێ، بەڵام ئەم دوو زاراوەیە هەروەك سەرچاوەكان جەختی لێدەكەنەوە، سەرباری ئەوەی تاڕادەیەك نزیكی هەیە لە نێوان ئەمان و شارستانیەت لە ڕووی بەكارهێنانەوە، بەڵام بە گەڕانەوەمان بۆ بنەچەی ئەم زاراوانە دەبینین هەڵەیە*، ئەگەر ئەم دوو زاراوەیە (Civilization – حچارە) بەراورد بكەین[4]، سەرباری ئەوەی لە گشتاندندا زاراوەی (مدنیة) لە (Civilization–حضارة) نزیكترە، چونكە بنەچەكەیان زیاتر هاوواتان، بەڵام بەكارهێنانیان جیاوازە[5]، هەروەك لە باسی زاراوەی شارستانیەت زیاتر ڕوونی دەكەینەوە. بەڵام (Culture – الثقافة) بنەچەیەكی زمانەوانی جیاوازتری هەیە و

---

(١) د.عصام أحمد بشير: م.س.

(٢) سورة البقرة آية ١٨٠.

(٣) سورة النساء آية ٨.

* لە زمانی عەرەبیدا (المدنیة) بۆ (الإقامة في المدینة) هاتووە واتە دانیشتوانی شار ئەمەش پێچەوانەی (البداوة و السكن في البادیة)یە، (الحضارة) لە (الإقامة في الحضر) واتە دانیشتوانی شاری گەورە، هەروەك وتراوە (بغداد حاضرة العراق) واتا بەغداد شاری گەورەی عێراقە.

(٤) محمد نصر عارف: م.س، ص٣٣ – ٤٦" د.ابراهيم محمد تركي: م.س، ص٣٢ – ٣٣. د.محمود إسماعيل: تاريخ الحضارة العربية الاسلامية، مكتبة الفلاح للنشر والتوزيع – بيروت، ط١، ١٤٠٩هـ / ١٩٨٩م، ص ١١.

(٥) د.محمود إسماعيل: م.ن، ص١١ " علي القريشي: بين الحضارة والمدنية وأزمة العالم اليوم، دار الترف، بيروت، ط١، ١٣٩٧هـ / ١٩٧٧م، ص ٨.

لە زاراوەی (Cultura)ی لاتیی وەرگیراوە[1]، ئەمەش بە واتای کێڵانی زەوی و پەرەپێدانی بەروبوومەکانی هاتووە و ئەم واتایەش بۆ ئەم زاراوەیە لە تەواوی سەردەمەکانی یۆنانی و ڕۆمانیدا درێژەی هەبووە. پاشان ئەم زاراوەیە بۆ گەشەکردن یاخود بەرەو کامڵبوونی ژیری بە فێربوون و کارکردن لەسەر ئەو ژیرییە بەکار هاتووە. هەروەك لە هەندێك جێگادا بە واتای (دروێنە) هاتووە[2]، لە سەردەمە نوێیەکاندا لەلایەن هەندێك لە لێکۆڵیارانەوە شارستانیەتیان دابەش کرد بەسەر دوو لایەندا ئەوانیش (ماددی، عەقڵی – ڕۆحی) داو بەم جۆرەش زاراوەکانی (Culture) یان بۆ لایەنی عەقڵی ـ ڕۆحی بەکاردەهێناو زاراوەی (Civilization) یان بۆ لایەنی ماددی بەکار دەهێنا، هەندێکی تریش دەهاتن بە پێچەوانەی ئەمەی سەرەوە ئەم دووزاراوەیەیان بەکار دەهێنا، واتە (Culture)یان بۆ لایەنی ماددی بەکار دەهێنا و زاراوەی (Civilization) یان بۆ عەقڵی ــ ڕۆحی بەکاردەهێنا تا کار گەیشتە ئەوەی بیریارێکی وەك (Tylor تایلۆر) ڕای گەیاند کە ئەم دووزاراوەیە هاوواتان[3]، بەڵام لە ڕاستیدا زاراوەی (Culture) واتای تر دەگەیەنێت و مانا دەقاودەقەکەی شارستانی (Civilization) دەبێت، بۆیە لە ئێستادا لە تەواوی فەرهەنگە ڕۆژئاواییەکاندا بەتایبەتی ئینگلیزییەکان زاراوەی (Civilization)بۆ دەربڕینی شارستانی بەکاردەهێنا [4].

---

(١) د.حسين مؤنس: الحضارة، ط٢، ١٤١٩هـ / ١٩٩٨م، سلسلة كتب عالم المعرفة، ص٣٧٦ - ٣٧٧ " کامەران موحەممەد: کەلتوور لەنێوان وەرگرتن و ڕەت کردنەوەدا، سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چ١، ٢٠٠٧ ز، ل١٣ – ١٤.

(٢) د.حسين مؤنس: م.ن، ص٣٧٦ - ٣٧٧ " کامەران موحەممەد: م.ن، ص١٣ – ١٤ " د.حسن إسماعيل: م.س، ص٣٤، د. محمد جلاء إدريس: م.س، ص٢٢ -٢٣.

(٣) د.حسن إسماعيل: م.ن، ص٣٩.

(٤) د.محمود إسماعيل: م.س، ص١٣-١٤" د.حسين مؤنس: م.س، ص٣٧٦ - ٣٧٧ " کامەران موحەممەد: م.س، ل١٣ – ١٤" خالد ابو الفتوح: م.س، ص١٢٩-١٣١.

**دووەم: لە ڕووی زاراوە و تێگەیشتنەوە:**

لەبارەی دیاریکردنی مانا و واتای شارستانیەوە لێکۆڵیاران جیاوازی زۆر لە نێوانیاندا هەیە، ئەمەش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و هەروەها لە ئینتمابوون و تایبەتمەندی هەریەك لەو لێکۆڵیارانەش جیاواز دەبێت و واتاکە گۆڕانی بەسەردا دێت.

لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا لە بارەی مانای زاراوەی شارستانیەتەوە بەم جۆرەیە ((شارستانیەت (حضارة)، پێچەوانەی، کۆچەری (بداوة)یە و ئەمەش بۆخۆی بەرامبەرە لەگەڵ کێوییبوون و بەربەرییەتدا، شارستانیەت بریتییە لە قۆناغێکی بەرز لە قۆناغەکانی گەشەسەندنی مرۆڤایەتی و کۆکراوەیەکە لە لایەنەکانی پێشکەوتن و پەرەسەندنی زانستی و هونەری و ئەدەبی کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە و لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگوێزرێتەوە)) (1).

هەر لەم بارەیەوە (إبن خلدون) دەڵێت: ((شارستانیەت بریتییە لە هونەری زیادەڕۆیی لە بنەماکانی پیشەسازی بەکارهاتوودا، بە تەواوی شێوە و جۆرەکانیەوە کە خۆی لە دروستکردنی خواردن و جلوبەرگ و بیناسازی و باقی کەلوپەلەکانی ناو ماڵدا دەبینێتەوە، دیارە ئەمانەش پێویستی بە دروستکردن و قوڵبوونەوە هەیە لە بابەتەکاندا و بەم قوڵبوونەوەیەش کەسەکان دەبن بە پسپۆڕ و شارەزا و لێرەشەوە کۆمەڵگا لە کۆچەری (بداوة) بەرەو شارنشینی و شارستانیەت دەڕوات)) (2).

هەروەها (ابن الازرق) کە بۆخۆی یەکێکە لەو کەسانەی بە بیری ڕۆژاوا بەتایبەتی یۆنانییەکان (ئەرستۆ) کاریگەرە، دەڵێت: ((شارستانیەت ئامانجی ئاوەدانییە (عمران)، ئەم ئاوەدانییەش کاتێك وێران دەبێت کە تەمەنی ئەو شارستانیەتە بەرەو کۆتایی بڕوات، ئەمەش کاتێ دەبێت کە پادشاکان ئامانجیان تیرەگەری بێت، بۆیە

---

(١) ابن زكريا: م.س، ص٧٥، ٧٦ " ابن منظور: لسان العرب، م.س، ج٤، ص١٩٦ — ١٩٧ (مادة حضر)" الرازي: م.س، ص٥٩ " الفيروز آبادي: م.س، ج١، ص٤٨١ — ٤٨٢" ابراهيم مصطفى وآخرون: م.س، ص١٨٠ — ١٨١ " الزبيدي: م.س، ج١١، ص٣٧ / (مادة حضر).

(٢) مقدمة ابن خلدون، دارالقلم —بيروت، ط٥، ج١، ص١٧٢.

شارستانیەت ئەوکات مانای خۆی لەدەست دەدات و دەبێت بە ئامانج بۆ کۆچەری، بەڵام هەرچەندە ئەمە درێژە بکێشێت تاسەر نابێت، چونکە تەمەنی پادشاکان و کۆچەریش دیاری کراوە و سەرئەنجام هەر شارستانیەتە کە دەمێنێتەوە و کۆمەڵگاکان بەرەو پێشکەوتن دەبات)) [1].

بەڵام لەلای بیریارانی نوێ ئەم چەمکە زیاتر پەرەدەستێنێت و لەگەڵ کات و سەردەمەکانی هەریەك لەم بیریارانەدا ماناکەی جۆری ئەو سەردەمە وەردەگرێت:

(ول دیورانت) دەڵێت: ((شارستانیەت سیستەمێکی کۆمەڵایەتییە وا لە مرۆڤ دەکات کە بەرهەمی زیاتر هەبێت و زیاتر ڕۆشنبیر بێت بە شتەکان، شارستانیەتیش لە چوار ڕەگەزی سەرەکی پێکدێت، ئەوانیش: بەرهەمی ئابووری و سیستەمی سیاسی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی و بەدواداچوونی زانستەکان دەگرێتەوە، ئەمیش ئەو کات دەست پێدەکات کە هەڵچوون و دڕدۆنگی کۆتایی پێ هاتبێت، چونکە کاتێك کە مرۆڤ ئارام بوو لە ترس ئیدی ئازاد دەبێت و ئارامییەکەی بۆ دەبێتە پاڵنەرێك تا کاراکتەرەکانی داهێنان و دروستکردن تیایدا پەرە بستێنێ)) [2].

(جۆرج باستید)ی فەڕەنسی دەڵێت: ((شارستانیەت بریتییە لە بەشداری ئیجابییانەی مرۆڤ بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێویستیە سرووشتییەکان و وەڵامدانەوەیەکە بۆ ئارەزووە یاخی بووەکانی مرۆڤ بەمەش دەگوترێت شارستانیەت)) [3].

(ئەلبێرت شبنسلر) دەڵێت: ((شارستانیەت زۆر بە سادەیی بریتییە لە خۆ ماندووکردن، بەوپێیەی ئێمە بوونەوەرێکی مرۆیین، دیارە ئەم خۆماندووکردنەش

---

(١) بدائع السلك في طبائع الملك، تح د.علي سامي النشار، وزارة الاعلام العراق، (د.ت)، ط١، ج٢، ص٢٩٠ – ٢٩١.

(٢) قصة الحضارة، تر. د.زكي نجيب محمود و محمد بدران، المؤسسة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠١م، ج١، ص٣.

(٣) وەرگیراوە لە: د.محمد جلاء إدريس: م.س، ص ١٣.

ئەگەر لەپێناوی تەواوکردن و پێشکەوتنی ڕەگەزی مرۆڤیدا نەبێت ئەوا شارستانیەت نییە)) [1].

(فردریك ئەنگلس) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((شارستانیەت بریتییە لەو پلەیەی پێشکەوتنی کۆمەڵگا کەتیایدا دابەشکردنی کار و ئاڵوگۆڕ لەنێوان تاکەکاندا ڕوو دەدات، بەهۆی ڕوودانی ئەم دوو کاراکتەرەشەوە دیاردەی بەرهەمهێنانی شتومەك تەواو دەردەکەوێت، کاتێکیش ئەم سێ کارەکتەرە دەرکەوت لە کۆمەڵگایەکدا، ئەبێتە هۆی پێشکەوتنی)) [2].

فەیلەسوفی ئەڵمانی بەناوبانگ (ئەسوالد شپنگلەر) دەڵێت: ((شارستانیەت بریتییە لە هەوڵی نەتەوەکان بۆ دیاری کردنی جۆری دەوڵەتەکەیان)) یان دەڵێت ((شارستانیەت بریتییە لە خاڵی پێشکەوتنی مرۆڤ و لەم پێشکەوتنەشەوە بەسەر هێزی سروشتدا سەردەکەوێت و لێرەوە بۆخۆی دەبێت بە داهێنەر، شارستانیەت سەرجەم بینراو و هەستپێکراوەکان دەگرێتەوە کە بریتین لە کار و کردەوە و بۆچوونەکان و ئاین و دەوڵەت و هونەر و زانست و گەلان شارەکان و ئابووری و ڕەگەزەکانی کۆمەڵایەتی و ئاخافتن و داب و نەریت و سروشت و هێڵەکانی دەموچاو وجلوبەرگ)) [3].

لە کۆتایشدا بۆچوونی مێژوونووس (ئارنۆڵد تۆینبی) وەردەگرین کە زیاتر لە وردبینییەوە نزیکە، هەروەك دەڵێت: ((شارستانیەت بریتییە لە سەرجەم ئەو کارانەی مرۆڤ ئەنجامی ئەدات لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی و زانستی و عەقڵیدا)) [4].

---

(١) فلسفة الحضارة، تر. د.عبدالرحمن بدوي، المؤسسة المصرية العامة للتأليف والترجمة والطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٣م. ص٥.

(٢) وەرگیراوە لە: د.حسن إسماعیل: م.س، ص٣٦.

(٣) تدهور الحضارة الغربية، تر. أحمد شيباني، دار مكتبة الحياة – بيروت، (د.ت)، ج٢، ص٥٤٠.

(٤) وەرگیراوە لە: علي قريشي: م.س، ص ١٦.

ئاشــكرایە بۆچــوونەكان ســەبارەت بــە دیــاریكردنی زاراوەی شارســتانیەت و بابەتەكانی گەلێك زۆرن، ئێمـە لێـرەدا بـەو چـەند نموونەیـەی سـەرەوە كۆتـایی پـێ دەهێنین، لە كۆتاییدا و لە دەرەنجامی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە و بە هەڵسەنگاندنی وردی بابەتەكە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی كە شارستانیەت بریتییە لەسەرجەمی ئەو پێـشكەوتنە مـاددی و مەعنـەوی و عەقڵییانـەی كـە بـە هـەوڵ و مانـدووبوونی مـرۆڤ بەدەست دێت و دەبێتە هۆی بەرەو پێش چوونی كۆمەڵگا لە سـەرجەم بوارەكانـدا و بەمـەش ئـەو كۆمەڵگایـە بـەرەو ئاسـتێكی زۆر بـەرزتر لـەوەی كەتیایـەتی دەڕوات و دەبێتە كۆمەڵگایەكی شارستانیی.

## باسی دووەم: قۆناغە سەرەکییەکانی شارستانیەتی یۆنانی

مەبەست لە شارستانیەتی یۆنانی کاریگەری لایەنی زانستییە لە شارستانیەتی (یۆنانی* و ئیغریقی و سەرەتای ڕۆمانی)** ، بەتەواوی قۆناغە جیاوازەکانی ئەو شارستانیەتەوە، هەر لە سەردەمی سەرەتای شارستانیەتەکەوە تا دەگاتە سەردەمی هیلنستی. کە تەواوی زانستەکان لە شارستانیەتی یۆنانیدا لەم ماوەیەدا چەکەرەی کرد و پەرەی سەند، بەڵام بە هاتنی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی کە لەسەر پاشماوە و کلتووری ئەم شارستانیەتە دروست بوو، ئەم شارستانیەتە تاڕادەیەکی زۆر پووکایەوە و بەرەو نەمان چوو. لێرەوە ڕۆژئاوا بەرەو سەدەکانی ناوەڕاست هەنگاوی نا، ئەو ماوەیەی کە لە مێژوودا بە سەدە تاریکەکانی ڕۆژئاوا ناسراوە، کە تیایدا هەرچی لایەنی زانستی شارستانیەتی یۆنانی هەبوو لە گەنجینەی ناو

---

* سەرچاوە ڕەسەنە عەرەبییەکان کاتێك باسی (یۆنان) دەکەن، دەڵێن ((یۆنانییەکان بریتین لە پێشینەکانی ڕۆم لە نەوەی یۆنان بن یافث بن نوح، ئەمانە خاوەنی گەردوونناسی و حساب و ئەندازیاری و پزیشکی و لۆژیك و پیشەسازی جوان و سەرجەم حیکمەتە دیارەکان بوون)) بڕوانە: اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، دار الصادر، بيروت، (د.ت)،ج١، ص٥٦" المسعودي: مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الفكر – القاهرة، ط٥، ١٩٧٣م، ج١، ص٢٨٥ " أخبار الزمان، دار الاندلس، بيروت، ١٩٦٦م، ص٩٣.

** بۆ ئەم شارستانیەتە لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا دوو زاراوەی جیاواز بەکار دەهێنرێت (یۆنان – ئیغریق)، کە مەبەست لە (یۆنان) ئەو خاك و وڵاتەیە کە شارستانیەتەکەی تیادا دەرکەوتووە، (ئیغریق)یش مەبەست ئەو گەلەیە کەشارستانیەتەکەی دروست کردووە و کۆچیان کردووە بۆ ئەو خاکە، هەندێکیش بە تێکەڵی بۆ هەردووکیان بەکاری دەهێنن، لە سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان بە تایبەتی ئینگلیزیەکاندا ئەم جیاوازییە نەکراوە و هەمووی بە (Greece یان Greek) ناو دەبەن، لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا وشەیەکی هاو واتا بۆ ئەم زاراوەیە نییە بۆیە ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەماندا بە شارستانیەتی یۆنانی ناوی دەبەین.

کەنیسەکاندا شاردرانەوە[1]، بەڵام بەهاتنی ئیسلام و بەتایبەتی لەسەردەمی یەکەمی عەبباسییدا بووە هۆی سەرلەنوێ زیندووکردنەوەی ئەم شارستانیەتە، (إبن القفطي) لە دەقێکیدا لەم بارەیەوە دەڵێت: ((خەلیفە مەئمون بۆ دەستکەوتنی زانستی یۆنانییەکان بەتایبەتی چەند بابەتێکی ئەرستۆ تالیس، ناردی بۆلای مەلیکی ڕۆم و تێیدا داوای لێ کردبوو کە ئەو زانستانەی بۆ بنێرێ، بەڵام مەلیکی ڕۆم پاش گەڕان و بەدواداچوونێکی زۆر نەیتوانی هیچی لەو بابەتە دەست بکەوێت کە (مەئمون) داوای کردبوو، بۆیە کەوتە پرسیارکردن و هەروەها ئەوەی بڵاوکردەوە کە مەلیکی مسوڵمانان داوای شتێکی لێکردووە لەبارەی زانستەکانی پێشینی من کە یۆنانییەکانن، بەڵام من ئێستا ئەوەم بۆ نادۆزرێتەوە، ئەوە بوو ڕاهیبێك کە لە یەکێك لە دێرەکانی کەستەنتینیەدا گۆشەگیر بوو، دێتەلای مەلیکی ڕۆم و پێی دەڵێت: ئەوەی تۆ داوای دەکەیت لای من دەست دەکەوێت، سەرجەمی ئەو زانستانە لەناو گەنجینەیەکی کەنیسەیەکی کەستەنتیندا هەڵگیراوە و قفڵی لێدراوە، هەر لە سەردەمی کوستەنتینی گەورە *، کاتێك مەسیحی کردە ئاینی دەوڵەت ئەم زانستانە لە دەستی خەڵکی کۆکرانەوە و خرانە ئەو شوێنەوەو دەرگای لەسەر داخرا، هەر مەلیکێکیش لە دوای ئەو هاتبێت قفڵێکی تازەی لێداوە، وە لەو شوێنەدا پەیکەرێکی گەورەی تیایە کە خەڵکی لەسەردەمی یۆنانیدا پەرستوویانە، کاتێك مەلیك گەنجینەکەی کردەوە بینی کە ڕاهیبەکە ڕاست دەکات، بۆیە پرسیاری لە ڕاهیبەکە کردەوە کە بۆچوونی چییە لەبارەی ئەم زانستانەوە، ڕاهیبەکە وتی: ئەگەر

---

(١) بۆ زیاتر شارەزا بوون لەم بارەیەوە بڕوانە: محمد الخطيب: حضارة أوروبا في العصور الوسطى، دار علاء الدين، دمشق، ٢٠٠٦م، ص١٢ – ٣٢.

* کوستەنتینی گەورە: یەکێکە لە ئیمپڕاتۆرە گەورەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی، لە ساڵی ٣١٣ز بەپێی مەرسومی (میلان) دەقێکی دەرکرد و دانی بەئاینی مەسیحیدا نا و پاشان کردیە ئاینی ڕەسمیی دەوڵەت، هەروەها شاری کەستەنتینیەی دروست کرد و لێرەوە نزیك بۆوە لە شارستانیەتی یۆنانی و دەستی گرت بەسەر ئەو شارستانیەتە و کلتووری زانستییەکەیدا، بڕوانە: د.نورالدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في أوروبة، دار الفكر، دمشق، ط١، ١٩٦٧م، ص٦٩.

ئەمانەیان بۆ بنێری ئەوە پاداشتت پێ دەگات، لەبەر ئەوەی مەترسییەك لە دنیادا لە کۆڵ دەکاتەوە و لە ئاخیرەتیش خراپەیەك کەم دەبێتەوە، بەمەش پاداشتت دەست دەکەوێت و ئەم زانستانە بچنە ناو هەر میللەتێکەوە ڕێساکانی ئەو میللەتە هەڵدەوەشێنن. بۆیە مەلیکی ڕۆم بەبێ ئەوەی بزانێت ئەو کتێبانە چی تیایە و زانستێکی چۆنەو یان بیپشکنێت، بە پێنج بار ناردی بۆ لای (مەئمون)، بە گەیشتنی ئەم بارانەش مأمون وەرگێڕکارانی لە دەور کۆکردەوە و فەرمانی پێکردن بە وەرگێڕانی ئەو کتێبانە بۆ عەرەبی))[1]. هەر لەمبارەیەوە (حاجی خەلیفە) دەڵێت: ((ئەبوجەعفەری مەنصور ناردی بۆلای مەلیکی ڕۆم تا کتێبی لەبارەی تعالیم وەرگێڕدراوی بۆ بنێرێ، ئەویش کتێبی ئۆقلیدس و هەندێ کتێبی سروشتی بۆ نارد، پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبانە لەلایەن مسوڵمانانەوە زۆر تامەزرۆی ئەوە بوون کە تەواوی ئەم کتێبانە تەواو بکەن تا کاتی هاتنی مأمون ئەمەیان بۆ گونجا))[2]هەروەها لە جێگایەکی تردا دەڵێت: ((زانستەکانی الأوائل لە سەردەمی ئومەویەکاندا بوونی نەبوو و نادیار بوو تا دەرکەوتنی عەبباسییەکان و لە نێو ئەوانیشدا یەکەم کەسێك کە گرنگی بەم زانستانە دا (ئەبوجەعفەری مەنصور) بوو، سەرباری ئەوەی لە بواری (فیقە)دا شارەزابوو ڕووی کردە بواری فەلسەفە و بەتایبەتی لە بواری زانستی ئەستێرەناسیدا، پاشان کاتێك خەلافەت کەوتە دەست خەلیفەی حەوتەم (عبدالله المأمون ابن الرشید) دەستی کرد بە تەواوکردنی ئەوەی کە باپیری دەستی دابویە و ناردی بۆلای مەلیکی ڕۆم و پرسیاری لێ کرد لەبارەی ئەوەی چییان هەیە لە کتێبی فەیلەسوفان بۆی بنێرێ، ئەویش هەرچی لەلابوو لە کتێبەکانی ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و ئەبیقرات و جالینۆس و ئەقلیدس و بەتڵیمۆس و چەندانی تریش لە فەیلەسوفان بۆی نارد و ئەویش وەرگێڕکارانی کارامەی خستەسەر و هەروەها خەڵکی هاندا کە بیخوێننەوە و زانستەکانی فێر بن))[3].

---

(١) أخبار العلماء بأخبار الحكماء، القاهرة، ١٣٢٦هـ، ص١٨.

(٢) كشف الظنون: دارالكتب العربية، بيروت، (د.ت)، ج١، ص٦٧٦.

(٣) حاجي خليفة: كشف الظنون، ج١، ص٣٤.

لـەم دەقانـەی سـەرەوەوە دەگەینـە ئـەو ڕاسـتییەی کـە پـاش داڕووخـان و پووکاندنـەوەی شارسـتانیەتی یۆنـانی لەلایـەن ڕۆمانەکانـەوە، چـۆن لەلایـەن زانـا مـسوڵمانەکانی شارسـتانیەتی ئیـسلامیی ئـەم زانـستانەیان گواسـتەوە بـۆ دەوڵـەتی ئیـسلامیی لەسـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییدا و ڕابـوونی شارسـتانیەتی خۆیـان پـێ ئەنجامـدا، هــەروەك زۆرێــك لــە ڕۆژهەڵاتناســان جــەخت لەســەر ئــەم ڕاســتییە دەکەنـەوە[1]. ئەمـەش بـە گواسـتنەوەی شارسـتانیەت دائـەنرێت لـە ڕۆژئـاواوە بـۆ ڕۆژهەڵات و سروشـتی شارسـتانیەتیش وایـە هـەردەم لـە ئـاڵوگۆڕ و گواسـتنەوەدایە لەلایەك چـەکەرە دەکـات و لەلایـەکی تـر دەپووکێتـەوە ئەمـەش بـەپێی شـوێنەکان دەگۆڕدرێت، هەروەك شارستانیەتەکانی فینقـی و شارسـتانیەتی نێـوان دووڕووبـار و دۆڵی نیل بووە بنەمایەکی باش بۆ ڕابوونی شارستانیەتی یۆنانی و خۆیان پێ بنیـات نا و بەداهێنانە گەورەکانیان توانییان شارستانیەتییەکی بنەماپتەو و بەهێز درووست بکەن، شارستانیەتی ئیسلامیش توانی بنەما زانستییەکانی شارسـتانیەتەکانی خـۆی لەســەر شارســتانیەتی یۆنــانی دابڕێــژێت و شارسـتانیەتییەکی بــەهێز لەســەر ئــەو بنەمایانــەی شارسـتانیەتی یۆنـانی داڕێژێتـەوە، هـەروەك لـە بەشـەکانی تـری ئـەم لێکۆڵینەوەیەماندا لێی دەدوێین. هەروەها شارستانیەتی ئیسلامیش پاش بەهێزبوون

---

(١) بۆ زیاتر شارەزابوون لەم بارەیەوە بڕوانە:

DR. T. J. DE BOER: THE HISTORY OF PHILOSOPHY IN ISLAM, t. EDWARD R. JONES, B.D.Pp11 – 24 ;

دي لاسي أوليري: العلوم اليونانية وسبل انتقالها الى العرب، تر. د.وهيب كامل، مكتبـة النهـضة المصرية، لقاهرة، ١٩٦٢م" د. دي لاسي أوليري: انتقال علوم الإغريق الى العرب، تر.متـى بيشـون، يحيى الثعالبي، ط١، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٨م" دافيد سانتلانا: المذاهب اليونانية الفلـسفية في العالم الاسلامي، تح. محمد جلال شرف، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨١م.

و گەیشتنە ترۆپك جارێكیتر لە سەردەمی ڕێنیسانسی ڕۆژئاوادا گواسترایەوە بۆ ڕۆژئاوا [(١)].

بەهەرحاڵ، لێرەدا بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی و بۆ تێگەیشتن لەو كاریگەری و ڕەنگدانەوەیەی كە شارستانیەتی یۆنانی لەناو شارستانیەتی ئیسلامیدا هەیبووە و بووەهۆی ڕابوونی ئەو شارستانیەتە، سەرەتایەك لەبارەی بنەما سەرەكییەكانی شارستانیەتی یۆنانی باس دەكەین، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە خۆی لە سێ قۆناغی سەرەكیدا دەبینێتەوە:

**یەكەم: قۆناغی پەرەسەندن و دروستبوون (قۆناغی كۆن Archaic Period):**

شارستانیەتی یۆنانی لە وڵاتی یۆنانی كۆن پەرەی سەند كە ناوچەی كەنارەكانی ئاسیای بچووك و دورگەكانی دەریای ئیجە و وڵاتی یۆنانی ئێستای دەگرتەوە[(٢)]، لە ناوەڕاستی هەزارەی دووەمی پێش زاین هەندێ لە گەلانی (كریتی - هندۆ ئەوروپی) كۆچیان كرد بۆ وڵاتی (یۆنان) و بە (ئاخییەكان)ناسران، توانییان شارستانیەتی (ئاخی) بنیات بنێن كە پێشبڕكێی لەگەڵ (فینقی)یەكاندا دەكرد لە دەستگرتن بەسەر حەوزی ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست، پەیوەندی بەردەوامیان هەبوو لەگەڵ (فینقیا و ئەنادۆڵ و میسر)، و لە كۆتاییەكانی سەدەی دوازدەی پێش

---

(١) ارنولد توينبي: العالم والغرب، تر.عبدالواحد الانبابي، الدار القومية للنشر، مصر، (د.ت)، ص٣ – ٥، ٢٣ – ٢٤، ٦١ " بحث في التاريخ، تر. طه باقر، بغداد، ١٩٥٥م، ج١، ص١ - ٢٨، ٣٥٩ " د.إبراهيم محمد تركي: في فلسفة الحضارة قضايا ومناقشات، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية،ط١،٢٠٠٦م، ص١٦٣ – ١٧٥" د. عادل نجم عبو و د. عبدالمنعم رشاد محمد: اليونان و الرومان دراسة في التاريخ والحضارة، جامعة الموصل، ١٩٩٣م،ص٢٢٦-٢٤٤.

(٢) لطفي عبدالوهاب يحيى: اليونان مقدمة في التاريخ الحضاري، بيروت، ط١، ١٩٧٩م، ص٣٦ – ٤٦ " تيودور ضيانا كوليس: اليونان شعبها وأرضها، تر. محمد أمين روستم، مؤسسة فرانكفلين للطباعة والنشر، القاهرة – نيويورك، ١٩٦٣م، ص٢١- ٢٥ " د.أحمد فؤاد باشا: التراث العلمي للحضارة الاسلامية، (د.م)،ط١، ١٩٨٣م، ص٩ – ١١.

زاین، سەرەتای کۆچی گەلانی تری (هیندۆ ئەوروپی) بۆ وڵاتی (یۆنان) دەستی پێکرد و ئەمانەش لە دوایدا بە (دورییەکان) ناسران، ئەمان توانییان لە ماوەی دوو سەدەدا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر (ئاخییەکاندا) بسەپێنن، لە پاشدا تێکەڵ بوون و ئاوێتە بوونی ئەم دوو گەلە بووە هۆی سەرەتای دروستبوونی گەلی (ئەسینا)، کە ئەمانەش بە بنەچەی گەلی یۆنانی دادەنرێن.

لە پاش زۆر بوونی ژمارەی خەڵکی ڕووبەری وڵاتەکەیان تا دەهات بەرتەسکتر دەبوویەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە کێشە و ناکۆکییەکان لەنێوان ئەم دوو گەلەدا قووڵتر بووەوە و شەڕ و پێکدادان لە نێوان هۆز و خێزانە جیاوازەکاندا پەرەی سەند، دەرەنجام زۆرێك لە گەلی (ئەسینا) لە ڕێگای دەریای (ئیجە)وە کۆچیانکرد بەرەو ئاسیای بچووك(تورکیای ئێستا) و لەوێ نیشتمانێکی نوێیان پێکهێناو ناویان نا (ئایۆنیە)[1]. جێگای باسە لە سەردەمی هەشتەمی پێش زاین لەم نیشتمانەوە یەکەم بنەما و سیمای شارستانیەتی یۆنانی بەدەرکەوت کە خۆی لە هەردوو چیرۆکی (ئلیازە و ئۆدێسە)دا دەبینێتەوە، کە لە لایەن شاعیری نابینای یۆنانی (هۆمیرۆس)ەوە نووسراون و لەگەڵ زیادکردنی شەپۆلی کۆچ، بەرەبەرە دوورگەکانی وڵاتی یۆنان زیادی کرد و هەتا گەیشتە کەنارەکانی (مەڕمەڕە) و دەریای ڕەش و دەردەنێل لە باکوورەوە، هەروەها درێژبۆوە تا ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست لە

(١) هـ.د.كيتو: الإغريق، تر. عبدالرزاق يسرى، دار الفكر العربي، ط١، ١٩٦٢م،ص٩ – ٣٠ " د.عبداللطيف أحمد علي: التاريخ اليوناني العصر الهللادي، دار النهضة العربية، ط١، ١٩٧٦، ص٧ – ١٢ " د. سعيد إسماعيل علي: التربية في الحضارة اليوانية، القاهرة، ط١، ١٩٩٥م، ص٢٤ – ٢٧ " د. عاصم أحمد حسين: المدخل الى تاريخ و حضارة الإغريق، مكتبة نهضة الشرق، (د.م) (د.ت)، ص٥٦ – ٥٩ " د. حسين الشيخ: اليونان، دارالمعرفة الجامعية، الاسكندرية، مصر، ط١، ١٩٩٢م، ص٥ – ٧ " علي عكاشة وآخرون: اليونان و الرومان، دار الأمل للنشر والتوزيع، الأربد، ط١، ١٩٩١م، ص٥١ – ٥٨.

ئیتاڵیاو سەقلیە و ئیسپانیا و دەرەنجام وڵاتی (یۆنانی گەورە)ی لێ پێك هات[1]، لە دەرەنجامی کۆکردنەوەی سەرجەم ئەم گەل و ناوچانەش و هەروەها بەیەکبوونیان لەم نیشتمانە گەورەیەدا سەرەتاکانی شارستانیەتی یۆنانی سەری هەڵدا.

**دووەم: قۆناغی پەرەسەندن و دەرکەوتن (قۆناغی کلاسیکی Clissical):**

ئەم قۆناغە لە سەدەی شەشەم تا چارەکی کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاین دەست پێدەکات، کە خۆی لە پەرەسەندن و دەرکەوتن و پتەوبوونی بنەماکانی فیکری یۆنانیدا دەبینێتەوە، تیایدا زۆرێك لە گەورە هزرڤانان و فەیلەسوفانی شارستانیەتی یۆنانی لە بوارەکانی فەلسەفە و هونەر و شانۆ و مێژوو دەرکەوتن[2]، لەنێو شارەکانی شارستانیەتی یۆنانیشدا شارەدەوڵەتی (ئەسینا) ڕۆڵی پێشەنگی دەگێڕا، ئەمەش ڕەنگبێ لەبەر شوێنە ستراتیژیەکەی بێت کە بە دەرگای ڕۆژئاوا دادەنرێت و لێیەوە پەیوەندی بە شارەکانی ئاسیای بچووکەوە دەکرێت، هەروەها لە ساڵی(٣٩٠ – ٣٧٠ پ.ز) هەردوو شارە دەوڵەتی یۆنانی (ئەسپەرتا و ئەسینا) وازیان لە شەڕکردن هێناو پێکەوە هێزێکی تۆکمەیان پێکهێنا تا بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەخامەنشیەکان بە سەرکردایەتی (داریۆش) بەکاری بهێنن. پاش سەرکەوتنیان بەسەر فارسەکاندا ئیتر هێندەی تر ئەم شارەدەوڵەتە بەهێز بوو، هەرچی کەشتیگەلە گەورە سەربازییەکانی (ئەسینا) هەبوو بەکاریانهێنا بۆ مەبەستی بازرگانی و هەرەوەها (ئەسپەرتا)ش سەربازەکانی ئازاد کرد، لێرەشەوە ئیتر ئەم

---

(١) د. ممدوح درويش مصطفى و د.ابراهيم السايح: مقدمة في ترخ الحضارة الرومانية و اليونانية: المكتب الجامعي الحديث، الأزريطة – الاسكندرية، ١٩٩٨ – ١٩٩٩م، ج١، ص٨-١٣ " د. عادل نجم عبو و د.عبدالمنعم رشاد محمد: م.س، ص٢٩ – ٣١" History of Greece Bronze and Iron Age لە سایتی ئینتەرنێتی: H:\www.ahistoryofgreece.com.

(٢) د.أحمد محمود صبحي و د.صفاء عبدالسلام جعفر: في فلسفة الحضارة (اليونانية – الاسلامية – الغربية)، دارالوفاء لدنيا الطباعة والنشر، ط١، ٢٠٠٦م، ص٢٥.

شارستانیەتە هێندەی تر گەشایەوە[1]، لەبارەی ئەم شارەوە (ول دیورانت) دەڵێـت: ((ئەسینا ئەو دەرگایە بوو کە لێیـەوە یۆنانییـەکان دەگەیـشتنە شـارەکانی ئاسـیای بچووك، ئیتر ئەسینا بووە یەکێك لە شارە بازرگانییە گـەورەکان لـە جیهـانی کۆنـدا، پاشان هەر ئەم شارە بوو بە بازاڕێك و بەندەرێکی گەورە کە تیایدا تەواوی پیاوان لە ڕەگەز و بیروبۆچوونە جیاوازەکانی تیادا کۆدەبوونەوە، ئەم جیاوازی و پەیوەنـدی و پێشبڕکێیە بووە هۆی شیکردنەوەی فیکری ئەسینا، هەروەها بەشێوەی قۆناغبەندی ئەم بازرگانییە هەنگاوی ناو بەرەو زانست پەرەی سەند، هەروەها حساب لـە ڕێگـای پەیماننامە بازرگانییەکانەوە داهات، گەردووناسی لەڕێگای کەشـتیوانییەوە پـەرەی سـەند، زیـادبوونی سـامان و خۆشـگوزەرانی و ئـارامیش بـووە هـۆی پەرەسـەندنی فیکر))[2].

(تالێس(Talies) ٦٢٤ – ٥٢٦ پ.ز): بەدیارترین کەسی ناو ئەم شارسـتانیەتە دادەنرێت و زۆرجار بە یەکەم کەس دادەنرێـت کـە لـەم شارسـتانیەتەدا سـەرەتا بـە زانست و حیکمەتەوە خەریك بووبێ[3]، ئەم کەسایەتییە چـەندین جـار بـە مەبەسـتی بازرگانی کـردن سـەردانی (میـسر)ی کـردووە و لـەوێوە چـەند سـەرەتایەك لـەبارەی زانـستی ئەندازیاریـەوە فێربـووە و لەگـەڵ خۆیـدا هێناویەتیـەوە، هـەروەها لـە فینقیەکانیـشەوە فێـری هونـەری دەریـاوانی بـووە و ئەمـەش یارمـەتی داوە کـە گەردووناسـی فێـر ببێـت، لێـرەوە بـە سـوودوەرگرتن لـە خـشتەی گەردووناسـی بابلییەکان توانیویەتی پێشبینی ئـەوە بکـات لـە سـاڵی (٥٨٥ پ.ز) خـۆر دەگیرێـت،

(١) History of Greece The Golden Age of Greece لـە سـایتی: H:\www.ahistoryofgreece.com " فزدیـاکوف و س.کوفـالین: الحـضارات القدیـة، تر.نسیم و اکیم الیازجي، دار علاء الدین، دمشق، ط٢، ٢٠٠٦م، ج١، ص٣٢٠ – ٣٢٤.

(٢) قصة الفلسفة، تر. مکتبة المعارف، بیروت، ط٣، ١٩٧٥م، ص٥.

(٣) الشهرستاني: کتاب الملل و النحل، تح محمد فـتح الله بردرانـي، مکتبـة أنجلـو مـصریة، ط٢، (د.ت)، ج٢، ص٦٦.

بەمەش کاتێك دیاردەکە ڕوو دەدات ناوبانگێکی باشی پێ بەخشی[1]. بەم جۆرە ئەم بیریارە گەورەیە توانی لەم بوارانەدا پەرەی زیاتر بەخۆی بدات و دەرەنجام چەندین داهێنانی گەورەی بەرهەم هێنا.

هەروەها گەورە بیریارێکی تر (فیساگۆرس)ە (٥٧٢ – ٤٩٧ پ.ز) سەردانی میسری کردووە و لەوێ چاوی بە پیاوانی ئاینی کەوتووە و لێیانەوە سەرەتای زانستی بیرکاری فێربووە، پاشان سەردانی بابلی کردووە و ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە و توانیویەتی سوود لە زانیارییە بیرکارییەکانی ئەوانیش وەربگرێت، بەم جۆرەش ئەم کەسایەتییە توانی سەرەتایەك بۆ زانستی بیرکاری لە شارستانیەتی یۆنانی داڕێژێت و تەواو داهێنانکاریی تیادا بکات و پەرەی پێ بدات[2].

سەرباری ئەمانەش هەریەك لە (دیموکریتس Democrites ٤٧٧ – ٣٦١ پ.ز) و (ئەفلاتۆن Ephlaton ٤٢٧ – ٣٤٧ پ.ز) و (ئۆدۆکسیۆس Eudoxus ٤٠٨ – ٣٥٥ پ.ز)، توانیویانە سەردانی میسر بکەن و چەند سەرەتایەك لەبارەی زانستی ئەندازیاری بەتایبەتی ئەوەی کە میسر پێی گەیشتووە، سوودی لێوەربگرن و پاشان بۆخۆیان کۆمەڵێك داهێنەرکاریی تیادا بکەن[3].

---

(١) برتراند رسل: حكمة الغرب، تر. د.فؤادزكريا، سلسلة عالم المعرفة، ط١، ١٩٨٣، ج١، ص٢٩" وولتر ستيس: تاريخ الفلسفة اليونانية، تر. مجاهد عبدالمنعم مجاهد، دار الثقافة، القاهرة، ط٢، ١٩٨٤، ص٢٩ – ٣٠" يوسف كرم: تاريخ الفلسفة اليونانية، لجنة التاليف والترجمة و النشر، ١٩٣٦، ص١٢-١٤ " النشار: تاريخ الفلسفة اليونانية من منظور شرقي، دار أنباء للطباعة والنشر و التوزيع، القاهرة، ١٩٩٨م، ط١، ١٠١ – ١٠٢" علي عكاشة وآخرون: م.س، ص٢٧ " الجابري: الحوار الفلسفي بين حضارات الشرق القديمة و حضارة اليونان، دار الكتب الثقافي، الاردن، أربد، ط٢، ٢٠٠٥م، ص ١٩٦.

(٢) د. ياسين خليل: التراث العلمي العربي، دار أحياء التراث العلمي العربي، جامعة بغداد، ١٩٨١م، ج١، ص٣١ " د. عمر فروخ: تاريخ الفكر العربي الى أيام إبن خلدون، المكتب التجاري للطباعة والتوزيع والنشر، بيروت، ط١، ١٩٦٢ز، ص٣٦.

(٣) د. ياسين خليل: م.ن، ص٣١ " د.عمر فروخ: م.ن، ص٣٦.

له بـواری فەلـسەفەی سروشـتدا دیسان (تـاڵیس) دائـەنرێت بـە سـەرەتای ئـەو بیرمەندانەی کە گرنگییان بـە بـواری سروشـت داوە، ئەمـە سـەرباری (ئەنکـسماندەر Anaximander ٦١٠ – ٥٤٧ پ.ن)، و (ئەنەکـسیمانس Anaxmenes ٥٨٨ – ٥٢٤ پ.ن)، و (هێراکلیتس Heraclitus ٥٤٠ – ٤٧٥ پ.ن)، هەریەك لەمانە هـەوڵی داوە وەڵامی ئەو پرسیارەبداتەوە کە جیهان لە چی پێکهـاتووە[1]، دیـارە هەریەکـەو بەجۆرێ وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە (تاڵیس) دەڵێت: ((ئاو بنەچەی سـەرجەم شتەکانە)) بەجۆرێ کۆمەڵێ نموونە دەهێنێتەوە و پێی وایـە کـە مـرۆڤ و بـەرد و دار هـیچ جیاوازییـەك لـە نێوانیانـدا نییـە، بـەڵکو ڕێـژەی ئاوەکـە کـەمتر و زیـاترە[2]، ئەکسیمانس پێی وایە: ((ئەو هەوایەی دەوری زەوی داوە و جیهانیـشی هـەڵگرتووە، پاش چـڕبوونەوەی دەبێـت بـەئاو و ئـاویش پـاش چـڕبوونەوەی دەبێـت بـە خـۆڵ و لەوێـشەوە بـۆ بـەرد و بـەردی گـەورە))، هـەروەها (هێـراکلیتس) پێـی وایـە: ((ئـاگر بەوپێیەی کە بنەمایەکـە سـەرجەم شـتەکان دەچـێتەوە سـەری و سەرجەمیـشی بـۆ دەگەڕێتەوە و شتەکانیش لە گۆڕانی بەردەوامدان)). بەڵام (ئەکسیماندەر) بە یەکـەم کەس دادەنرێت لە قوتابخانەی سروشتی فەیلەسوفانی یەکەم کە سـەرجەم شـتەکان بۆ کۆتایی نەهاتوو بگێڕێتەوە لە ڕووی چەندێتی و چۆنێتییەوە[3].

ئەمــەی ســەرەوە وەك قوتابخانــەی یەکــەمی فەیلەســوفانی سروشــتی، بــەڵام قوتابخانەی سروشتی دووەم کە ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسوفانی لـەخۆ گرتـووە، لـە دیارترینیــان (ئــەمبادۆکلیس Embadocles ٤٩٠ – ٤٣٠ پ.ن)، و (دیمــوکریتس Democrites)، و (ئەنکـــــــــسالۆگیۆس Anaxologoes ٥٠٠ – ٤٢٨پ.ن)

---

(١) رسـل: م.س، ص٢٩ – ٣٢ " R.W.LIVINGSTONE: The Legacy Of Greece, Oxford At the Clarendon Press, 1962, Pp104-105.

(١) الشهرستاني: م.س، ج٢، ص٦٧.

(٣) رسل: م. س، ص٣٢ – ٣٥ " وولـتر ستيس: م. س، ل ٢٩ – ٣٥ " د.عـادل نجم عبـو و د. عبد المنعم رشاد محمد: م. س، ص٢٠٧ – ٢٠٩ " علي عكاشة و آخرون: م.س، ل ١٢٧" الجـابري: م. س، ص١٩٦ – ١٩٧.

بیروبۆچوونەکانیان لە بارەی سروشتەوە تەواو لە بیروبۆچوونی فەیلەسوفەکانی پێشووی خۆیان جیاواز بوو، ئەمان بە بەڵگەی وردەوە توانییان ئەوە بسەلمێنن کە جیهان هەرگیز لە یەك ماددە پێکنەهاتووە ،بەڵکو لە چوار مادەی سەرەکی پێك دێت کە ئەوانیش (ئاو و ئاگر و خۆڵ و هەوا)ن، هەریەك لەم مادانە نەگۆڕن و هیچ یەکێك لەمانە نابنە هۆی دروستبوونی مادەکانی تر[1].

(ئەمبادۆکلیس) پێی وابوو کە بنەماکانی جیهان لە چوار ڕەگەزی سەرەکی پێکدێت، ئەوانیش (ئاو و ئاگر و خۆڵ و هەوا)یە، ئەمانەش هەموویان سەرەتایین و هیچیان ناگۆڕدرێن بۆ هیچی تریان، بەڵام شتەکانی کە لەو چوار بابەتە پێکدێت بە پێی ڕێژەکانیان دەگۆڕدرێن[2].

(دیموکریت)یش گریمانەی سروشتی بەم جۆرە دەردەبڕی کە جیهان پێکدێت لەچەند یەکەیەکی کۆتایی نەهاتوو لە ژمارەدا و کە بەدەوری خۆیدا دەخولێنەوە و ئەمانەش بریتین لە چەند ئەتۆمێك (Atoms الذرات)، سەرجەم شتومەك و بابەتەکانی سروشت لە چەند بەشێك پێکدێن کە ناکرێت دابەش بکرین و ئەم بەشانەش پێیان دەگوترێت ئەتۆم، سەرجەمی ئەم ئەتۆمانە هاوشێوەی سروشتن و بەشێوەیەکی ڕێکخراو دەخولێنەوە. ئەم ئەتۆمانەش لە بۆشاییدا دەخولێنەوە، چونکە جووڵە بەبێ بوونی بۆشایی نابێت[3].

لە پاڵ ئەم جموجۆڵە فەلسەفییانە لە زانستی سروشتیدا، ڕووکردنە زانستی بیرکاری و برەودان پێی لە شارستانیەتی یۆنانیدا، لە سەردەستی فەیلەسوفی ناودار (فیساگۆرس Puthagoras)دا دەرکەوت، ئەم فەیلەسوفە گەورەیە سەرباری بیرکاری، لە بوارەکانی مۆسیقا و فیزیاشدا بە پێشەنگ دادەنرێت لە هەمانکاتدا، لە بەناوبانگترین بیردۆزەکانی پێی وایە کە بەڵگەی بیرکاری پێویستە بە گریمانەی

(١) د. عمر فروخ: م. س، ص٤٤-٤٨ " د.یاسین خلیل: م. س، ٣٢ – ٣٣.

(٢) النشار: تاریخ الفلسفة الیونانیة من منظور شرقي، ص٢٨٢ – ٢٨٩.

(٣) الشهرستاني: م. س، ج٢، ص١٠٧ - ١٠٨ " النشار: تاریخ الفلسفة الیونانیة من منظور شرقي، ص٣٠٢ - ٣٠٤" الجابري: م. س، ص٢٠٥ – ٢٠٦.

دەست پێبکات، (فیساگۆرس) کۆمەڵەیەکی ئاینی و زانستی پێکهێنا کە بە فیساگۆرسی ناسرابوون، هەوڵی ئەدا وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە کە پەیوەندییان بەجیهانی مادی و نەفسیەوە هەیە، هەروەها یەکەم کەسە کە وشەی (فەیلەسوف)ی بەکارهێنا کە مەبەست پێی خۆشەویستیی دانایی (حب الحكمة)بوو، هەوڵی ئەدا لە ڕێگای بنەماکانی ئەندازیارییەوە لە جیهان تێبگات[1]، بۆیە لە بەناوبانگترین پێشبینییەکانیدا دەڵێت: ((جیهان ژمارە و ئاوازە)) و ئەگەر ئەوەمان زانی کە زانستی بیرکاری لە ئەندازیاری و حساب و گەردوونناسی(فلك) و مۆسیقا پێکدێت، بەپێی بۆچوونی ئەو حساب بەستراوە بە ئەندازیارییەوە، چونکە ژمارە لەسەر بنەمای ئەندازیاری ڕیزکراوە، بۆیە خاڵێك نیشانەی یەك دەگەیەنێت و دوو خاڵ نیشانەی دوو و هەروەها ئەمە جگە لەوەی کە دوو خاڵ بە واتای هێڵێکی ڕێك دێت، و سێ خاڵ بە واتای خاڵی بەرامبەر یەك دێت و هەروەها چوار خاڵ بە واتای پەیکەر و قەبارەیەکی دیاریکراو دێت، بەم جۆرەش (فیساگۆرس) توانی یاسایەکی ئەندازیاری بۆ تێگەیشتنی جیهان دابنێت[2].

گرنگیپێدانی (فیساگۆرس) بە بیرکاری بوو بە پاڵپشتێ بۆی لە پتەوکردنی بۆچوونە سۆفیەکانیدا لە پاککردنەوەی نەفس و بەرزکردنەوەی بۆ سەرووی جیهانی هەستەکان، هەروەك چۆن گرنگیدانیشی بە بوارەکانی مۆسیقا و پزیشکی و گەردوونناسی هەر لە ڕێگای ڕووگە بیرکارییەکانیەوە بوو[3].

لەپاڵ لایەنی زانستی سروشتی و زانستی بیرکاریدا لە شارستانیەتی یۆنانیدا، سەرەتایەکی گرنگ دەبینین لە بارەی ئەوەی پێی دەگوترێت ئەودیوی سروشت (ماوراء الطبيعة) کە لەوێدا فەیلەسوفان دوو بنەمای لۆژیکی و بیرکاری لەیەك

---

(١) وولتر ستيس: م. س، ص٣٧ – ٤٤ " يوسف كرم: م. س، ص٢٣ – ٢٥ " الجابري: م. س، ص٢٠٠.

(٢) يوسف كرم: م. س، ص٢٧-٣١ " النشار: تاريخ الفلسفة اليونانية من منظور شرقي، ص١٦٥ - ١٧٠ " د. عمر فروخ: م. س، ل ٣٦ – ٣٨ " الشهرستاني: م. س، ج٢، ص٨١ - ٨٥.

(٣) د. ياسين خليل: م. س، ص٣٤.

دەدەن، لە سەرووی ئەو بیریارانەشی کە بەم بوارەوە خەریك بوون (پارمیندس Parmendes ٥٤٠ – ٤٥٠ پ.ن)، و (زینون ئیلیا Zenon of Elea ٤٩٠ – ٤٣٠ پ.ن) بوون، یەکەمیان جیاوازی دەکرد لە نێوان ڕاستی جێگیر و هەست پێکراودا، لە نێوان تاکانەیی و زۆریدا، پێی وابوو شتەکان لە عەقڵدا یەکێکن بەڵام لە هەستدا زۆرن، بەم جۆرەش بەڕوونی جیاوازی لە نێوان دووجۆر مەعریفەدا دەکرد، مەعریفەی عەقڵی و مەعریفەی هەستی، بەوەی کە یەکەمیان جێگیرە و گومانی تیادا نییە و دووەمیان گۆڕدراوە و گۆڕانکاریی دەکات و دەسەڵاتی بەسەر مەعریفەی عەقڵیدا هەیە هەروەها هەریەك لە مەعریفەی زاتی (خودی) و مەعریفەی گشتی بەشێوەی ناچوونیەك (تحکم) بەسەر مەعریفەی عەقڵیدا دەکەن، ئەمەش لەسەر بنەمای ڕاستی یەکانەیی (الحقیقة التوحیدیة) و بنەمای بەتاڵ کە لەنێوانیاندا ناچوونیەکی هەیە[1].

(زینون ئیللیا) بۆ بەرگری کردن لە ڕاستی جێگیر لە بیردۆزەکانیدا پشتی بە مەعریفەی بیرکاری دەبەست، پێی وابوو زۆری جووڵە و بەرگری و هاوجێگیر بوون، چەند بەڵگەیەکن لەوبارەیەوە کە گومانی تێدا نییە[2]، فەلسەفەکانی (بارمنیدس و زینون ئیللیا و لەپێش ئەمانیش فیساگۆرس) بەو پرەنسیپە لۆژیکی و بیرکارییانەی کە تیایاندابوو، لەگەڵ فەلسەفەی (فیساگۆرس) بەتایبەتی بەو لێکدانەوانەی کە بۆ بیرکاری کردی و هەوڵەکانی قوتابخانەی سروشتی بۆ تێگەیشتن لە جیهانی دەرەوە، بوونە هۆی کردنەوەی ڕێگایەك لەبەردەم فەلسەفەی (ئەفلاتۆن)دا کە لێکدانەوەی

---

(١) النشار: تاریخ الفلسفة الیونانیة، ص١٩٤ – ١٩٥ " یوسف کرم: م. س، ص٣٧-٣٩ " وولترستیس: م. س، ص٤٧ – ٥٤، ٥٤-٦٠.

(٢) النشار: م. س، ص١٩٤ – ١٩٥ " یوسف کرم: م. س، ص٣٧-٣٩ " وولترستیس: م. س، ص٤٧ – ٥٤، ٥٤-٦٠.

زانستی بیرکاری و یەکانەی ڕاستییەکانی جیهانی بەکاردەهێنا بۆ تێگەیشتن لەوەی کە چی ڕوودەدات لە سرووشت و گەردووندا بە گشتی[1].

(ئەفلاتۆن Platon ٤٢٧ – ٣٤٧ پ.ز) ئەکادیمیای زانستی دروستکرد، کە تیایدا گرنگی بەسەرجەم لقەکانی مەعریفە دەدا، لە بیرکاری و گەردوونناسی و مۆسیقا و سیاسەت و شتی تریش، ئەفلاتۆن لەو ئەکادیمیەدا بە سەرۆکی ژمارەیەك لە فەیلەسوفان و زانایان ناسرابوو، کە بەتایبەتی گرنگییان بە بیرکاری دەدا، (ئیۆدۆکسیۆس Eudoxus ٤٠٦ –٣٥٦ پ.ز) یەکێك بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی (ئەفلاتۆن) و ماوەیەکی زۆر لەگەڵیدا بووە، بەیەکەوە سەردانی میسریان کردووە و بۆ تێگەیشتن لە زانستی بیرکاری لای میسرییەکان، سەرباری ئەوەی کە (ئەفلاتۆن) لەچاو پێشینەکانیدا هیچ شتێکی نوێی لە بواری زانستی بیرکاریدا دانەهێناوە، بەڵام بەهۆی گرنیگیدانە زۆرەکانی بەبیرکاری و خەریکبوونی پێیەوە، توانی کەشێکی بیرکارییانە لە ئەکادیمییەکەیدا درووست بکات، ڕەنگبێ ئەو زاراوە بەناوبانگەی کە لەسەر دەرگای ئەکادیمیەکەی هەڵکەندرابوو ((تۆ ناتوانیت بچیتە ژوورەوە هەتا زانستی بیرکاری نەزانیت)) باشترین بەڵگەی گرنگیدانی (ئەفلاتۆن)بێت بە بیرکاری[2].

(ئەفلاتۆن) شێوازی پەیڤین و گفتوگۆی فەلسەفی داهێنا لە دەرخستن و خستنەڕووی بیروبۆچوونەکانیدا و بەرگری لێکردنی، ئەوەی جێگای باسە (ئەفلاتۆن) یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی زۆرێك لە نووسراو و بەرهەمە فەلسەفییەکانی وەك خۆی مانەوە ئەمەش بە جیاوازی لە تەواوی بیریار و فەیلەسوفانی پێشینی خۆی، ڕەنگە ئەمەش بۆ ئەو گرنگیدانە زۆرە بگەڕێتەوە کە لەلایەن قوتابخانە فەلسەفییەکانی

---

(١) د. جابر الشكري: تاريخ العلم اليوناني، مطبعة جامعة بغداد، ط١، ١٩٨٤، ص٨٢ " R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.P59.

(٢) د. محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية، عويدات للنشر والطباعة، بيروت - لبنان، ج١، ص١١٤ " د. عادل نجم عبو و د.عبدالمنعم رشاد محمد: م. س، ص٢١٢ – ٢١٤.

ڕۆژهەڵاتەوە لە سەردەمی هیلنستی پێی درا، کە هەندێکیان بە (أفلوطين* الشرق) ناسراون لە مێژوودا و پاشان لەلایەن زانایان و بیریارانی مسوڵمانەوە لە شارستانیەتی ئیسلامیی بە دانراو و بیرەکانی درا[1].

(ئەفلاتۆن) زۆر بە ڕوونی هەستی بە پرەنسیپی هۆکاربەندی (السببية)دەکرد لە سرووشتدا، ئەو وای دەبینی هەرچی ڕووداو و دیاردەیەك لە سروشتدا ڕوودەدات، پێویستی بەوە هەیە کە هۆکار (علة)یەکی هەبێت بۆ ڕوودانی، هەرگیز لە جیهانی ماددیدا جووڵەکان لە خۆوە و بە شێوەی (عشوائي) نییە، بەڵکو ئەمانە لە دەرەنجامی یەکانەی دەرەکی و ڕێکوپێکی دیاردەکانییەوە ڕوودەدات، لەبەرئەوەی لەویٚ لە (علة)یەکی ژێرەوە دەردەکەوێت، شتەکان لە جیهانی دەرەکیدا دەکەوێتەبەر بەدواداهاتن و ناتوانین جیهان بە پەشێوی وێنا بکەین، مەگەر ئەوکاتەی کە بۆچوونمان وابوو کە ئەو شتە لە شوێنێکی ناژێرەوە دەرچووە[2].

(ئەفلاتۆن) هەمان ئەو ڕێگا فەلسەفیەی (فیساگۆرس)ی گرتەبەر بۆ تێگەیشتن لە گەردوون و (ئاو و هەوا و ئاگر و خۆڵ) بە ڕەگەزە سەرەکییەکانی دروست بوونی جیهان دەزانی، هەروەها وای دەبینی کە ئەم ڕەگەزانە هەموویان لەسەر بنەمایەکی ئەندازیاری دانراون و بەم شێوەیەش لە ڕوانگەی عەقڵی و ئەندازیارییەوە دەیڕوانییە جیهان، لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو وێنا ئەندازەییەدا بۆ جیهان، سێگۆشەی بە بنەمای سەرەکی دروستکردنی ئەندازیاری بۆ چوار ڕەگەزەکە دانا، لەم دەرەنجامەوە وای بۆ دەچوو کە هەریەکە لە ڕەگەزەکان بەم جۆرە ئەندازەییە

---

* ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە لە ڕۆژهەلاتدا کە ناوی (أفلوطين Plotinos)، ئەم کەسایەتییە لە میسر لەدایك بووە و لە ئەسکەندەریە خوێندوویەتی و زۆر کاریگەر بووە بە ئەفلاتۆن و بیرەکانی برەو پێداوە و بلاوی کردۆتەوە. بڕوانە: المنجد في اللغة والأعلام، ط٣٩، ٢٠٠٢، ص٥٨.

(١) د. أحمد محمود صبحي و د. صفاء عبدالسلام جعفر: م. س، ص٣٣ – ٣٤ " د. محمد عبدالرحمن مرحبا: م. س، ص١١٥.

(٢) د. ياسين خليل: م. س، ص٣٥.

ڕێکخراون: ئاگر لە چوار پەیکەری شێوە هەرمی پێکهاتووە کە چوار ڕووگەی هەیە و هەواش لە دوو پەیکەر پێکهاتووە کە هەر پەیکەرێکیان هەشت ڕووگەی هەیە، و ئاو لەدوو پەیکەر و بۆ هەر پەیکەرێکیان بیست ڕووگەی هەیە و هەروەها خۆڵ لە دوو پەیکەری شەش پاڵوو(مكعب) پێك هاتووە[1].

شیکارەکانی (ئەفلاتۆن) بۆ جیهانی بیرکاری و بنەماکانی لە بەڵگەی زانستیدا وای لێکرد بڵێت: جیهانی هەستەکان ناکرێت بکرێتە بنەمایەك بۆ ڕاستی، چونکە ڕاستی جێگیرە و هەتاهەتاییە، بەڵام هەستەکان گۆڕدراو و ناجێگیرن و هەروەها ئەو بنەمایانەشی لێوەی دەردەچێت نا چوونیەکە، بەڵام تاڕادەیەك باوەڕی بە بیرکاری هەبوو، چونکە بیرکاری بە بنەمایەك دەست پێدەکات و بەشیکار و لێکدانەوەش بابەتی تر دێنێتە بوون و دووریشە لە ناچوونیەکی[2].

(ئەفلاتۆن) زیاتر جەختی لەسەر پێناسەی زاراوە سەرەکییە بەکار هاتووەکان دەکرد لە زانست و مەعریفە جیاوازەکاندا، بۆیە چەندین زاراوەی لەلا دەرکەوتن لەوانە لەبواری زانستی بیرکاری و زاراوەکانی ئەندازیاری و هەروەها حساب دەرکەوتن، وەك خاڵ و هێڵ و سێگۆشە و چوارگۆشە و ژمارەی دووانی[3]، لە بواری زانستەکانی ئەخلاق و جوانیدا زاراوەکانی تری وەك (فچیلە و ڕاستی و دادپەروەری و ناشرینی و جوانی) دەرکەوتن، هەروەها لە بواری مەعریفەی گشتیدا چەند زاراوەیەکی تری وەك (بابەت و دیاردە و مەعریفە و زانست...هتد) دەرکەوتن[4].

لە پاش (ئەفلاتۆن) (ئەرستۆ Aristote ٣٨٤ – ٣٢٢ پ.ز) دەرکەوت کە لە بواری لێکۆڵینەوەی سروشتدا لەگۆشەنیگای بیرکارییەوە تەواو پێچەوانەی (ئەفلاتۆن)ی مامۆستای بووە و ڕووی کردە لێکۆڵینەوەی جووڵە و دیاردە

---

(١) د. عمر فروخ: م. س، ص٥٨ – ٥٩.

(٢) د. محمد عبدالرحمن مرحبا: م. س، ص١٢٢ - ١٢٥" د.مصطفى النشار: مدخل لقراءة الفكر الفلسفي عند اليونان، دار أنباء للطباعة والنشر و التوزيع، القاهرة، ١٩٩٨، ص٨٨ – ٩٣.

(٣) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp11.

(٤) الجابري: م. س، ص٢١٦ - ٢١٧.

سروشتییەکان، ئەوەی لە وێنای خۆیدا دانا کە دەکرێت لە ڕێگای عەقڵەوە لە جیهان بگەین، ئەمەش لەسەر بنەمای تێبینی و وردبوونـەوە ڕۆژانەییەکانمانـەوە دەبێـت[1]، بەڵام لـە بـواری ڕێکخراوەیـی شـتەکان لـە سروشـتدا هـاوڕابوو لەگـەڵ (ئـەفلاتۆن)ی مامۆستای و پێی وابوو سروشت ڕێکخراوە و شتەکان و ڕووداو و دیاردەکـان هـەرگیز بـەو شـێوەیە دەرناکـەون کـە ئێمـە لەسـەری ڕێککـەوتووین، بـەڵکو بـەپێی بنـەمای (السببیة) هۆکاربەندییە کـە شـتەکان ڕێـك دەخـرێن، هـەموو ڕووداوێکـیش پێویـستە (علة)یەکی هەبێت، هەروەها تیۆری (المثل) (نموونە) هێنانەوەی داهێنا کـە دەکرێـت لە ڕێگایەوە بگەینە ڕاستییەکان، لەسەر ئەو بنەمایەشی کە زانست گرنگی دەدات بە دۆزینەوەی پرەنسیپە جێگیرەکان، دەسـتی کـرد بـە لێکۆڵینـەوە لـە بەدواداگـەڕانی (علة)کاندا لە دیاردە سرووشتییەکانی جیهان[2].

(ئەرستۆ) چەندین بەرهەمی لە بوارەکانی فەلسەفەی سروشتی و منگق (لۆژیـك) و میتافزیکی و ئەخلاق و سیاسەت و زانستی ژیان و (بایۆلۆجی) نووسیوە[3].

لە بیردۆزەکانیدا جیاوازی دەکرد لە نێوان بابـەتی زانـستی سروشـتی و زانـستی بیرکاریدا، هەروەك ئاماژەمان پێدا هێڵێکـی جیاکـەرەوەی لـە نێوانیانـدا دادەنـا، لـە هەوڵـە شـیکارییەکانیدا لـە بـواری ئەندازیاریـدا تـوانی کۆمـەڵێك لـە یاسـای لـۆژیکی دابنێت، لە دیارترین جێماوە لۆژیکییەکانیشی کتێبی (Organon)ە ئۆرگانۆن، کـە ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە مێژووی فەلسەفە و زانستدا، لە دیارترین داهێنراوەکانیـشی

---

(١) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp137 – 14 " د. کامـل محمـود: دراسـات في تـاريخ الفلـسفة العربيـة، دار الفكـر اللبنـاني، ط١، ١٩٩٠م، ص٤٦ – ٤٩ " محمـد الخطيب: الفكر الأغريقي، دار علاء الدين، ط٢، ٢٠٠٧م، ص١٩٨ - ٢٠٢.

(٢) النشار: مدخل لقراءة الفكر الفلسفي عند اليونان، ص١٠٥، ١١٤ – ١٢٠، يوسـف كـرم: م. س، ص١٧٥ – ١٩٠ " الجابري: م. س، ص٢٢.

(٣) بـۆ زیـاتر شـارەزابوون لـەبارەی کتێبەکانیـەوە، بڕوانـە: د.حـسين الـشيخ: م. س، ص٢١١ " د.كامـل محمـود: م. س، ص٤٥ – ٤٦ " د. محمـد فتحـي عبـدالله: مترجمـو و شـراح أرسـطو عـبر العصور، (د.ت)، (د.م)، ص٥ – " يوسف كرم: م. س، ص١٤٣ – ١٤٨ ١٤.

تیۆری (Syllgism) قیاس بوو، ئەم تیۆرییە دەڵێت: زانستی بەڵگەیی بۆ شتەکان پێك دێت لە پێشەکی و دوو دەرەنجام، قیاسیش وتەیەکە، کە لە دوو پێشەکی پێکدێت، بەڵام خۆی دەرەنجامێکی ڕاستی بەدوادادێت، هەروەها زانست لای ئەرستۆ بریتییە لە زانستی بەڵگەیی نموونەیی، بەڵام پێی وایە ئەگەر کۆمەڵە بابەتێکمان هەبوو ڕاستی بە بەڵگەوە نەدەسەلماند ئەو کات پێویستمان بە (Theorems مبرهنات) گریمانەکاری هەیە[(١)].

بەم جۆرەش ئەرستۆ توانی (گەنجینەیەك)ی بەنرخ و گەورە لە فەلسەفەی زانستی بۆ مرۆڤایەتی بەجێ بهێڵێت، کە سەرجەم بوارەکانی سروشت و گەردووناسی و ئاژەڵ و فەلسەفە و بیرکاری و هونەر و هونەری وتارخوێندن (الخطابة) و هۆنراوەی دەگرێتەوە، سەرباری ئەوەی کە ئەرستۆ بەدامەزرێنەری زانستی لۆژیك دادەنرێت، هەروەك چۆن چەندین جێماوی تری لە بوارەکانی (سروشت و گەردوون و ئاسمان....هتد)دا کە ئەم جێماوانە بۆ ماوەیەکی یەکجار زۆر بوونە پێشەنگی لێکۆڵینەوە زانستی و گەردووناسییەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا[(٢)].

هەروەها سەرجەمی ئەم زانستە بەدەستهاتوو و داهێنراوانەی لەو قوتابخانەیەدا پەرەیپێدا کە دایمەزراند بە ناوی (لوکیونیون Lyceunn)، لە پاش (ئەرستۆ) لە قوتابخانەکەیدا هەریەك لە فەیلەسوفان (سیوفراستوس Theophrasrus ٣٧٢-٢٨٧ پ.ز) و (ستراتۆ Strato) جێگای گرتەوە و لەسەر هەمان زانستەکانی ئەرستۆ و پێشنیارەکانی دەڕۆیشتن، لە دوای ئەمانەوە ئیتر لەم قوتابخانەیەدا هیچ باسێك نامێنێت و بەم جۆرەش لەم قوتابخانەیەداو لەم قۆناغەدا ئەستێرەی زانستی

---

(١) حنا الفاخوري و خليل الجر: تاريخ الفلسفة العربية، دار الجبيل، بيروت، ط٣، ١٩٩٣، ج١، ص٨٠ – ٨٤ " محمد الخطيب: الفكر الاغريقي، ص٢٢٤ – ٢٢٦ " يوسف كرم: م. س، ص١٥٠ – ١٦٨.

(٢) R.W.LIVINGSTONE, OP.CIT. Pp160 – 162.

شارستانیەتی یۆنانی کۆتایی پێدێت و تا لە لایەکی تر و لە سەردەمی هیلنستیدا لە ئەسکەندەریە سەرهەڵدەداتەوە[1].

لە بواری زانستی پزیشکیدا لە شارستانیەتی یۆنانیدا، گریکەکان گەورەترین پشکیان بەردەکەوێت لە بەرەوپێشبردنی ئەم زانستەدا، بە جۆرێ کە پزیشکییان لە پیشەوە بەرەو زانستێکی عەقڵی برد و ڕێگای چارەسەری نوێیان لە ڕێگای (گژوگیا) و ڕووەك و هەروەها نەشتەرگەرییەوە داهێنا، سەرەتای پزیشکی یۆنانی لەوەوە دەستی پێکرد کە هەوڵیان ئەدا چارەسەری نەخۆشییەکان بەڕەگی ڕووەك و هەروەها گژوگیا بکەن، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە چەندین لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەیان لەسەر ڕووەکەکان کردووە تا بزانن چەندە ئەم ڕووەکانە سوودبەخشن بۆ نەخۆشییەکان، لەپێش ئەماندا (پزیشکی) پەیوەندی پتەوی بە پەرستگاکانەوە هەبوو، ئەوانیش چارەسەری نەخۆشیان بە دوو ڕێگا دەکرد، یان لەڕێگای خورافات بە کاریگەری لەسەر دەروونی نەخۆشەکە، یان لە ڕێگای هەندێ دەرمانەوە کە لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بوو، گریکەکان توانییان سوود لەم ڕێگا سەرەتاییە وەربگرن، ئەویش پاش لابردنی خورافات لێی بۆ چارەسەری پزیشکیی دەروونی. بەتایبەتی بۆ چارەسەری هەڵچوونی دەروونی، هەروەك بۆ ئەم نەخۆشییە مۆسیقاشیان بەکاردەهێنا، چونکە هەستیان بە پەیوەندیی مۆسیقا و کاریگەرییەکانی کردبوو لە چارەسەرەکەدا [2].

لەپاش ئەمە ئیدی بەرەبەرە لەم شارستانیەتەدا لێکۆڵینەوە پزیشکییەکان پەرەسەندنی گەورەی بەخۆیەوە بینی، کاتێك پزیشکی پێشکەوت بۆ نەشتەرگەری و لێکۆڵینەوەکان هەنگاوی نا بەرەو زانینی هۆکاری نەخۆشییەکان، هەروەها کاتێك زانستی پزیشکی لەم شارستانیەتەدا گەیشتە ترۆپك کە گەیشتە دوورگەی (کۆس [*])

(١) د. محمد فتحي عبدالله، م. س، ص١٩ – ٢٢" د. ياسين خليل: م. س، ص٣٨.

(٢) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp201 – 207.

* کوس: دوورگەیەکە دەکەوێتە سەر دەریای ئیجە، نزیك کەنارەکانی ئاسیای بچووك سەر بە یۆنانە. الشكري: م. س، ص٦٠.

چونکە لەوێدا قوتابخانەیەکی پزیشکی دامەزراو لەناو ئەم قوتابخانەیەشدا یەکێك لە گەورەترین پزیشکانی شارستانیەتی یۆنانی دەرکەوت کە هەپوکرات (أبقراط Hippocrates ٤٦٠ – ٣٧٥ پ.ز) بوو، ئەم فەیلەسوف و زانا گەورەیە بە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەکانی، زانستی پزیشکی جۆراوجۆر و گشتگیر کرد و هەنگاوی زۆر گەورەی هەڵهێنا، بە جۆرێ کە ئەم زانستە لە شارستانیەتی یۆنانی بەناوی (أبقراط) ناسراوە[1]، (أبقراط) پشتی بە عەقڵ دەبەست، بۆ چارەسەرکردنی کێشە پزیشکییەکان ڕێگای زانستی و شیکاری دەگرتەبەر بۆ زانینی وەسفی حاڵەتی نەخۆشییەکە بەوردی و پاشان حوکمی بەسەردا دەدا، سەرباری ئەمانە ئەم کەسایەتییە پێشەنگی ڕاستگۆیی بووەو پابەند بووە بە پشتبەستن بە ڕاستییەکانەوە لەچارەسەرکردنداو بە تەواوی ڕەتی خورافاتی کردووەتەوە[2].

لە تێبینییە وردەکانی بۆ نەخۆشییەکان گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە پێی وابێت پەیوەندی بەهێز هەیە لە نێوان حاڵەتی دەروونیی نەخۆشەکە و چاکبوونەوەی پارچەکانی جەستەیدا، بۆیە هەمووکات جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە زۆر گرنگی بە لایەنی هاندانی نەخۆش بدرێت کە ئارام و لەسەرخۆ بێت، هەروەها ئەمەلی بۆ دروست بکرێت، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەرمانەکان کاریگەری بەهێزیان لەسەر چارەسەری نەخۆشەکە هەبێت. بۆیە پێویستە هاوسەنگی لە نێوان دەروون و جەستەدا ڕابگیرێ، چونکە کاریگەرییان لەسەر یەکتر یەکجار زۆرە، ئەم کاریگەرییە بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە[3].

هەروەها (أبقراط) هەستی بەوە کردبوو کە پەیوەندی بەهێز هەیە لەنێوان کەش و هەواو تەندروستیی مرۆڤدا، سروشتی زەوی و هەواکەی وا هەڵکەوتووە کە کاریگەریی بەهێزی هەیە لەسەر تەندرووستی مرۆڤ و لە چارەسەرکردنی

---

(١) الشهرستاني: م. س، ص ١١٧– ١٢٠ " الشكري، م. س، ص٦٣-٦٤ " د. ياسين خليل: م. س، ص٣٩.

(٢) د. جبار شكري: م. س، ص٣٩ " د. ياسين خليل: م. س، ص٦٣-٦٤.

(٣) R.W.LIVINGSTONE, OP .CIT. Pp225 – 229

نەخۆشییەکانیدا، هەروەها لە تێبینییەکانیدا جەختی لە چۆنیەتی خواردنەکان و ڕێکخستنیان و هەروەها چۆنیەتی ئەنجامدانی وەرزش و کاریگەری لەسەر لاشەی مرۆڤ بە پێویست دەزانی[1]، هەروەها چەندین داهێنراوی گرنگی پزیشکی تر، سەرباری ئەمانە بۆ نەخۆشەکانی (پاڵفتەی جۆ) و (ئاوی جۆ)ی بەکاردەهێنا، سەرباری ئەمانە (هەنگوین و ئاوی تێکەڵ دەکرد)، (هەنگوینی لەگەڵ سرکەدا تێکەڵ دەکرد)، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکان بەکاریدەهێنا، هەروەك لە چارەسەرەکانیدا شێوازی نەشتەرگەری و دەرزی لێدان و چەندین بابەتی تری بۆ چارسەر دۆزییەوە[2].

لە شارستانیەتی ئیسلامیدا زانایانی مسوڵمان هەر لە زووەوە گرنگی (أبقراط)یان بۆ دەرکەوتووە، زۆرێك لە مێژوونووسانی (السير) بە گرنگییەوە باسیان کردووە و کاریگەرییەکەیان لە سەر لایەنی پزیشکی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا باس کردووە. لەم بارەیەوە (اليعقوبي)وەك نزیکترین مێژوونووسانی ئەو ماوەیەی ئێمە لێکۆڵینەوەکەی تێدا ئەنجام دەدەین، دەڵێت: ((ابقراط بن مقلدس بن ابقراط یەکێکە لە دیارترین فەیلەسوفان لە بواری پیشەی پزیشکیدا، بە فەلسەفەی خۆی لەو بوارەدا توانی پێشەنگی سەرجەم حەکیمان بێت و بە جۆرێ کە بۆ وەرگرتنی زانیاری دەگەڕێنەوە سەری، چەندین کتێبی هەیە لەوانە: كتاب الفصول، كتاب البلدان، المياه و الأهوية، كتاب ماء الشعير، كتاب تقدمة المعرفة، كتاب الجنين و كتاب الأركان، كتاب الغذاء، كتاب الأسابيع، كتاب أوجاع النساء، كتاب ابيذيميا، ئەمانە لە بەناوبانگترین کتێبەکانیەتی و لە داوی ئەمانەش چەندین کتێبی تری هەیە، ئەو کتێبانەی بەتایبەتی پێویستن بۆ خەریکبووانی بواری پزیشکی و دەبێت بیخوێننەوە چوار کتێبن، ئەوانیش كتاب الفصول وكتاب تقدمة المعرفة وكتاب الأهوية والأزمنة وكتاب ماء الشعير))[3].

---

(١) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp230 – 234

(٢) د. ياسين خليل: م. س، ص٣٩.

(٣) تاريخ اليعقوبي، ج١، ص٦٥-٦٦.

(ابـن أبـي اصـيبعة) دەڵێـت: ((ابقـراط یەکـەم کەسـە لـەبارەی پیـشەسازی پزیشکییەوە دانراوی هەبێت و لەم بوارەشدا دیـارترین و بەناوبانگترینیانـە، شـێوازی لە بواری دانانی کتێبدا سێ ڕێگا بووە لە ڕێگاکانی فێربوون، بریتیبـوون لـە شـێوازی نادیار و شێوازی مەبەستدار (ئامانج) و سێیەم لەسەر شـێوازی ڕوون بـوون و ئاسـان کاری کە هـەموو کەسـێك تێـی بگـات، ئـەوەی کۆتـایی پـێ دەهێـنین لـە باسـکردنی کتێبەکانی (ابقراط) و بەڕاستی ئەزانین، سی کتێبن، بەڵام ئەوانەی بە بواری پیـشەی پزیشکییەوە خەریکن گەر بیانەوێت لەسەر شـێوازێکی ڕاسـت و بـاش دیراسـەکانیان ئەنجام بدەن، زیاتر دوازدە کتێبی بەکاردەهێنن کە ئەمانە بەناوبانگترینیانە: یەکـەم کتێبی (الأجنة) لە سێ بەش پێکهاتووە،.... دووەم: کتێبی (طبيعة الانسان) لـە دوو بـەش پێکهـاتووە.... سـێیەم: کتێبـی (الأهويـة والميـاه والبلـدان) لـە سـێ بـەش پێکهـــاتووە،...... چـــوارەم: کتێبـــی (الفـــصول) لـــە حـــەوت بـــەش پێکهـاتووە،......پێنجـەم: کتێبـی (تقدمـة المعرفـة) لـە سـێ بـەش پێکهـاتووە،.... شەشەم: کتێبی (الأمراض الحـادة) لـە سـێ بـەش پێکهـاتووە،.... حەوتـەم: کتێبـی (أوجاع النساء) لە دوو بەش پێکهاتووە،..... هەشتەم: کتێبی (الأمراض الوافدة) کە بە (أبيديما) ناسراو لە حەوت بەش پێکهاتووە،..... نۆیەم: کتێبی (الأخلاط) لە سێ بـەش پێکهـاتووە،.... دەیـەم: کتێبـی (الغـذاء) لەچـوار بـەش پێکهـاتووە، .... یانزەیەم: کتێبی (قاطيطرون)ین کۆگای پزیشك کـە لـە سـێ بـەش پێکهـاتووە، .... دوانزدەیەم: کتێبی (الكسر والجبر) لـە سـێ بـەش پێکهـاتووە، سـەرباری ئەمانـەش چەندین کتێبی تر هەن کە بۆ ئەمی دەگێڕنەوە))[1].

بەم جۆرە دەبینین زانایان و پزیـشکانی نـاو شارسـتانیەتی ئیـسلامیی لـەڕێگای وەرگێڕانی کتێبەکانی (أبقراط) توانییان لایەنی پزیشکی خۆیان بە جـۆرێکی یـەکجار گەورە بەرەوپێش بەرن و بە پشتبەستن بە ئەزموون و داهێنراوە زانـستییەکانی ئـەم

(١) عيون الأنباء، تح: د.نزار رضا، دار مكتبة الحياة، بيروت، (د.ت)، ص٥٣ – ٥٤.

فەیلەسوفە و فەیلەسوفانی تری دوای ئەمیش لە سەردەمی هیلنستی بناغەی ڕابوونی زانستی پزیشکی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا دابنێن.

**سێیەم: لاوازبوون و داڕمان (قۆناغی هیلنستی Hellenistic Period):**

ئەم قۆناغە بە دوا قۆناغی شارستانیەتی یۆنانی دادەنرێت، کە زیاتر بەو بزووتنەوە ڕۆشنبیری و زانستییانە دەگوترێت کە لە سەرەتای هێرشی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) بۆسەر ڕۆژهەڵات دەست پێدەکات لە ٣٣٦ پ.ز و بە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی (ئۆگستۆس) لە ساڵی ٣٠پ.ز کۆتایی پێدێت، کاتێك سەرجەم ناوچە یۆنانییەکان دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی و لەپاش ئەمە ئیدی ئەم شارستانیەتە بەشارستانیەتی ڕۆمانی دەناسرێت تاکاتی هاتنی فتوحاتی ئیسلامیی(1).

(ئەسکەندەری مەکدۆنی ٣٥٦ – ٣٢٤ پ.ز)، لە هێرشە گەورەکەیدا بەرەو ڕۆژهەڵات تا کەناری ڕووباری سند توانی ئیمپڕاتۆرییەتێکی فراوان و پان و بەرین دروست بکات کە ناوچەکانی میسر و فارس بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەم هێرشە بووە هۆی ئەوەی قۆناغێکی نوێ لە بوژاندنەوەی شارستانیەتی یۆنانی دەست پێبکات، بەڵام لە دەرەوەی وڵاتی یۆنان، کە تیایدا (ئەسکەندەر) هەوڵی دەدا شارستانیەتی یۆنانی بەشارستانیەتی ڕۆژهەڵات تێکەڵ بکات و شارستانیەتی یۆنانی تیادا بڵاو بکاتەوە، بۆیە لەوناوچانەی کە پیایدا تێدەپەڕی لە ڕۆژهەڵات، هەوڵی دەدا چەندین شاری یۆنانی بەناوی خۆیەوە درووست بکات، لەوانەش ئەسکەندەرییە لە (میسر و لە دۆڵی فورات و لە ئەوپەڕی باکووری تورکستان و لەسەر کەناری ڕووباری سند و لەسەر کەنارەکانی کەنداوی فارس)، هەریەك لەم شارانەش بەهۆی ئەو داگیرگانەی کە تیایدا بوو لە دانیشتوانی یۆنانی بوونە ناوەندی

---

(١) د. أحمد محمود صبحي و د. صفاء عبالسلام جعفر: م. س، ص ٣٦ – ٣٧ " د. حسين الشيخ: العصر الهللينستي، دار المعرفة الجامعة، ١٩٩٣، ص٣-٧.

بڵاوبوونەوەی شارستانیەتی یۆنانی[1]، لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لەپاش مردنی (ئەسکەندەر)یش گواستنەوەی زانست و شارستانیەتی یۆنانی بۆ رۆژهەڵات هەر بەردەوام بوو، چونکە سەرباری ئەم داگیرکارییانە بۆ رۆژهەڵات رێگای تریش هەبوون بۆ بڵاوبوونەوەی شارستانیەتی یۆنانی لە رۆژهەڵاتدا لە دیارترینیان کۆچی بیریاران و فەیلەسوفانی یۆنانی بوو بۆ رۆژهەڵات بەهۆی بارودۆخی نالەباری وڵاتەکانیانەوە، بەتایبەتی پاش داگیرکاری رۆمانەکان بۆیان. ئەم فەیلەسوف و بیریارانە توانییان قوتابخانەی زانستی لە چەند ناوچەیەکی رۆژهەڵات دابمەزرێنن و بەجۆرێ بیکەنە ناوەندی بڵاوکردنەوە و پەرەپێدانی شارستانیەتی یۆنانی لە رۆژهەڵاتدا، جگە لەمانەش وەرگێڕانی بابەتە زانستییەکانی ئەم شارستانیەتە لە یۆنانییەوە بۆ زمانەکانی تری رۆژهەڵات لە سریانی و لاتینی، یەکێکی تر بوو لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی ئەم شاستانیەتە لە رۆژهەڵاتدا، لێرەوە چەندین ناوەندی شارستانیەتی یۆنانی لە رۆژهەڵاتدا دروست بوو لە دیارترینیان (ئەسکەندەریە و ئەنتاکیە و حەران و روها (أورفة) و نصیبین و جوندیساپور و...هتد) هەروەك لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەماندا، لەم بابەتە دەدوێین[2].

ئەسکەندەریە بەتایبەتی لە سەردەمی (بطلیموس سوتیر Ptalemmy Soter ٣٦٠ – ٢٨٣پ.ز)، کە یەکێك بوو لەو چوار سەرکردەیەی ئەسکەندەر کە دەسەڵاتەکەیان پاش نەمانی دابەش کرد، ئەم میسری بەرکەوت و (ئەسکەندەریە)ی کردە ناوەندی دەسەڵاتی خۆی، هەروەها هەوڵێکی یەکجار زۆری دا تا ئەم شارە بکاتە ناوەندی رۆشنبیری و زانستی لە شارستانیەتی یۆنانی، تیایدا قوتابخانە و کتێبخانەیەکی گەورەی درووستکرد و بەجۆرێ کە زۆر لە قوتابخانەکانی هەریەك لە (ئەکادیمیای ئەفلاتۆن و لوکییونی ئەرستۆ) پێشکەوتوتر بوو، سەرباری ئەوەی لە

(١) د. حسين الشيخ: م. س، ص٤٤ – ٥٧ " محمود فهمي: تاريخ اليونان، مطبعة ومكتبة الغد، الجيزة، مصر، ط١٩٩٩،٢، ص ١٥٥ – ١٦٥.

(٢) أوليري: إنتقال علوم الاغريق الى العرب، ص١٠ – ٢٢.

کتێبخانەکەیدا زیاتر لە شەسەد هەزار بەرگ* نووسراوی تیادا بوو، بەم جۆرەش (ئەسکەندەریە) لەم قۆناغەدا جێگای (ئەسینا)ی گرتەوەو بووە ناوەندی شارستانیەتی یۆنانی، ئەوەی زیاتر یارمەتی ئەم شارەی دا تابگاتە ئەو ئاستە جگە لەو هۆکارانەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێی دا، هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافی و ستراتیژی ئەم شارە بووە کە کەوتووەتە نێوان هەرسێ کیشوەری ئەوکات و هەروەها ئاسانی ڕێگای پێ گەیشتنی لە هەردوو ڕێگای وشکانی و ئاوی بۆ هەریەك لە هەرێمەکانی چین و هیند و شێوە دوورگەی عەرەب[1].

لایەنی شارستانیەتی لەم قۆناغەدا گەشەسەندنێکی یەکجار گەورەی بەخۆیەوە بینی، ئەمەش بەهۆی کۆمەڵە هۆکارێکەوە بوو لە دیارترینیان ئەو پاشماوە کلتوورییە شارستانیەتە بوو کە لە قۆناغەکانی پێش خۆیەوە بۆ ئەم قۆناغە وەك کلتوور مابوویەوە، هەوەها تێکەڵبوونی شارستانیەتەکە بە شارستانیەتی ڕۆژهەڵات و پاشان ئەو بۆچوون و بیرەنوێیانەش کە ڕۆمانییەکان لەکۆتاییەکانی ئەم قۆناغە و سەرەتای سەردەمی ڕۆمانیدا دایانهێنا، تێکەڵ بەم شارستانیەتە بوون[2].

لەم قۆناغەدا گەلێ فەیلەسوف و بیریار و زانا دەرکەوتن، کە ڕۆڵی دیاریان هەبوو لە داهێنان و پێشخستنی زانست لەم شارستانیەتیەدا، بە تایبەتی لەم قۆناغەدا، بەڵام ئێمە هەوڵ ئەدەین زیاتر لەوانەیان بدوێین کە بەرهەمەکانیان و بیرەکانیان کاریگەری تەواوی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی هەبووە و لە دیارترینی ئەوانەش:

---

* سەرباری ئەوەی سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەم ژمارەیە دەکەنەوە، بەڵاّم بە بۆچوونی ئێمە ئەم ژمارەیە زیادەڕەوی تیادایە بۆ ئەو کات، بەڵاّم دەکرێت بڵێین ژمارەیەکی زۆری کتێبی تیادابووە!!.

(١) د.م حمد محمود عبدالحميد: مدرسة الإسكندرية الفلسفية، دار الوفاء لدنيا الطباعة والنشر، الاسكندرية، ط١، ٢٠٠٤، ص١٢ — ١٩" ه. ايدرس بل: مصر من الاسكندر الى الفتح العربي، تر. د.عبداللطيف أمد علي، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٣، ص٤٤ — ٥٢.

(٢) د. أحمد محمود صبحي و د.صفاء عبالسلام جعفر: م. س، ص ٣٦ — ٣٩.

(ئەقلیـدس Euclid ٣٦٥ – ٣٠٠ پ.ز) ئـەم فەیلەسـوفە لـە ئەسـکەندەریە لـە دایك بووە و لە ئەسینا خوێندوویەتی، پاشان لەلایەن (بەتڵیمۆس)ەوە گرنگـی زۆری پێئەدرێ، لێـرەوە (ئەقلیـدس) بـە دیـارترین کەسـایەتی قوتابخانـەی ئەسـکەندەریە دەناسرێت، سەرباری ئەمانەش لە بواری زانستدا بە دیارترین زانای بیرکاری دائەنرێ کە کاریگەری لەسەر جیهان هـەبووە و هـەروەها گرنگـی بـەکاری ڕێکخستن دەدا لـە بـواری (لۆژیـك)دا، بـە تایبـەتی بـۆ بـواری ئەنـدازیاری، ئەنـدازیاری لەسـەر کۆمەڵـە سیستمێکی بەڵگەیی دارِشت لە زاراوەکانی ئەندازیاری وەك خاڵ هێڵ و ڕاستە، جگـە لەمانەش بۆ سەلماندنی بەڵگەکانی خۆی هەمووکات پشتی بە بە مەرجەکانی ئەرستۆ دەبەست لە بواری زانستی بەڵگەییدا [1].

(ئەقلیدس) ناوبانگی تەواوی بە کتێبەکەی (الاصول Elements) دەرکرد، کە بە باشترین سەرچاوەی ئەندازیاری دادەنرێت، بەتایبەتی بـۆ زانایـانی شارسـتانیەتی ئیسلامیی کە سـوودێکی زۆریـان لێـی وەرگـرت و کاریگـەری لەسـەریان هـەبوو، لـەم بارەیەوە (إبن الندیم) دەڵێت: ((نـاوی ئـەم کتێبـە (اسرشـیا)یـە و مانـای بنـەماکانی ئەندازیاری دەگەیەنێت، ئەم کتێبە (حجاج بن یوسف بن مطر) دووجار وەری گێڕاوە، یەکەمیان بە (الهاروني) ناودەبرێت، واتە لە سەردەمی (هارون الرشید) دا و دووەم بە (المأموني) ناودەبرێت، واتە لە سـەردەمی (مـأمون) دا، جـارێکی تـریش (اسـحق بـن حنین) وەریگێڕاوە و (ثابت بن قرة الحراني) چاکسازی تیادا کردووە))[2] لەپاش ئەمە (إبن الندیم) باس لە ژمارەیەکی زۆر لە وەرگێڕ و لێکۆڵـەر و شـیکارکەری ئـەم کتێبـە دەکات. هەروەها (إبن خلدون) لەبارەی ئەم کتێبەوە دەڵێت: ((کتێبی (الاصول) یان (الارکـان)، سـاناترین و پـڕ زانیـاری تـرین بابەتێکـە کـە لـە کتێبـی یۆنانییـەوە لـە سـەردەمی (ابـو جعفـر منـصور)دا وەرگێڕدرابـێ، ئـەم کتێبـە نوسـخەکانی جیـاوازە ئەمەش بەپێی جیاوازی وەرگێڕەکانی دەگۆڕدرێـت، کـە چـەندین جـار وەرگێـڕدراوە

---

(١) R.W.LIVINGSTONE ,OP.CIT .Pp22o – 223 " د. یاسین خلیـل: م. س، ص٤٣.

(٢) الفهرست، دار المعرفة، بیروت، ١٩٧٨، ص٣٧١.

لەوانە (اسحق بن حنين و ثابت بن قرة و يوسف بن حجاج)، هەروەها ئەم كتێبە لە پانزە بەش پێكدێت، هەندێ لە خەڵكی كورتيان كردۆتەوە وەك ئەوەی (أبن سينا) كردوويەتی لە كتێبی (تعاليم الشفاء) و (إبن الصلت) لە كتێبی (الاقتصار)، بەڵام ئەم كتێبە بنەمای ڕەهای ئەندازياريیە))[1].

گرنگی ئەم كتێبە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە كە (ئەقليدس) هەوڵيداوە لە ڕووی لۆژيكەوە بابەتە ئەندازياريیەكانی ناوی ڕێك بخات، لێرەشەوە پشتی بەستووە بە بەڵگە هێنانەوە بۆ سەلماندنی ڕاستی دەرەنجامەكانی، لەم كتێبەدا (ئەقليدس) چەندين نموونەی بەرز دەهێنێتەوە كە بە بنەمای هەريەك لە زانستی بيركاری و ئەندازياری دادەنرێن، نەك تەنها بۆ سەردەمی خۆی، بگرە تا سەردەمی ئەمڕۆشمان[2]، لە گريمانە و نموونەكانيدا دەڵێت: ((ئەگەر هێڵێكی ڕاست دوو هێڵی تەريبی بڕی، سەرجەمی گۆشە ناوخۆييەكان لەهەمان لادا كەمتر بوو لە دووستوونەكە، ئەوا ئەودوو هێڵە ڕاستە ئەگەر بەبێ سنوور درێژبوونەوە لەسەر هەمان ئەولايە يەكدەگرنەوە كە تيايدا گۆشەكانی كەمتر بوون لە دووستونەكە)). لە گريمانەيەكی تردا دەڵێت: ((ئەگەر هاتوو ستوونێ لەسەر سێگۆشەيەكی گۆشەوەستاو هاتە خوارەوە، ئەوا ئەو سێگۆشە نوێيانەی لەلای ستوونەكەوە دروست دەبن هەموويان هاوشێوەی هەموو ستونەكە دەبن، هەريەكێكيش لەو سێگۆشانە لە گەڵ ئەوانی تردا هاوشێوە دەبن))[3].

يەكێكی تر لەو فەيلەسوف و بيريارە گەورانەی ئەم قۆناغە كە كاريگەريی گەورەيان هەبوو لەسەر زانايانی مسوڵمان و لە پێشكەوتنی لايەنی زانستی لە شارستانيەتی ئيسلاميدا (ئەرخەميدس Archimides ٢٨٧ – ٢١٢ پ.ز)ە، ئەم

---

(١) المقدمة: دارالقلم، بيروت، ط٥، ١٩٨٤، ص٤٨٦.

(٢) أوليري: إنتقال علوم الإغريق الى العرب، ص٤٢.

(٣) الشكري: م. س. ص١١٧-١١٨ " R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp221 – 222.

کەسایەتییە لەشاری (سیراکوزا*) لەدایك بووە و سەرەتا بیرکاری و گەردووناسی و ئەندازیاری خوێندووە و پاشان بۆ زیاتر بەرەودان بە زانستەکانی سەردانی (ئەسکەندەریە)ی کردووەو لەوێ لەلای دیارترین زانایان و بیریارانی قوتابخانەکەی خوێندویەتی، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خۆی و لە ساڵی ٢١٢پ.ز لە دەرەنجامی ئەو ئابلۆقەیەی لەلایەن (مارکللوس)ی سەرکردەی ڕۆمانەکانەوە دخرێتە سەر شارەکەیان، دەکوژرێت[١].

داهێنراوەکانی ئەم فەیلەسوفە گەلێك زۆرن لەبوارەکانی میکانیك و بیرکاری و ئەندازیاری، گەر تەنها باس لە داهێنراوەکانی بکەین ڕەنگە چەندین بابەت و کتێبی تایبەت بەخۆی بوێت، بەڵام ئێمە لێرەدا بۆ بەرچاوڕوونی هەوڵدەدەین بە چەند دێڕێکی پوخت لەو داهێنروانە دەدوێن کە تیایدا زیاتر مەبەستمان لەو لایەنە فیکری و زانستییانەی ئەم کەسایەتییەیە کە کاریگەری لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی هەبووە[٢].

(إبن القفطي) دەڵێت: ((ئەم کەسایەتییە یۆنانییەك بوو کە لە میسر ژیاو لەوێ زانستی خۆی پێگەیاند و لێیانەوە زۆر شت فێر بوو لە هونەرەکانی ئەندازیاری کە ئەوان لە کۆنەوە لەسەری بوون، هەروەها چەندین کتێبی جوان و پلەبەرزی هەیە))[٣].

(إبن الندیم) دەڵێت: ((چەند کەسێکی جێ باوەڕ پێیان ڕاگەیاندووم کە ڕۆمانەکان پانزە باریان لە کتێبەکانی ئەرخەمیدس سووتاندووە، ئەمەش هەواڵێکە شیکاری زۆری دەوێت، بەڵام ئەو کتێبانەی کە ئێستا ئامادەیە لە کتێبەکانی، کتێبی (الكرة و الاسطوانة) کە دووبەشە، کتێبی (تربيع الدائرة) یەك بەشە، کتێبی (تسبيع

---

* یەکێکە لە ناوەندەکانی شارستانیەتی یۆنانی کۆن، ئێستا سەر بە دورگەی (صقلية)یە لە ئیتاڵیا، لە کۆندا گرنگترین شارەکانی (صەقلیە) بووە، بڕوانە: المنجد في الاعلام، م. س، ص٣٢٠.

(١) الشكري: م.ن. ص١٢١ – ١٢٢.

(٢) د. یاسین خلیل: م. س. ص٤٤.

(٣) أخبار العلماء، ص٣٣.

الدائرة) یەك بەشە، کتێبی (الدوائر المماسة) یەك بەشە، کتێبی (الخطوط المتوازنـة)، کتێبی (المأخوذات في أصول الهندسة)، کتێبی (المروضات)، کتێبی (خواص المثلثات القائمـة الزاویـة) یـەك بەشـە و کتێبـی (آلـة سـاعات المـاء الـتي ترمـي بالبنـادق)یـەك بەشە....))[1].

لێکۆڵینەوەکانی (ئەرخەمیدس) چەندین بواری گرتووەتەوە، لەوانە ئەندازیاری و گەردووناسی و میکانیکـا، بـەوە جیادەکرێتـەوە کـە لـە بـارەی (الکـرة والاسـطوانة) بابەتی نووسیوە، بە بەڵگـەی ئەنـدازیاریی ورد، لـە کتێبـی (الحلزونیـات) باسـی لـەو دەرەنجامانە کردووە کە لە کتێبەکەی پێشووی لە بـارەی (الکـرة و الاسـطوانة) پێـی گەیشتبوو، بۆیە (حلزونیات) بەناوی (ئەرخەمیدس) ناونراوە بە (حلزون ارخمیدس).

(ئەرخەمیدس) بەهەمان شێوە لە باسکردنی بابەتە فیزیاییەکاندا بە پێـشەنگ و تاك دادەنرێت، بە بەڵگە وردەکانی لەبارەی فیزیاوە، هەروەك توانی چەندین زانـست و لقی نویێ لە بواری زانستی میکانیکدا دابهێنێ، هەروەها بە لێکۆڵینەوە لە قـەبارە و تەنە جێگیرەکان (Statics) دوواوە، توانی ڕێسایەکی گرنگی فیزیـایی دابنێـت کـە دەڵێت: ((ئەگەر قەبارەیەك بکەوێتە ناو شلەیەکەوە و هەموو قەبارەکە یان بەشـێکی ئەو قەبارەیە لەو شلەیەدا نوقمبو ئەوا بەهێندەی کێـشی ئـەو قەبارەیـە ئـەو شـلەیە بەرزدەکاتەوە یان فڕێی دەدات)).

سەرباری ئەمانە چەندین داهێنـراوی تـر هەیـە کـە دەدرێتـە پـاڵ ئەرخەمیـدس، لەوانە داهێنـانی کاتـژمێری خـۆری و داهێنراوەکـانی تـری لـە بـواری کەشـتیوانییدا، هەروەها داهێنانی ئاوێنەی سوتێنەر و چەندین ئامێری جەنگی و چەندانی تریش[2].

یەکێکی تر لە کەسایەتییە دیارەکانی ئەم قۆناغە کە کاریگـەی لەسـەر زانایـانی مسوڵمان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا هەبووە (ئـەپۆلۆنیۆس Apollonius ٢٦٠ – ٢٠٠پ.ز)ە، ئــەم کەســایەتییەش ســەردانی ئەســکەندەرییەی کــردووە و تیایــدا

(١) الفهرست، ص ٣٧٢.

(٢) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp223–227 " د. حسين الشيخ، م. س، ص١٣٠ " د. ياسين خليل: م. س،ص٤٥.

خوێندوویـــەتی، لـــەدیارترین بەرهەمـــەکانی ئـــەم فەیلەســـوفە کتێبـــی (المخروطـــات Conics)ە، کـــە هاوشـــێوەی کتێبـــی (الاصـــول)ی (ئەقلیـــدس)ە، بـــەو پێیـــەی کـــە لەلایەك کتێبێکی کۆکراوەیە و لە لایەکی تریشەوە پسپۆڕێکی تاکانەیە لە پارچەکانی (المخروطات)، ئەم کتێبـە کۆکراوەیـە کـە لـەو لایەنـە زانسـتییانەی پێـشینەکانی لـە بواری (المخروطات) بەدەستیان هێناوە، سەرباری ئەوەی چەندین داهێنانی نوێی لـە بابـەت و شـێوازی چارەسـەردا خـستووەتە سـەری، ئـەم کتێبـە لـە هەشـت بـەرگ پێکدێت، حەوتیان دیارە بەڵام هەشتەمیان تا ئێستاش نادیارە[1].

هـەروەها لـە بـواری گەردووناسـیدا لـەم قۆناغـەدا چـەندین زانـا و فەیلەسـوفی گەورە دەرکەوتن کە بە پێشەنگ دادەنرێن لەوانەش:

(هیپـــسیکلیس Hipsicles لـــە دەوروبـــەری ١٨٠ پ.ز)، لـــە ئەســـکەندەریە دەرکەوت، دابەشکردنی بازنە بۆ (٣٦٠) پلەو هەروەها هەربەشـێك بازنـە بـۆ شەسـت پلـە یەکێکـە لـە بۆچـوونە دیارەکـانی ئـەم فەیلەسـوفە. هـەروەها (هیپـارخوس Hipparchus لەدەورو بەری ١٢٥ پ.ز) یەکێکی ترە لە فەیلەسوفانی ئەم قۆناغـە هەرچەندە سەر بە قوتابخانەی ئەسـکەندەریە نـەبوو و خـەڵکی نیـشتمانی (رودس * ) بوو، ئـەم فەیلەسـوفە تـوانی پێوانـەی گۆشـەکان و دوورییـەکانی بازنـە بدۆزێتـەوە، لەپاش ئەمانەوە زانایانی مسوڵمان (مینیلاوس Menelaus)یان ناسی[2]، هەروەك (إبن الندیم) لەبارەیەوە دەڵێـت: ((ئـەم کەسـایەتییە لـە پـێش بەتلێمۆسـەوە بـووە، چونکە ناوی لە کتێبی (المجسطي) بەتلێمۆسـدا هـاتووە، هـەروەها چـەندین کتێبـی هەیە لەوانە (الاشکال الکریمة)، (في معرفة کمیة تمیز الاجرام المختلطة)، ئەوکارەی کە

---

(١) أولیري: إنتقال علوم اللأغریق الی العرب، ص٤٤" د. حسین الشیخ، م. س، ص١١٩.

* دوورگەیەکی شاخاوی یۆنانی بووە و بە یەکێك لە گرنگترین دوورگەکانی دودیکانیز لـە دەریـای ئیجە دادەنرێت، بڕوانە: المنجد في الاعلام، م. س، ص٢٦٨.

(٢) أولیري: إنتقال علوم الإغریق الی العرب، ص٤٥ – ٤٦.

بۆ پادشا (تۆماتیانۆس) لە کتێبی (الاصول الهندسیة) کردی و.... هتد))[1]. هەروەها ئەم کەسایەتییە هەروەك زانراوە هەستاوە بە چەندین لێکۆڵینەوەی گەردووناسی.

لە دیارترین فەیلەسوفانی و بیریاران لە بواری لێکۆڵینەوەی گەردووناسیدا (بەتڵیمۆس کولودیوس Claudius Ptolemiu ٨٧ – ١٦٥ ز)، دەرکەوت کە لە بنەچەدا یۆنانی بووە و لە میسر لەدایك بووە و لە ئەسکەندەریە درێژەی بە زانست و خوێندنەکەی داوە، بە تایبەتی لە بوارەکانی جوگرافیا و گەردووناسیدا ناوبانگی دەرکردووە و لەم بوارانەدا لێکۆڵینەوەی یەکجار زۆری هەیە[2].

(بەتڵیمۆس) دائەنرێ بەدیارترین جوگرافیناسی سەردەمی خۆی، بەتایبەتیش هەروەك لە کتێبەکەی بە ناونیشانی (کورتەی جوگرافیا Geographik Hughegisis) کە بە باشترین پێشینەی مێژوویی دادەنرێت لە بواری سەرچاوەی زانستی جوگرافیادا، لەم کتێبەدا (بەتڵیمۆس) جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە شار و شارۆچکە زانراوەکانی سەردەمی خۆی لەسەر نەخشە بە پێی هێڵەکانی پانی و درێژی دیاری بکات. پاشان چەندین خشتەو نەخشەی بۆ هەریەك لەو شارانە درووست کردووە، کە لە ٨٠٠٠ شوێن و شار و دەریا.....هتد زیاترن[3]، هەروەك ئەم کتێبە بەسەرچاوەیەکی مێژوویی وڵاتانی رۆژهەڵاتیش ئەژمار دەکرێت، چونکە باسی لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبار کردووە و شارەکانی دیاری کردووە، هەروەها خشتەیەکی بە ناوی پادشایانی بابلی و فارسی و ساڵی حوکمیان و فەرمانڕەوایەتییان دیاری کرد و هەر لە سەردەمی پادشای بابلی (نبوناسر ٧٤٦–٧٣٤ پ.ز)، هەروەها سەرجەم پیاوانی ئاینی ڕۆمانی (أباطرة الرومان)، تا سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (انتۆنیۆس بایۆس ١٣٨–١٦١ ز)، ئەم خشتەیەش لەلایەن لێکۆڵیارانی ئەو ماوە مێژووییەوە بە (یاسای بەتڵیمۆس Potlimos Canon)ناسراوە، زانایانی جوگرافیناس لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا، لەکاتی دانانی کتێبەکانیاندا، پشتیان بەم سەرچاوەیە

---

(١) الفهرست، ص٣٨٨.

(٢) الشكري: م. س، ص١٢٥.

(٣) الشكري: م. س، ص١٢٥.

بەستووە و كاریگەری لەسەریان هەبووە، لەپێش هەمووشیانەوە جوگرافیناسی گەورە (ابو جعفر محمد بن موسى الخوارزمي) كە لە ساڵی (٢٣٦ك/٨٥٠ز) كۆچی دوایی كردووە و یەكێك بووە لە ئەستێرەناسەكانی خەلیفە (مأمون)، هەروەها خاوەنی كتێبی (صورة الأرض)ە، كە سوودی لە نەخشەكانی ناو ئەم كتێبە وەرگرتووە و بە هەندێ دەستكاری كەمەوە لە كتێبەكەیدا ایناوەتەوە [١].

یەكێكی تر لە دانراوەكانی (بەتڵیمۆس) كە ناوبانگێكی زۆرگەورەی پێ پەیداكرد كتێبی (المجسطي He Mesgest Astronomy)، ئەم كتێبە بە پوختەی زانیارییەكانی جیهانی كۆن و شارستانیەتی یۆنانی دادەنرێت لە بارەی زانستی گەردووناسییەوە، سەرباری ئەوەی ئەم كتێبە بە قووڵی لە بۆچوون و ڕەسەنایەتی بابەتی نوێ دەناسرێتەوە [٢].

سەرباری ئەوەی (بەتڵیمۆس) زۆرێك لە زانیارییەكانی خۆی بەتایبەتی لە گەردووناسی یۆنانی (هیپارخۆس ١٦١ – ١٢٦ پ.ز)، وەرگرتووە و پشتی بە زانیارییەكانی هەندێ لە گەردووناسی بابلی وەك (كدینو Kidinu)، و(نیو– ریمانی Neu -Remani) وەرگرتووە.

لەم كتێبەدا (بەتڵیمۆس) چەندین بیروبۆچوونی تایبەتی لەبارەی هەسارەكان و گەردووناس دەربڕیوە، بنەمای تیۆرییەكەی بریتییە لەوەی كە (زەوی ناوەندی جیهانە)، لەسەر ئەم بنەمایەش سیستەمەكەی خۆی تایبەت بە لێكدانەوەی گەردوون دادەڕێژێ كە بە (سیستەمی بەتڵیمۆس Potlimos System) ناسراوە، پوختەی ئەم سیستەمەش ئەوەیە كە زەوی ناوەندی گەردوونە و پاشان مانگی بە دەوردا دەسوڕێتەوە و پاش ئەمیش عەتارد و زوهرە و خۆر و مەریخ و مشتری و زوحەل

---

(١) أوليري: إنتقال علوم الإغريق الى العرب، ص٤٧ " بۆ زیاتر شارەزا بوون بڕوانە: الخوارزمي: صورة الأرض من المدن والجبال و البحار و الجزائر و الأنهار، إستخرجه من كتاب (جغرافيا) الذي ألفه بطليموس القلوذي نشرها وصححها هانز ظون ميذك (Hansvonn Mzk)، ليبسك ١٩٢٦، إعادت نشره بالأوفسيت مكتبة المثنى ببغداد سنة ١٩٦٠م.

(٢) د. محمد محمود عبدالحميد: م. س، ص٤٢ – ٤٥.

دێت، هەروەها پێی وایە کە زەوی جێگیرەو ناگۆڕێت، بۆ ئەمەش بەڵگەی ئەوە دەهێنێتەوە کە ئەگەر تەنێك بەئاسماندا بەشێوەیەکی شاقوڵی ستوونی بە ئاسماندا هەڵبدەین دەبینین ڕاستەوخۆ دەکەوێتەوە شوێنی خۆی، ئەمەش بەواتای ئەوە دێت کە زەوی جێگیرە، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەوا ئەو شتەی کە هەڵمان دا ناکەوێتەوە سەر هەمان شوێن[1].

دانراوەکانی ئەم فەیلەسوفە کاریگەری یەکجار زۆری هەبوو لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی بەتایبەتی لە بواری گەردووناسیدا و لەڕێگای کتێبی (المجسطي)، کە چەندین جار وەرگێڕادراوەتە سەر زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی بۆ کراوە[2]، بەجۆرێ گرنگی بەم کتێبە درا تەنانەت لەکاتی سەردەمی ڕێنیسانسدا لە ئەوروپا کاتێك بەدوای سەرچاوە ڕەسەنە یۆنانییەکەی ئەم کتێبەدا گەڕان، دەستیان نەکەوت، بۆیە باشترین سەرچاوەیەك کە سوودیان لێیەوە وەرگرت وەرگێڕدراوە عەرەبییەکەی ئەم کتێبە بوو، لەم بارەیەوە (إبن النديم) دەڵێت: ((بەتلیمۆس لە سەردەمی هەردوو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ئەدریانۆس و ئەنتۆنیۆسدا هەسارەناس بووە، بۆیە پێدەچێت کتێبی(المجسطي) بۆ یەکێکیان نووسیبێت، ئەم کتێبە لە سیانزە بەش پێك هاتووە، هەروەها یەکەم کەسێك کە گرنگی پێداو هەوڵی دا وەربگێڕدرێتە سەر زمانی عەرەبی، (يحيى بن خالد البرمكي) بوو، سەرەتا کۆمەڵێك بۆیان شی کردەوە بەڵام پێی ڕازی نەبوو، بۆیە ناردی بۆلای (صاحبى بيت الحكمة) و ئەوانیش بۆیان وەرگێڕاو لێکدانەوەیان بۆکرد، هەروها دەگوترێت کە حجاج بن یوسف یش وەریگێڕاوە))[3].

هەر لە بواری گەردووناسی و بیرکاری و جوگرافیادا لەو سەردەمەدا فەیلەسوفێکی تر دەرکەوت ئەویش (ئەراتۆسسینیس Eratosthenes ١٩٢ – ٢٧٤پ.ز)، ئەم کەسایەتییە سەرەتا لە (ئەسینا) خوێندویەتی و پاشان بۆ زیاتر

---

(١) الشكري: م. س، ص١٢٦ – ١٢٧ " د. ياسين خليل: م. س، ص٤٧.

(٢) أوليري: إنتقال علوم الإغريق الى العرب، ص٤٧.

(٣) الفهرست، ص٣٧٤.

وەرگرتنـی زانستەکانی سـەردەم چـووەتە (ئەسـکەندەریە)و لـەوێ زانسـتەکان فێـر بووە، دیارترین داهێنراوەکانی ئەم فەیلەسوفە لە بواری جوگرافیادایە، کە هەوڵیداوە تەواوی زەوی پێوانە بکـات و وڵاتـانی هەڵسەنگاندووە و هـەروەها لـە بۆچـوونەکانی ئەوە بووە کە وتوویەتی زەوی خڕە و پاشان کردوویەتی بە چەند خولگەیەکەوە(١).

هەروەها لە بواری میکـانیکی پراکتیکـی (هـیرۆن Heron)ی ئەسـکەندەری لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی یەکـەمی زاینـی دەرکـەوت. ئـەم کەسـایەتییە گرنگـی بـە دروستکردنی ئامێر دەدا لە ژێر ڕۆشنایی پرەنسیپێکی فیزیایی ئاشکرا کە پرەنسیپی (سیفۆن Sipfon)ە و پرەنسیپی بەدەستهێنانی وزە لە ڕێگای هەوای گەرم، هیرۆن ئەم دوو پرەنسیپەی بەسەر چەندین ئامێردا تاقی کـردەوە، کـە تێیـدا تـوانی هێـزی جوڵێنەر بەدەستبهێنێ لـە ڕێگـای جێبـەجێ کردنـی بنـەمای درێژکردنـەوەی هـەوای گەرم(٢).

لــە بــواری بیرکاریــدا (دیــوفنتس Diophantos لــە دەوروبــەری ٣٢٥–٤٠٩ز)دەرکەت ئەم کەسایەتییە توانی لـە ڕووی (حـساب و جـبر) سیـستەمێکی نـوێ دابێنێت کە لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ ڕێسا یۆنانییەکاندا جیاوازبوو، گریکەکان گریمانـەیان بە بنەمایەك دادەنـا بـۆ گەیـشتن بەڕاسـتییەکان لـە ڕێگـای بەڵگـە هێنانـەوە، بـەڵام (دیوفنتس)، پێی وابوو کە دەبێت زانراوەکان بنەمابن بـۆ ئاشـکراکردنی نادیارەکـان لەبواری بیرکاریدا(٣).

هــەروەها لــەو ســەردەمەدا لــە بــواری زانــستی پزیـشکیدا ژمارەیـەکی زۆر لـە فەیلەسوفان و زانایان دەرکەوتن لە دیارترینیـان: (دیـسقۆریدس Dioskorides)، ئەم پزیشکە لە شاری (عین زربە*) لە سەدەی یەکەمی زاینی ژیاوە و لە ساڵانی (٧٧

---

(١) د. یاسین خلیل: م. س، ص٤٧.

(٢) أولیري: إنتقال علوم الإغریق الی العرب، ص٤٥ - ٤٦.

(٣) R.W.LIVINGSTONE,OP.CIT.Pp134 – 135.

* یەکێکە لە شارەکانی کیلکیا و دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتییەوە لە نزیـك گرسـوس لـە ئاسیای بچووك (تورکیای ئێستا). الشکري: م. س، ل ١٣٤ " المنجد في الإعلام، ص٣٨٢.

یان ٧٩ ز) کۆچی دوایی کردووە، لە سەردەمی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی (نیرۆن Neron)دا پزیشك بووە لە سوپای ڕۆمانیدا، ئەم کەسایەتییە پزیشکێکی شارەزاو و دەرمانسازێکی بێهاوتا بووە، چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر ئاژەڵ و هەروەها ڕووەك کردووە و هەوڵیداوە تەمەنیان و جۆرەکانیان و کاتی پێگەیشتنیان و کاتی وشکبوونەوەیان و سوودەکانیان دیاری بکات و لە دەرمان دروست کردندا بەکاریان بهێنێت، ئەم فەیلەسوفە بەوە ناسراوە تا دەرمانێکی تاقی نەکردبێتەوە و دڵنیا نەبووبێت لێی بەکاری نەهێناوە و بە نەخۆشی نەداوە[١].

(دیسقوردیوس) چەندین کتێبی هەیە لە دیارترینیان کتێبەکانی (الحشائش الادویة Matcria Madicu) و کتێبی (هیولي علاج الطب Deoseridis de Simplicibys)، لەم کتێبانەیدا (دیسقۆردیۆس) زۆر بەوردی باسی چەندین دەرمانی کردووە کە لە ئاژەڵ و ڕووەك دەردەهێنرێن و هەروەها بەشێوازی ڕەنگاوڕەنگ و بە ڕوونکردنەوە باسی لە چۆنیەتی بەکارهێنانی یان خواردنی کردووە.

ئەم کەسایەتییە بە بەرهەمەکانی توانی کاریگەری لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی هەبێت و لەلایەن زانایانی مسوڵمانەوە ناسراوە و لە بەرهەمەکانیاندا ئاماژەیان پێی دەدا بۆ یەکەمجار کتێبەکانی لە سەردەمی خەلیفە(المتوکل علی الله)، لەلایەن (ستغانوس بن باسیلوس) کە لەلایەن عەرەبەوە بە (اصطفن بن باسیل) ناسراوە، وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی، پاشان (حنین بن اسحق) پێداچوونەوەی بە وەرگێڕانەکەیدا کردووە و ڕێگەی پێداوە[٢]، لەبارەی ئەم کەسایەتییەوە (إبن أبي اصیبعة) دەڵێت: ((دیسقوردیوس لە دوای (أبقراط) هاتووە و هەروەها شیکارکەری کتێبەکانی بووە، ئەم کەسایەتییە خاوەنی دەوونێکی بەرزی خزمەتگوزاری خەڵك بووە، بەشاراندا گەڕاوە و زانستی دەرمانسازی لە وشکانی و بیابان و دەریا دەرهێناوە و وێنەی بۆ کێشاون و تاقی کردوونەتەوە و ئاماژەی بە سوودەکانیان

(١) الشکري: م. س، ص ١٣٤ – ١٣٥.

(٢) م. س، ص١٣٦.

داوه، ئەگەر ئەو تاقیکردنەوانە سەرکەوتوو بوایە ئەوا جێگیری دەکرد، کەواتە سڵاو بێت لەو دەروونە بەرزەی کە ماندوو دەبوو لە پێناو گەیاندنی خزمەتگوزاری بە سەرجەم خەڵکی))[1].

هەروەها کەسایەتییەکی تری بواری پزیشکی ئەم سەردەمە، (جالینۆس Galenos ۱۳۱ – ۲۰۱ز)ە، کە چەندین پاشماوەی گەورەی لە سەرجەم لقەکانی پزیشکیدا بۆ بەجێهێشتووین، ئەمیش بە پشتبەستن بە ئەزموونی پێشینی خۆی لە بواری پزیشکی و هەروەها تاقیکردنەوەکانی خۆی لەو بوارەدا، بەجۆرێ کە دانراوەکانی بە فەرهەنگی گەورەی پزیشکی وێنادەکرێت، بە لێکۆڵینەوە نەشتەرگەری و توێکارییەکانی ناوبانگێکی گەورەی دەرکرد، بەتایبەتی پاش ئەوەی سوودێکی گەورەی لە توێکارە بەناوبانگ و کارەگەورە پزیشکییەکانی پێش خۆی وەرگرت، نەك بە تەنها لە ئەسکەندەریە و قوتابخانەکەی بگرە لە سەرجەم شارەکانی تریش کە لە پێش ئەوەوە بە بواری پزیشکی توێکارییەوە خەریك بوون، لە سەردەمانێکی زۆر کۆنەوە بەڵگەی بەنرخی کۆکردەوە[2]، لەو کەسە دیارانەش کە (جالینۆس) سوودی گەورەی لێوەرگرتن (هیرۆ فیلۆس Herophilus of Chalesdon)، کە بە پێشەنگ دادەنرێت لە بواری توێکاریدا لە شارستانیەتی یۆنانیدا، هەروەها سوودی لە (ئارستراتۆس Erisastratus) وەرگرت کە بە دامەزرێنەری زانستی فەلسەفەی توێکاری بەراوردکاری دائەنرێ، هەروەها زۆرباوەڕی بەو تیۆرە باوەی سەردەمی خۆی هەبوو کە دەڵێ: بوونەوەری زیندوو دابەش دەبێ بەسەر سێ جۆردا کە مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکە، مرۆڤ بەهێزی عەقڵ لە ئاژەڵ جیادەکرێتەوە، ئاژەڵیش بە جوڵە و گواستنەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر لە ڕووەك جیادەکرێتەوە، ڕووەکیش لە هێزێکی نوستوودا کۆدەبێتەوە، بەپێی ئەم بنەمایەش دەروونی مرۆڤ خاوەنی هێزێکی نووستوو و عاقڵ و جوڵاوە، بۆ ئەم هێزەش ئەندام و ئامێر هەیە لە لەشی مرۆڤدا، (جالینۆس) ئەمەشی بە ئامێرەکانی

---

(١) عيون الأنباء، ص٥٨.

(٢) السير جون. أ. هامرتن: م. س، ص ١٦٦.

هـەزم و هەناسـەدان و دەماغـەوە دەبەسـتەوە، (جگـەر و دەمارەکـان) بـریتین لـە ئامێری سەرەکی ژیانی ڕووەکی مرۆڤ، وە (دڵ و سی و شـادەمارەکان)ی دادەنـا بـە ژیـانی ئـاژەڵی مـرۆڤ، وە بارەگـای ژیـانی عـاقڵی مـرۆڤ بریتییـە لـە مـۆخ و ئـامێری دەماغ[1].

پزیشکان و زانایانی مـسوڵمان هـەر لـە زووەوە نووسـراوەکانی (جـالینۆس)یـان ناسـی و سـوودی زۆریـان لێـی وەرگـرت، (ابـن أبـي اصـيبعة) جگـە لـە باسـکردنی کتێبەکانی و دانراوەکانی شیکارکردنی ئەو کتێبانە، باس لـە بـەربڵاوی ئـەو کتێبانـە دەکات بەدەستخەڵکەوە لە سەردەمی خۆیدا[2].

بەم جۆرە ئـەم زانـستانە لـە شارسـتانیەتی یۆنـانی لـە دوای ئەمانـەوە و پـاش دروستکردنی (کەستەنتینیە)و بەهێزبوونی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی، بەرەو شـاردنەوە و لاوازی چـوون هـەروەك لێـی دوایـن، تـا دەرکـەوتنی شارسـتانیەتی ئیـسلامیی لـە سەردەمی یەکەمی عەبباسی و ئەمـەش لـە ڕێگاکـانی فتوحـاتی ئیـسلامیی و تێکـەڵ بوونی نەتەوەکانی نا عەرەب و نا مسوڵمان بەو شارسـتانیەتە و بڵاوکردنـەوەی ئـەم شارسـتانیەتە لـەو سـەردەمەدا و هـەروەها فـەتح کردنـی ناوەنـدە شـارەکانی ئـەو شارستانیەتە و پاشان بەهێزبوونی بزووتنەوەی وەرگێڕانی ئەم زانستانە بـووە هـۆی بڵاوبوونــەوە و ســەرلەنوێ زینــدوو بوونــەوەی ئــەم شارســتانیەتە و پەرەســەندنی شارستانیەتی ئیسلامیی، بەتایبەتی لە سەردەمی یەکـەمی عەبباسـیدا، هـەروەك لـە بەشەکانی تری ئەم لێکۆڵینەوەیە بە وردی لێی دەدوێین.

(١) د. ياسين خليل: م. س، ص٤٨ – ٤٩.

(٢) عيون الأنباء، ص١٠٩ - ١١٠.

## بەشی دووەم: کاریگەری فتوحاتی ئیسلامیی لەسەر گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامیی

### باسی یەکەم: فەتحکردنی ناوەندە شارستانیەتەکانی یۆنانی و ڕۆڵیان لە گەیاندنی ئەو شارستانیەتە بە شارستانیەتی ئیسلامیی

یەکەم: ئەسکەندەریە:

دووەم: ئەنتاکیە:

سێیەم: حران:

چوارەم: نصیبین:

پێنجەم: رۆها (ئورفە):

شەشەم: جندیسابور:

### باسی دووەم: ڕۆڵی نەتەوە و گەلە ناعەرەب و نامسوڵمانەکان لە گەیاندن و پەرەپێدانی شارستانیەتی یۆنانی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا:

یەکەم: مەوالییەکان

دووەم: ئەهلی زیممە

سێیەم: خوێندنگای (دێرە) مەسیحییەکان و ڕۆڵیان لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بەشارستانیەتی ئیسلامیی

## باسی یەکەم: فەتحکردنی ناوەندە شارستانیەتەکانی یۆنانی و ڕۆڵیان لە گەیاندنی ئەو شارستانیەتە بە شارستانیەتی ئیسلامیی

پاش پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیی، چەند ناوچەیەك کەوتنە ژێر سایەی خەلافەتی ئیسلامییەوە کە بە ناوچەکانی ناوەندی شارستانیەتی یۆنانی لە ڕۆژهەڵاتدا ناسرابوون، ئەم ناوچانە بەهۆی ئەو پرەنسیپە زانستی و کلتووری و شارستانیەتەی هەیانبوو، بەهۆی ئەو خوێندنگایانەی کە تیایاندا بوون بۆ خوێندنی شارستانیەتی یۆنانی، توانییان ڕۆڵی سەرەکی ببینن لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، چ بە وەرگێڕانی ئەو زانستانەبێت یان بە بڵاوکردنەوەیان بێت لە نێوان خەڵکدا، ئەمەش زیاتر پاش (فتوحات)ی ئیسلامیی و ئاوێتە بوونی شارستانیەتەکانەوە باشتر ڕەنگی دایەوە.

هەروەك لە باسی دووەم ئاماژەی پێدەدەین، لەکاتی ((فتوحات))دا ئەم ناوچانە لەلایەن سوپای ئیسلامەوە تێك نەدەدران و وەك خۆیان دەمانەوە و سەرباری ئەوەی زۆرینەی ئەم ناوچانە بە ڕێککەوتن فەتح دەکران و بە هێندەی ئەوەی کە (جزیە)یان بدایە، ئیدی لەلایەن مسوڵمانانەوە پەیوەندییان پێیانەوە نەبوو، ئەمەش هۆکارێکی تری دیار بوو کە بتوانن ئەو ڕۆڵەی خۆیان لەو بوارەدا بگێڕن.

ئەو ناوەندانەی کە زیاتر ڕۆڵیان هەبوو و دیاربوون شەش ناوەندن، ئەوانیش ناوەندەکانی (ئەسکەندەریە، ئەنتاکیە، حران، نصیبین، روها و جندیسابور) بوون، هەوڵدەدەین لە خوارەوە باس لە هەریەك لەو ناوەندانە بکەین و ڕۆڵیان دربخەین:

**یەکەم: ئەسکەندەریە:**

یەکێکە لە ناوەندە زانستییە گرنگەکانی شارستانیەتی یۆنانی، کە لە لایەن (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لە ساڵی (٣٣٢ پ.ز) بنیاتنراوە[1]. پاش مردنی (ئەسکەندەر)، ئەم شارە لەلایەن سەرکردەیەکی سوپاکەیەوە بەناوی (بطلیموس سوتیر ٢٨٥ – ٢٢٣ پ.ز)، کرایە پایتەختی دەسەڵاتەکەی و تیایدا دەوڵەتی (بطالمة)ی دامەزراند، لێرەوە ئەم سەرکردەیە هەوڵیدا ئەسکەندەریە بە جۆرێ پێشبخات کە پێشی شاری (أثینا)ی یۆنانی بداتەوە، بۆ ئەمەش چەندین کاری گرنگی کرد لەوانە: ئەکادیمیایەکی گەورەی تیادا دروست کرد و هەروەها لەپاڵ ئەمیشدا کتێبخانەیەکی گەورەی بنیاتنا و ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەرگی کتێبی تیادا کۆکردەوە، هەروەها لەپاش (بطلیموس) کاتێك (بطلیموس فیلاذلفوس ٢٨٥ – ٢٤٧ پ. ز) دەسەڵاتی گرتەدەست، کتێبخانەکەی دەوڵەمەندتر کردو چەندین کتێبی لە سەرجەم ناوچە جیاوازەکانەوە بۆ هێناو تیایدا کۆکردەوە، بەمەش ئەم کتێبخانەیە بوو بە بەناوبانگترین و گەورەترین کتێبخانەی سەردەمی خۆی[2]، هەروەها لەم

(١) یاقوت الحموي: معجم البلدان، دار الفكر – بیروت، (د.ت)، ج١، ص١٨٣ " هـ.آیدرس بل: مصر من الأسكندر الأكبر حتى الفتح العربي، تر. د.عبداللطیف أحمد علي، دار النهضة العربیة، بیروت، ١٩٧٣م، ص٤٤" د. محمد محمود أبو القحفة: مدرسة أسكندریة الفلسفیة التاریخ الحضاري و الحوار الثقافي بین الفلسفة والدین، دار الوفاء لدنیا الطباعة والنشر،٢٠٠٤م، ص٩ " ول دیورانت: قصة الحضارة – الشرق الأدنى، تر. محمد بدران، جامعة الدول العربیة، ١٩٧١م، مج ١، ج٢، ص٤٧.

(٢) د. إبراهیم نصحي: دراسات في تاریخ مصر في عهد البطالمة، مكتبة أنجلو مصریة،١٩٥٩م، ل ٩٥ – ٩٨ " د.أمیرة مطر: الفكر الاسلامي، ص٧٣ – ٨٤" د.سعد بن عبدالله الضبیعان: مكتبتا الأسكندریة و برجاموم أشهر المكتبات الحقبة الهیلینیة، دار المریخ، الریاض، ١٤٢٠هـ – ٢٠٠٠م، ل ١٦ – ١٩" أولیري: العلوم الیونانیة وسبل نقلها الى العرب، ص٢٣ – ٢٤" لطفي عبدالوهاب یحیى: مقدمة لحضارة الأسكندریة، دراسة لتاریخ البحر الأبیض، مطبعة دار النشر الثقافة، مصر – ١٩٥٨م،ص٣٩ – ٤٤ " د. عبدالفتاح أحمد فؤاد: فلاسفة الاسلام و الصوفیة و=

سـەردەمەدا چـەند فەیلەسـوفێکی گـەورە دەرکـەوتن، کـە بەرهەمـەکانیان پـاش وەرگێڕانیـان بـۆ زمـانی عـەرەبی لـە سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکاندا ڕۆڵێکـی گـەورەیان هـەبوو لـە ڕابـوونی شارسـتانیەتی ئیـسلامیدا، لەوانـەش وەك کتێبـی (الأصـــول)ی (أقلیـــدس ٣٣٠ – ٢٧٠ پ.ز) لـــە بـــواری ئەندازیاریـــدا و هـــەروەها بەرهەمەکانی (ارخمیدس ٢٨٧ – ٢١٢ پ.ز) لە بواری زانستی میکانیك و جوگرافیـادا و بەرهەمەکانی (اراتوسپنیس) لە بواری جوگرافیا و گەردووناسیدا، هەروەها کتێبـی (المجسطي) (کلودیوس بطلیموس) و چەندان بەرهەمی تر هەروەك لە باسی دووەمـی بەشی یەکەم لێی دواین[1].

بەم جۆرە ئەم ئەکادیمیایە و کتێبخانەکەی بەردەوام بوو، تا لە ساڵی (٤٨ ز) بە هۆی سووتانی ئەکادیمیاکەیەوە تووشی داڕمان هات، ئەوەبوو لەسـەر پاشماوەکـەی کتێبخانەیەکی تر دروستکرا لـە پەرسـتگای (سـراپیوم) یـان (سـراپیس)، ئیـدی ئـەم پەرسـتگایە لـە ئەسـکەندەریە بـوو بـە درێژەپێـدەری خوێنـدنی لایـەنی زانـستی و فەلسەفی و سەرجەم ئـەو بابەتانـەی تـری کـە لـە شارسـتانیەتی یۆنانییـەوە بۆیـان مابوویـەوە، پـاش چـەند سـەدەیەك لـە سـاڵی (٣٩١ز)دا (سـراثیوم) بـە دەسـتی مەسـیحییەکان بـە سـەرکردایەتی (تیوفیلـوس) کـە یـەکێك بـوو لـە سـەرکردەکانی ڕۆمـانی، وێرانکـرا[2]، بـەڵام ئەمـە نـەبووە هـۆی وەسـتاندنی ڕەوتـی زانـستی لـە

=موقف أهل السنة منهم: دار الوفاء لدنيا الطباعة و النشر، الأسكندرية، ٢٠٠٦، ل ١٩ – ٢٠" د.مـصطفى عبـادي: مجتمـع اللأسـكندرية في العـصر البطلمـي (مـصريون و أغريـق)، جامعـة الأسكندرية، ١٩٧٥م،ص٢٤ – ٣٢.

(١) د.سمير حنا صادق: العلم في مكتبـة الاسـكندرية، الهيئـة المصرية العامـة للكتـاب، القـاهرة، ١٩٩٨م، ل ٢٣ – ٣٧ – ٤١ " محمـد كـرد علـي: تـاريخ الحـضارة في القـرون الوسـطى و الحـديث، القاهرة، (د.ت)، ل ٤٦ – ٤٧ " هربرت جـورج ويلـز: معـالم تـاريخ الانـسانية، القـاهرة، ١٩٥٠م، ج٢، ل ٣٧٩.

(٢) الفرد بتلر: فتح العرب لمصر، تر. محمد فريـد أبـو الحديـد، مطبعـة الكتـب المـصرية، القـاهرة، ١٩٣٣م، ص٣٥٤ – ٣٦١ " د. سعد بـن عبـدالله الـضبيعان: م.س، ل ٢٣، ٢٨، ٣٨، ٤٠ = د.

ئەسكەندەریەدا، چونكە چەندین ناوەند و خوێندنگای تر لەم شارەوە سەریانهەڵدا، ئەمە سەرباری بوونی چەندین دێر و خوێندنگای تری مەسیحی لە شارەكەدا، هەرچەندە ئەگەر بە پلەیەكی كەمتریش بووبێت درێژەپێدەری ئەوبارە زانستی و شارستانیەتەی پێشووبوون، هەروەها خوێندن تیایدا زیاتر لە خوێندنی فەلسەفەی (ئەفلاتۆن و ئەرستۆی نوێدا) و لە بواری (منطق)دا چڕبووبوونەوە، كە ئەسكەندەریە لە سەردەمی چوارەمی زاینییەوە بە پێشەنگی مایەوە تا سەردەمی دوای ((فتوحات))ی ئیسلامیش، بەم جۆرە ئەم بارە لە ئەسكەندەریەدا مایەوە تا لە سەدەی شەشەمی زاینیدا گەیشتەوە ترۆپك، كاتێك لە ساڵی (٥٢٩ز)دا هەندێك لەو فەیلەسوفە هەڵاتووانەی (أثینا) كە لە ئەنجامی داخستنی خوێندنگاكانیانەوە بۆ وڵاتی فارس هەڵاتبوون، ڕوویانكردە ئەسكەندەریەو لەوێ نیشتەجێ بوون [1]. ئەمەش پاڵنەرێك بوو بۆ دووبارە بوژاندنەوەی فەلسەفە و شارستانیەتی یۆنانی لەم شارەدا.

هەرچی پەیوەندی بە خوێندن و لێكۆڵینەوەی لایەنی پزیشكییەوە هەبوو لە ئەسكەندەریە، ئەوا خوێندنگایەكی تایبەتی هەبوو كە بە خانەی زانست (دار العلم) ناسرابوو، كە كۆمەڵێك پزیشك بەڕێوەیان دەبرد پێیان دەگوترا (الأسكندرانیون)، كە كتێبەكانی (جالینوس)یان كردبووە بابەتی سەرەكی بۆ خوێندن، سەرباری ئەمانەش چەندین (كۆكردنەوە ڕاڤە و كورتكردنەوە)یان لە خوێندنگاكانیاندا بۆ كتێبەكانی ئەم فەیلەسوفە پزیشكە ئەنجامدا، كە بوونە پێشینەیەكی زۆرباش بۆ زانستە پزیشكییەكان بۆ سەردەمی خۆیان و سەردەمانی پاش خۆشیان، بە تایبەتیش شارستانیەتی ئیسلامیی، لە دیارترین پزیشكانی ئەم قوتابخانەیەش كە لە سەردەمی

ماكس ماير هوف: من الاسكندرية الى بغداد، مقال من كتاب التراث اليوناني في الفكر الإسلامي، تاليف و ترجمة. د. عبدالرحمن بدوي، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٤٦م، ل ٤٠ — ٤١.

(١)د. حنا سمير صادق: م.س، ل ٤٧ — ٥٢" د. سعد عبدالله الضبيعان: م.س، ص٣٨ — ٤٠ " د.ماكس ماير هوف: م.س، ل ٤٢ — ٤٣.

**ئیسلامیدا ڕۆڵیان بینی (ماغنس الأجانیطي) و (أهرن القس) بوون، کە یەکەمیان هەردوو کتێبی (کناش في الطب) و (کتاب علل النساء)ی دانا و لەم بوارەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو[1].**

**سەرباری فەلسەفە و پزیشکی، ئەسکەندەریە چەندین زانستی تری وەك گەردوونناسی و کیمیای تیادا دەرکەوتووە و بەم جۆرەش دەبینین ئەسکەندەریە لە پێش (فتوحات)ی ئیسلامییەوە ناوەندی زانستی وشارستانیەتی یۆنانی بووە. ئەم بارە لە پاش (فتوحات)ی* ئیسلامییش بەردەوام بوو تا سەردەمی ئومەوی و**

---

(١) ابن الندیم: الفهرست، ص٢٩٣ " القفطي: اخبار العاماء،ص٧١ " د.أحمد عبدالحلیم عطیة: جالینوس في الفکر القدیم والمعاصر، القاهرة، دار أنباء للطباعة والنشر / ١٩٩٩م، ص٣٤ – ٤١ " لطفي عبدالوهاب یحیی: م.س،ل ٤٩ – ٥٠ " د.ماکس مایرهوف: م.س، ل ٥١ – ٥٢.

* ئەسکەندەریە دووجار لەلایەن سوپای ئیسلامییەوە لە سەردەمی (عمر بن الخطاب ١٣ – ٢٣ك) دا فەتح کراوە، جاری یەکەم لە ساڵانی (٢٠ -٢١ك) بە سەرکردایەتی (عمرو بن العاص)، پاش ئەوەی بۆ ماوەی سێ مانگ گەمارۆی ئەم شارەیان دا بە ڕێککەوتن کۆتایی هات و فەتحیان کرد، ئەویش (مقوقس)ی حاکمی ئەسکەندەریە پێشنیازی (جزیە)ی کرد بۆ (عمرو بن العاص) لە جێی ئەوەی زەوییەکانیان بۆ بگێڕنەوە و هەروەها ڕێگەیان بدەن لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە (عمرو)ش پاش پرسکردنی بە (عمر بن الخطاب) ڕازی بوون و شارەکە فەتح کرا و (عبدالله بن حذافة بن قیس) دانرا بە والی، بەڵام پاش جێهێشتنی ئەم شارە لەلایەن سوپای مسوڵمانانەوە و گەڕانەوەیان بۆ (الفسطاط)، ڕۆمەکانی ئەسکەندەریە کەمی ژمارەی مسوڵمانان بەهەل زانی و پەیوەندی بە (قسطنطین بن هرقل)ەوە دەکەن بۆ ئەوەی بەهانایانەوە بچێت، ئەویش سوپایەکی گەورە بەسەرکردایەتی (منوئیل)، کە هاوڕێیەکی نزیکی خۆی دەبێت بە ژمارەیەکی زۆر لە کەشتیگەلەوە دەنێرێت بۆ ئەسکەندەریە، کاتێك (عومەر) بەمە دەزانێت سوپایەکی زۆریان بۆ دەنێرێت و پاش شەڕێکی گەورە بەسەر ڕۆمەکاندا سەردەکەون و لەساڵی (٢٣ – ٢٥) دووبارە ئەسکەندەریە فەتح دەکرێتەوە. الواقدي: فتوح الشام، دار الجیل، بیروت، (د.ت)، ج٢، ص٧٤ " ابن عبدالحکم: فتوح مصر و المغرب، تح. عبدالمنعم عامر، الهیئة العامة لقصر الثقافة، مصر، ج١، ل ١٠٦ – ٢٣٥ – ٢٣٩ " أبو القاسم المصري: فتوح المصر وأخبارها،تح. محمد الحمیري، دار الفکر، بیروت، ١٤١٦ هـ – ١٩٩٦ م، ص١٥٤ – ١٥٩، ٣٠٠ – ٣٠٤ " البلاذري: فتوح

یەکەمی عەبباسییەکانیشی گرتەوە، ئەوەی لەم باسەدا لێرەدا بەلای ئێمەوە گرنگە ئەوەیە کە هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن یەکەم بەیەکگەیشتنی شارستانیەت و کلتوور و زانستی یۆنانی لە ڕێگای ئەسکەندەریەوە، بریتییە لەو دەقەی کە باس لە سووتاندنی کتێبخانەی ئەسکەندەریە دەکات لەلایەن سوپای مسوڵمانانەوە لەسەر دەستی (عمرو بن العاص)، بە فرمانی (عمر بن الخطاب ١٣ — ٢٣ك) کە وتوویەتی ئەو کتێبانە هەرچییەك بن ئەوا ئێمە باشترمان لایە، لێرەدا ئێمە بە پێویستی دەزانین لەسەر ئەم دەقە کەمێك بوەستین، چونکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە، پاش لێکۆڵینەوەی وردمان بە نێو سەرچاوەکاندا گەیشتینە ئەوەی ئەم ڕیوایەتە دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە بەڵگەی لۆژیکی کە بنەمای دەرخستنی ڕاستییە مێژووییەکانەو لە بابەتی فەلسەفەی مێژوودا پشتی پێدەبەسترێت، دەبێتە پاڵپشتی ئەم بۆچوونەمان، بەهەرحاڵ ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەماندا گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

١- ئەم هەواڵە بۆ یەکەم جار لەلایەن مێژوونووس (عبداللطيف البغدادي م.٦٢٦ك / ١٢٢٨ز)[١] کە مێژوونووسێکی (متأخر)ە هاتووە، پاشان بەدوای ئەمدا هەریەك لە مێژوونووسان (إبن القفطي م.٦٤٦ك/ ١٢٤٨ز)[٢] و هەروەها (تقي الدين المقريزي ٨٤٥ك/١٤٤١ز)[٣] باس کراوە و لێرەوە ئەم هەواڵە بووە بە باو، لێرەدا پرسیاری لۆژیکی ئەوەیە ئەگەر ڕووداوێکی وا بوونی هەیە بۆچی مێژوونووسانی پێش

البلدان، تح. رضوان محمد رضوان، دار الكتب العلمية، بيروت، ل ٢٢٥ — ٢٢٧ " الطبري: تاريخ الرسل و الملك، ج٢، ص٣٦٠" إبن الجوزي: المنتظم، دار الصادر، بيروت، ١٣٥٨هـ، ط١، ج٤، ص ٢٩١ " المقريزي: المواعظ و الاعتبار (الخطط المقريزية)، مطبعة بولاق (١٢٩٤هـ)، ل ٢٠٣ — ٢٠٧.

(١) الإفادة والإعتبار في الأمور المشاهدة و الحوادث المعاينة بأرض مصر، مطلعة وادي النيل،القاهرة، ١٢٨٦هـ، ص٢٨.

(٢) أخبار العلماء، ل ٣٥٤ — ٣٥٦.

(٣) المواعظ و الاعتبار، ج١، ص١٥٩.

ئەمان وەك (الواقدي م.٣٠٧ك / ٨٢٢ز) و (أبو القاسم المصري م.٢٥٧ك / ٨٧٠م) و (البلاذري م.٢٧٩ك / ٨٩٢ز) و (الطبري م.٣١٠ك/ ٩٢٢ز) و (إبن الجوزي م.٥٩٧ك/١٢٠٠ز) و ئەوانی تریش کە بە تایبەتی باسیان لە (فتوحات)ی ئیسلامیی کردووە بۆ ئەم شارە و زۆر بەوردی سەرجەم لایەنەکانی ئەو (فتوحات)ەیان ڕوون کردۆتەوە، لە بابەتێکی وەها نەدواون، کەچی لە پاش نزیکەی (٦٠٠) ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا، باس لەم بابەتە دەکرێت، ئایا ئەمە نابێتە هۆی لاوازبوونی بابەتەکە.

٢- ئەو لێکۆڵینەوە زانستییە نوێیانەی لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسانەوە ئەنجامدراون گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە لە پێش (فتوحات)ی ئیسلامییەوە بۆ شاری ئەسکەندەریە ئەم کتێبخانەیە سووتاوە و نەماوە، بۆ ئەمەش لەنێوان زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناساندا هاودەنگییەك هەیە، ئەگەر ڕادەی چاوکراوەیی و زیرەکی ڕۆژهەڵاتناسانیش بزانین بەتایبەتی بۆ ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامیی، ئەوا ئەم بابەتەمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە[1].

بەهەرحاڵ ئێمە پێمان وایە یەکەم پەیوەندی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامییەوە لە ڕێگای ئەسکەندەریەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئومەوییەکان، کاتێك یەکێك لە میرەکانی ئومەوییەکان بەناوی (خالد بن يزيد بن معاوية)کە بە یەکەم کەسی عەرەبی دادەنرێت کە بایەخدانێکی تایبەتی هەبوبێت بە زانست لەسەردەمی خۆیدا، بەتایبەتیش بە کیمیا، ئەمەش پاش ئەوەی خۆی بۆ زانست یەکلایی کردەوە، ئەم میرە پەیوەندی کرد بە زاناو فەیلەسوفانی ئەسکەندەریەوە بۆ ئەوەی کە کتێبی لە بواری (الحكمة) بۆ وەربگێڕن و سەرباری

(١) الفريد بتلر: م.س، ص٣٤٨ – ٣٦٩ " ول ديورانت: قصة الحضارة، (عصر الايمان)، ج٢، ٢٦١ – ٢٦٣" غوستاف لوبون: حضارة العرب، ل ٢١٣ " جاك ريسلر: الحضارة العربية، ص١٠٠ – ١٠١ " = = د.ماكس مايرهوف: م.س، ص٥٣ " ادوارد براون:الطب العربي، تر. احمد شوقي حسن، القاهرة، ١٩٦٦م، ل ٣٤.

ئەوەی لەلای هەندێکیشیان زانستەکانی خوێندووە[1]، هەروەها کاتێک کە (عمر بن عبدالعزیز ٩٩-١٠١ك، ٧١٧-٧١٩ز)، لە سەردەمی خەلافەتی (سلیمان بن عبدالملك ٩٦ - ٩٩ك، ٧١٤ - ٧١٧ز)دا والی دەبێت لە میسر، پەیوەندی دەکات بە خوێندنگای ئەسکەندەریەوە و زۆر مەیلی بەلای (دراسات)ی یۆنانیدا دەبێت، لەوێ پەیوەندییەکی زۆرباش لەگەڵ (إبن أبجر الكناني) پەیدا دەکات کە یەکێك دەبێت لە مامۆستا دیارەکانی فەلسەفەی یۆنانی لە خوێندنگای ئەسکەندەریە، هەروەها پزیشکێکی لێهاتووی سەردەمی خۆشی دەبێت و زۆر لێیەوە نزیك دەبێت، بە جۆرێ کە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن ئەم کەسایەتییە لە دواجاردا مسوڵمان بووە، بۆیە لەو کاتەدا کە (عمر بن عبدالعزیز)، دەبێت بە خەلیفە، بڕیاردەدات کە خوێندنگای ئەسکەندەریە بگوێزێتەوە بۆ شاری (ئەنتاکیە)[2]، ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك بووە، لە دیارترینیان نزیکی شاری (ئەنتاکیە) لە ناوەندی دەسەڵاتی خەلافەتی ئومەوییەکانەوە کە (دمشق) بووە، هەروەها دووری ئەسکەندریەش لەو ناوەندەوە، هەروەها لەپاش (فتوحات)ی ئیسلامیشەوە بەتایبەتی بە هۆی ئەو ڕووداوانەی بەسەر ئەو شارەدا هات لەکاتی (فتوحات)دا، ئەمە سەرباری ململانێ بەردەوامەکانی ڕۆمانی و ئیسلامیی لە ئەسکەندەریە و بەرەبەرە بایەخدانی (قبطي)یەکان بەم خوێندنگایە دای لە کزی، و هەروەها ژمارەی ئەو زاناو فەیلەسوفانەی کە (یۆنانییان)بە باشی دەزانی کەم بوونەوە، بۆیە شارەکە ئەو

---

(١) ابن النديم: م.س، ص٢٤٢ " فاضل خليل إبراهيم: خالد بن يزيد سيرته و اهتماماته العلمية - دراسة العلوم عند العرب، ص٢٦ " د.محمد حسين الزبيدي: المراكز الثقافية التي اثرت في الفكر العربي و الاسلامي، المجلة التاريخية، العدد الرابع، سنة ١٩٧٥م، ص٤٥٤.

(٢)المسعودي: التنبيه والإشراف، تح. عبدالله إسماعيل الصاوي، دار التراث - بيروت، ١٩٦٨م، ص ١٠٥ - ١٠٦ " مروج الذهب و معادن الجوهر، دار الأندلس، بيروت، ١٩٦٦م، ج١، ص٣٤٢ " ابن أبي أصيبعة: عيون الأنباء في طبقات الأطباء، ص٦٠٤ " خودابخش: الحضارة الاسلامية، تر. د.علي حسني الخربوطلي، دار أحياء الكتب العربية، ١٣٨٠ هـ - ١٩٦٠م، ص١٥٣ - ١٥٤ " د.عبدالفتاح احمد فؤاد: م.س، ص٦٤ - ٦٩.

گرنگییەی نەماو بەڵکو شاری (فسطاط) بوو بە ناوەندی دەسەڵاتی ولایەتی میسر، هەروەها مەیلی خەلیفە (عمر بن عبدالعزیز) خۆشی بەلای زانست و بنەماکانی شارستانیەتی یۆنانیدا و ڕۆیشتنی (أبجر الكناني) لەگەڵ خەلیفەدا بۆ (دمشق)، لە هۆکارە دیارەکانی گواستنەوەی ئەو خوێندنگایە بوون بۆ (ئەنتاکیە)، بەڵام هەڵبژاردنی ئەم شارە سەرباری ئەو هۆکارانەی سەرەوە، چەند هۆکارێکی تایبەتیشی هەبوو لەوانە ئەم شارە لە ئاسیای بچووکەوە نزیك بوو کە لەوێوە دەتوانرا بە ئاسانی دەستنووسە (یۆنانییە)کان بەدەست بکەوێت کە لەم سەردەمەدا زیاتر بەوەرگێڕانەوە خەریك بوون لە (یۆنانی)یەوە بۆ زمانی (سریانی)، بەم جۆرە ئەم خوێندنگایە ماوەیەکی زۆر بەتایبەتی لە سەردەمی ئومەوییەکاندا لە (ئەنتاکیە)مایەوە و تا دواجار گواسترایەوە بۆ شاری (حران)[1].

بەڵام ڕۆڵی (ئەسکەندەریە) زیاتر لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا دەرکەوت، کاتێك بەرهەمی زۆرێك لە فەیلەسوف و زانایانی گەورەی (ئەسکەندەریە)، وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی و هەروەها لە چەند دەقێکدا باس لەوە دەکرێت کە خەلیفە (أبو جعفر المنصور ١٣٦ – ١٥٨ / ٧٥٣ – ٧٧٤ز) پەیوەندی بە پزیشکانی ئەسکەندەریەوە هەبووە، هەروەها کاتێکیش لە سەردەمی خەلیفە (هارون الرشيد ١٧٠ – ١٩٣ز / ٧٨٦ – ٨٠٨ز)دا کەنیزەك(جاريە)یەکی میسری نەخۆش دەکەوێت، دەنێرێت بە شوێن (بليطان)دا کە بگریکی ئەسکەندەریە دەبێت و هەروەها پزیشکێکی کارامەی سەردەمی خۆشی بووە بۆ ئەوەی چارەسەری کە نیزەکەکەی بۆ بکات[2].

---

(١) د.ماكس مايرهوف: م.س، ص٦٨ – ٦٩ " د.أميرة حلمي مطر: الفكر الاسلامي و التراث اليوناني، ص٨٤ – ٨٥.

(٢) د.فاطمة مصطفى عامر: تاريخ أهل الذمة في مصر الاسلامية من الفتح العربي الى نهاية العصر الفاطمي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ٢٠٠٠م، ج٢، ص٢٤٧ " الزبيدي: م.س، ص٢٥٤ – ٢٥٥.

لەم بابەتەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەسکەندەریە بەو پێیەی کە یەکێك بوو لە ناوەندە گەورەکانی شارستانیەتی یۆنانی بەتایبەتی لە سەردەمی هیلنستیدا، توانی لەپاش پرۆسەی (فتوحات)ی ئیسلامییەوە بۆی، کاریگەرییەکی گەورەی لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی هەبێت بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، چ لە ڕێگای خوێندنگاکەیەوە بێت بە پەرەپێدانی شارستانیەتی یۆنانی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامیدا، یان بە وەرگێڕانی زانست و کلتووری شارستانیەتی یۆنانی بێت بۆ ناو شارستانیەتی ئیسلامیی.

**دووەم: ئەنتاکیە:**

یەکێکە لە شارە یۆنانییە کۆنەکان، لەڕووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە دەکەوێتە یۆنانیی شاری (حلب)، لەسەر ڕووباری (العاصي) کە لەلایەن ڕۆمانەکانەوە بە (ئۆرنت Oronte) ناسراوە و نزیکە لە دەریای ناوەڕاست[1].

لە ڕووی بنیاتنەری ئەم شارەوە، لەلایەن (البلدان)یەکانەوە چەند بۆچوونێکی جیاواز هەیە، هەندێکیان پێیان وایە لەلایەن (سلوقوسی یەکەم) لە (کۆتایی سەدەی چوارەمی پ.ز) بنیاتنراوە و بەناوی باوکییەوە ناوی ناوەو کردوویەتی بە پایتەختی دەسەڵاتی خۆی[2]، هەندێکیتر دەڵێن لەلایەن (بطلیموس بن هیفلوسی دووەم) کە یەکێك بووە لە پادشاکانی گریك، بنیاتنراوە، هەندێکیش پێی وایە لەلایەن (أنطخن) ناوێکەوە بنیاتنراوە و بەناوی خۆیەوە بووە پاشان تعریب کراوە بۆ (ئەنتاکیە)[3]،

---

(١) إبن سعد المغربي: الجغرافيا، بيروت، ١٩٧٠م، ص٥٢ " الحميري: الروض المعطار في خبر الأقطار، تح. د.إحسان عباس، مؤسسة ناصر للثقافة، بيروت، ط٢، ١٩٨٠، ص٣٨ " مؤلف مجهول: الأماكن الواردة في البداية و النهاية لإبن كثير، ص٧٢، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی: www.al-islam.com.

(٢) المسعودي: التنبيه والاشراف، ص١١٦ " الحميري: م. س، ص٣٨ " مؤلف مجهول: م. س، ص٧٢ " د.صابر محمد دياب: المسلمون والجهاد ضد الروم في أرمينية و الثغور الجزيرة و الشامية خلال القرن الرابع الهجري، مكتب السلام العالمية، القاهرة، ١٤٠٤ هـ، ١٩٨٤م، ص٢٦.

(٣) المسعودي: التنبيه و الاشراف، ص١١٦.

هەروەها دەڵێن لە لایەن (أنطاكية بنت الروم بنت اليقن بن سام بن نوح) بنیاتنراوە[1] و دەڵێن لەلایەن (أسكندر بن أنطيخس)ەوە[2]، بەڵام پێدەچێت ڕاستترین بۆچوون ئەوە بێت، کە دەڵێت: ((پادشا أنطيغنوس لەسەر ڕووباری أورنگس شارەکەی بنیاتنا و ناوی نا (أنطوخيا)، پاشان سلوقوس تەواوکاری تیادا کرد و زەخرەفەی تیادا کێشاو بەناوی کوڕەکەیەوە (أنطيخوس)، ناوی نا أنطاکیا))[3].

ئەم شارە لەپێش فەتحکردنییەوە لەلای عەرەبەکان گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، بەجۆرێك بە بایەخ گرتوویانە هەر شتێکی گرنگ و بەنرخیان ببینیایە دەیانگوت ئەوە هی (ئەنتاکیە)یە ! !، شایەنی باسە لە نێوان (بلدانییەکان)دا، هاودەنگییەك هەیە سەبارەت بە چۆنیەتی پێشکەوتن و پەرەسەندنی شارستانیەتی ئەم شارە، کە بیناکانی جوان و ڕازاوە بوون و منارەو قەڵاکانی پتەو بوون و بەسەر ڕووبارەکەدا ڕوانیوویانە، هەروەها باس لە بایەخی کراوە لە ڕووی ئابووری و هەڵکەوتەی شوێنەکەیەوە، هەروەك لە باسی سەرچاوەکانی ئاو و ڕەز و باخ و بێستانەکانیدا، دەڵێن کە لە سەردەمی خۆیدا وێنەی نەبووە، بەجۆرێ کە لە پاش دیمەشق بە پاکترین و ڕازاوەترین شارەکانی (شام)ی دادەنێن[4].

---

(١) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج١، ص١٨٢ " القزويني: آثار البلاد و أخبار العباد، ص٥٩ " أبو الفدا: المختصر في اخبار البشر، ج١، ص٨٤.

(٢) الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ج١، ص٢٣٦.

(٣) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج١، ص١٨٢" إبن العديم: بغية الطلب في تاريخ حلب، تح.د.سهيل زكار، دار الفكر، (د.ت)، ج١، ص٨١ " ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، دار القلم، بيروت، ١٤٠٤ هـ، ١٩٨٤م، ج٢، ص٢٢٨.

(٤) ابن عبد ربه: العقد الفريد، ج٦، ص٢٦٨ " الادريسي: نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، تح.د.علي المنتصر الكتاني، عالم الكتب - بيروت، ١٩٨٩م، ص٦٤٥، ج١، ص٩١ " ابن الجوزي: م.س، ج١، ص٩٧ " الحميري: م.س،ص٣٨ " مؤلف مجهول: شذرات من كتب المفقودة في التاريخ " تح.د.إحسان عباس، دار الفكر الاسلامي، بيروت، ط٣، ١٩٨٨م، ج٢، ص٤٤١.

ئەنتاكیە هەر لە سەردەمانی زووەوە یەكێك بووە لە ناوەندە زانستییە گرنگەكانی شارستانیەتی یۆنانی، كە تیایدا بیر و فیكر و شارستانیەتی یۆنانی چەكەرەی كردووە، بۆ نموونە (یوسطاثیوس)، كە ئەسقەفی (ئەنتاكیە) بووە لە ساڵی (٣٣١ز) دا خوێندنگایەكی لەسەر شێوازی خوێندنگای گەورەی ئەسكەندەریە دامەزراندووە، لەپاش خۆشی كەسایەتییەك بەناوی (ثیودور) لە ساڵی (٣٩٢ز)، لەگەڵ ژمارەیەك لە خوێندكارانیدا ئەم خوێندنگایەی زیندووكردووەتەوە و گرنگی پێداوە، ئیدی لێرەوە ئەم خوێندنگایە بووەتە ناوەندی شارستانیەتی زانستی یۆنانی، كە بە خوێندن و دیراسەكردنی زانستی ئاینی و فەلسەفەی یۆنانی ناوبانگی دەركردبوو، ئەمە سەرباری خوێندن و پەرەپێدانی زانستی پزیشكی تیایدا كە بەدەستی پیاوانی ئاینییەوە بوون[1].

ئەم شارە لە سەردەمی (عمر بن الخطاب) و بە سەركردایەتی (أبوعبيدة بن الجراح) كە یەكێك بووە لە سەركردە دیارەكانی سوپای ئیسلامیی لە ساڵی (١٦ك)دا پاش گەمارۆدانێكی زۆر بە رێككەوتن و بە دانی (جزیە) فەتح كراوە، ئەمەش بەهۆی قایمی قەڵاكانی شارەكەو هەروەها كۆبوونەوەی پاشماوەی سوپا شكاوەكەی رۆم بە (هرقل)ی سەركردەشیانەوە لە (ئەنتاكیە) دا، لە پاش شەڕی (یرموك) كە مسوڵمانان سەركەوتبوون[2].

---

(١) اوليري: العلوم اليونانية وسبل نقلها الى العربية، ص٦٢، ٦٣ " د.ماكس مايرهوف: م.س، ص٦٩ – ٧٠ " يعقوب بن توما سويريوس: تاريخ الكنيسة السريانية الأنطاكية، مطبعة دار الكتب، ١٩٥٣م، ج١، ص١٥٨.

(٢) الواقدي: م.س،ج١،ص١١٦ " خليفة بن خياط: تاريخ خليفة بن خياط، تح.د.أكرم ضياء العمري، دار القلم – مؤسسة الرسالة، دمشق – بيروت، ١٣٩٧ هـ، ج١،ص١٣٤ – ١٣٥ " البلاذري: م.س، ل ١٥٢ – ١٥٣ " أبو الفداء: اليواقيت والضرب في تاريخ حلب، ج١، ص٤، وەرطيراوة لـة سايتى ئينتـةرنيَتى www.alwarraq.co " النويري: نهاية الأرب في فنون الأدب، ج٨، ل ٢٦٥، ٢٦٨، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی: www.alwarraq.com " جوزيف نسيم يوسف: الاسلام والمسيحية وصراع القوى بينهم في العصور الوسطى، ص٣٨.

بەڵام یەکەم بەیەکگەیشتنی لایەنی شارستانیەتی ئیسلامیی بە شارستانیەتی یۆنانی لە ڕێگای ئەم شارەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (عمر بن عبدالعزيز) کاتێك خوێندنگای ئەسکەندەریەی بۆ گواستەوە هەروەك لە باسی ئەسکەندەریە دا لێی دواین، بەڵام سەرباری خوێندنگا لە (ئەنتاکیە) چەندین دێر و ناوەندی بچووك هەبوون کە ڕۆڵیان هەبوو لە بەرەو پێشبردنی زانستی ئایینەکان (علم اللاهوت)، هەروەها زیندوکردنەوەی زمانی یۆنانی و کلتوورەکەیدا، لە دیارترین ئەو کەسایەتییانەش کە لەم بوارەدا لە سەردەمی ئومەوییەکاندا ڕۆڵیان هەبووە (يعقوب الرهاوي* ) بووە، کە لە قوتابخانەی دێر (یوصیبنا) لە (ئەنتاکیە)دا وانەی وتووەتەوە، ئەم دێرانە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا زیاتر کارەکانیان لە وەرگێڕان و گواستنەوەی بیری فەلسەفەی یۆنانی بۆ زمانی عەرەبی کورت بووبووەوە[1].

هەروەها لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، ئەم ناوەندە بەهۆی هەڵکەوتە جوگرافییەکەیەوە کە لەسەر سنووری نێوان ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی و ئیسلامیی بوو، هەروەها بەهۆی نزیکی لە ئاسیای بچووکەوە، بوو بووە ناوەندێکی باش بۆ وەرگێڕە کارامەکانی دەوڵەتی عەبباسی تا لێیەوە چەندین دەستنووسی بە نرخی یۆنانییان دەست بکەوێت، یان ئەو دەستنووسانە تەواو بکەن کە چەند بەشێکی لای

* يعقوب الرهاوي: یەکێکە لە زانا و فەیلەسوفە دیارەکانی سەردەمی خۆی کە شارەزاییەکی تەواوی لە زمان و کلتوری یۆنانیدا هەبووە، لە ساڵی ١٢ك/ ٦٣٣ز لە (أنطاكية) لە دایك بووە و پاشان سەردانی ئەسکەندەریەی کردووە و لەوێ زانستەکانی خوێندووە، هەروەها چەندین پۆست و پلەو پایەی ئاینیی وەرگرتووە و لە زۆرێك لە دێرەکاندا وانەی وتووەتەوە، لە ساڵی ٩٠ك/ ٧٠٨ز دا کۆچی دوایی کردووە. أفرام الأول برصوم: اللؤلؤ المنثور في تاريخ العلوم و الآداب السريانية، مطبوعات مجمع اللغة السريانية، بغداد، ١٩٧٦، ص٢٩٢ – ٢٩٣.

(١) دائرة المعارف الاسلامية مادة (أنطاكية)، تر. أحمد الشنتناوي،ج٣، ل ٦٢ " دیلاسي أولیري: الفكر العربي، ص٤٦.

خۆیانەو بەشەکانی تری دیار نەبووە، توانیویانە لە ڕێگای ئەم ناوەندەوە بەدەستی بخەن[1].

بەم شێوەیەش ئەم شارەش بۆخۆی توانی ببێتە یەکێك لەو ناوەندانەی کە ڕۆڵی هەبێت لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، ئەمەش پاش تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی شارستانیەتەکەیان لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامیدا.

**سێیەم: حران:**

یەکێکە لە شارە بەناوبانگەکانی هەرێمی (جزیرة آقور) (الجزیرة الفراتیة)، پایتەختی (دیار مضر)ە، کەوتووەتە سەر ڕێگای بازرگانی موسڵ و شام و ڕۆم، سەرچاوە (بلدانیەکان) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە سروشتێکی تا ڕادەیەك وشك و گەرمی هەبووە و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کەمتر دار و درەختی تیادا بڕوێت[2]، لە بارەی سەرەتای بنیاتنانی ئەم شارەو هەروەها بنیاتنەرەکەشیەوە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان مێژوونووساندا هەیە، هەندێکیان دەڵێن کە ئەم شارە لەبەر وشکی و گەرمی ئاو و هەواکەی ناونراوە (حران)[3]، هەروەها هەندێکیان پێی وایە کە (هران)ی برای (ئیبراهیم) پێغەمبەر بنیاتی ناوەو بەناوی ئەوەوە ناسراوە و لە پاشدا تعریب کراوە و بووە بە (حران)[4]، هەندێکی تر دەڵێن کە (نوح) پێغەمبەر پاش لافاوەکە ئەم شارە و قەڵاکەی بنیاتناوە[5]، هەروەها دەڵێن کە یەکێك لە نەوەکانی (نوح)

---

(١) د.رشيد الجميلي: حركة الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنين الثالث و الرابع للهجرة، دار الحرية للطباعة – بغداد، ١٩٨٦م، ص٢٠٦، ٢٠٧ " د.ماكس ماير هوف: م.س، ص٦٩.

(٢) البلاذري: م.س " ص١٧٨ " ابن جبير: رحلة ابن جبير، دار التراث، بيروت، ١٩٦٨م، ص١٩٧ " ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص٢٣٩.

(٣) ابن جبير: م.ن، ص١٩٧.

(٤) الاصطخري: مسالك الممالك، ص٥٤ " ابن حوقل: صورة الأرض، دار المكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٩م، ص٢٠٤.

(٥) الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ج١، ص٢١٣.

بەناوی (قنان بن ارفخشد) بنیاتی ناوە و بەناوی (هـران)ی کوڕییـەوە نـاوی نـاوە[(١)]، بـەڵام دۆزەرەوە شـوێنەوارییە نوێیـەکان، دەقێکـی مێخییـان دۆزیوەتـەوە بـە نـاوی (حرانو) کە بە مانای ڕێگا دێت، ئەمـەش لـە ڕاسـتییەوە نزیکـە، چـونکە ئـەم شـارە سەرە ڕێگای بازرگانی بووە[(٢)].

(حران) لە سـاڵی (٣٣٦ پ.ز) لەلایـەن (ئەسـکەندەری مەکـدۆنی)یـەوە دەسـتی بەسەردا گیرا، لە ئەنجامی ئەمەشەوە ژمارەیەکی زۆر لە یۆنانی لەم شارە نیشتەجێ بـوون، لێـرەوە ئیـدی بـیر و فیکـر و فەلـسەفە و ئـایینی یۆنـانی لـەناو ئـەم شـارەدا بڵاوبووەوە کە ئاینی (وثنیة) بت پەرستی بوو، هەروەها (حـران) بـوو بـە یـەکێك لـە ناوەندەکانی شارستانیەت و فیکری یۆنانی لە سـەردەمی هیلنـستیدا[(٣)]. بـەم جـۆرە ئەم شارە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی لەلایەن ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییـەوە داگیرکـرا، بەڵام ئەوەبوو کە خەڵکەکە ڕازی نـەبوون بـبن بـە مەسـیحی و لەسـەر ئـاینی خۆیـان مانـەوە، بۆیـە وەك گاڵتەجاڕییـەك لەلایـەن مەسـیحییەکانەوە بـەم شـارە دەگـوترا (هیلینۆپۆلس) بە واتای (بتپەرستەکان)، لێـرەوە ئیـدی ئـەم شـارە بـووە ناوەنـدێك هەرکەسێك لە یۆنانییەکان یان لـە خـەڵکانی تـری ئیمپراتۆریـەتی ڕۆمـانی بـە ئـاینی مەسیحی ڕازی نەبووایە بەرەو(حران) هەڵئـەهات و تیایـدا نیـشتەجێ دەبـوون، بۆیـە ئاینی ئەم شارە تێکەڵەیەك بوو لە ئاینی یۆنانی کۆن و بابلی و ئەفلاتۆنیەتی نوێ[(٤)]،

---

(١) ابن قتيبة الدينوري: عيون الأخبار، القاهرة، ١٩٦٣م، ص٢١٤ – ٢١٥ " إبن العبري: تـاريخ مختصر الدول، ص١٠ " الحميري: الروض المعطار،ص١٩١.

(٢) محمد عبدالحميد الحمد: صابئة الحران وإخوان الـصفا، دمـشق، ١٩٩٨م، ص٧ " د.محمـد حـسين الزبيدي: م.س، ص٤٥٧.

(٣) د.كامل مراد: تاريخ الأدب السرياني منذ نشأته حتى الفتح الاسلامي، دار المقتطف، لقاهرة، ١٩٤٩م، ص٤٠ " د.الشحات السيد زغلول: السريان والحضارة الاسلامية، ص٥١ " دائرة المعـارف الاسلامية مادة (حران) و مادة (صابئة).

(٤) د.ماكس مايرهوف: م.س، ص٧١، ٧٢ " أحمد امـين: ضـحى الاسـلام، دار الكتـاب العربـي، بيروت، (د.ت)، ط١٠، ص٢٥٦-٢٥٧.

جێگای باسە ئەم بیروباوەڕە تا پاش (فتوحات)ی ئیسلامیش لەناو (حران)یەکاندا هەر مایەوە، چونکە کاتێك کە (حران) فەتح کرا لەلایەن سوپای ئیسلامەوە بە سەرکردایەتی (عیاض بن غنم الأشعري) لە ساڵی (١٨ك) دا، پاش گەمارۆدانی ئەم شارە بۆماوەی چەند ڕۆژێك، نوێنەری شارەکە هات بۆلای و تیایدا داوای ڕێککەوتنی لێکردن، بۆیە ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کە یارمەتییان بدەن بۆ ئەوەی لە شارەکەیانەوە بپەڕنەوە بۆ (روها) پاش فەتحکردنی (روها) لە پاداشتدا، مسوڵمانان بڕیاریان دا کە ڕێگەیان بدەن بە ئازادی بیروباوەڕەکەیان پێڕەو بکەن بەو مەرجەی کە (جزیە) بدەن و بە ڕێککەوتن شارەکەیان فەتح کرا[1].

بەم جۆرە لەسەر ئاینەکەی خۆیان مانەوە تا سەردەمی یەکەمی عەباسییەکان کاتێك خەلیفە (مأمون) لە دواساڵەکانی تەمەنیدا بەرەو (دیار مضر) دەڕوات بەمەبەستی غەزاکردن لەگەڵ ڕۆمەکان، لەوێدا چاوی بە نوێنەری خەڵککەی دەکەوێت لە جل و بەرگیان سەری دەسوڕمێت کە جیاوازبوون و هەروەها قژیان زۆر درێژ بووە، شێوەی کڵاوێکیان لەسەردا بووە، بۆیە پێیان دەڵێت: ئێوە کێن؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە خەڵکی (حران)ین و (جزیە)ش دەدەین، پێیان دەڵێ: بۆچی ئێوە مەسیحیین؟ دەڵێن: نەخێر، دەڵێ: ئەی جولەکەن؟ دەڵێن: نەخێر، دەڵێ: ئەی ئاینێکی دیاری کراو و پێغەمبەرێکتان نییە، وەڵامیان بۆ نادرێتەوە، بۆیە خەلیفە زۆر توڕە دەبێت و دەڵێت: کەواتە ئێوە (زندیق) بێدینن و خوێنتان حەڵاڵە، بۆیە یان دەبێت مسوڵمان ببن یان دەبێت ئاینێکی دیاریکراوی (أهل الكتاب) بۆخۆتان هەڵبژێرن، ئەگەرنا ئەوا کە هاتمەوە لێتان دەدەم، چونکە (جزیە) لە کەسێك وەردەگیرێت کە سەر بە (أهل الكتاب)بێت، بۆیە لێرەوە کەوتنە خۆیان و قژیان بڕی و بیریان لە چارەسەرێك دەکردەوە، تا پیاوێکی پیر بەلایاندا تێدەپەڕێت و پێیان دەڵێت ئەگەر خەلیفە گەڕایەوە بڵێن ئێمە سەر بە ئاینی

---

(١) الواقدي: م.س، ج٢، ٨٢ " البلاذري: م.س،ص٣٣٩ " د.حسين قاسم العزيز: دور المراكز الثقافية في تفاعل العرب و المسلمين، مستل من كتاب مهرجان أفرام – حنين، بغداد، ١٩٧٤، ص٣٩٨.

(صابئة)كانين، چونكە ئەمە ئاینێكی ئاسمانییە و لە قورئاندا ناوی هاتووە و بە (أهل الذمة) ئەژمار دەكرێن[1]، هەرچەندە خەلیفە (مأمون) لەو غەزایە نەگەڕایەوە، بەڵام ئیدی ئەم ئاینە لەناویاندا بڵاو بوویەوە، بەڵام سەرباری ئەوەی (صابئة) ڕەسەنەكان لە ناوچەكانی (عێراق) بوون و لە پاشماوەی بابلییەكان بوون، بەڵام (حران)یەكان هەرچەندە مەیلیشیان بەلای بت پەرستیدا هەبوو، بە شاری (صابیئەكان) ناسران[2].

سەبارەت بە باری زانستی لە ناو ئەم شارەدا، هەر لە سەردەمانی زووەوە خوێندنگایەكی (وثني) بتپەرستی تیادا بووە، بەڵام هیچ لە بارەی سەرەتای دامەزراندنی ئەم خوێندنگایەوە نازانرێت، كە ناوەندێكی سەرەكی كلتوور و شارستانیەتی یۆنانی بووە، هەروەها لە زانستەكانی بیركاری و گەردووناسیدا ناوبانگی دەركردبوو، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەستێرەپەرستی بەشێك بوو لە سرووتە ئاینییەكانیان[3].

هەروەك ئاماژەمان پێیدا، (حرانی)یەكان لە سەردەمەكانی دەسەڵاتی خەلافەتدا هەر لە ڕاشدینەكانەوە تا ئومەوییەكان و سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكانیش بە ئازادانە پێڕەوی بیروباوەڕەكانی خۆیان دەكرد و ئەمەش یارمەتیدابوون كە ڕۆڵیان هەبێت لە بەشداری كردن لە چەند پۆستێكدا و هەروەها لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامیی، بەتایبەتیش لە سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكاندا، بۆ نموونە لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور)دا، یەكێك لە نزیكترین ڕاوێژكارانی (عبدالملك بن حمد الحراني)بووە كە پلەی (كاتب)ی هەبووە،

---

(١) ابن النديم: الفهرست، ص٤٤٥.

(٢) أوليرى: الفكر العربي، ص٤١ " أحمد أمين: ضحى الاسلام، ص٢٥٩ " د.حسين قاسم العزيز: م.س،ص٣٩٨.

(٣) البيروني: الآثار الباقية عن القرون الخالية، مكتبة المثنى، بغداد، ١٩٦٤م، ص٢٠٤، ٢٠٥، ٢٠٦" حاجى خليفة: كشف الظنون، ص٢٧ " الشهرستاني: الملل و النحل، ج٢، ص٦٦٣ " محمد جاسم حمادي: الجزيرة الفراتية و الموصل دراسة في التاريخ السياسي و الاداري، دار الرسالة للطباعة – بغداد ١٣٩٧هـ – ١٩٧٧م، ١٨٩ – ١٩٤.

هــەروەها پــاش ئــەم (ســليمان بــن مخلــد الحرانـــي) جێگــای گرتووەتــەوە کــە کەســایەتییەکی فەیلەســوف بــووە و شــارەزاییەکی باشــی لــە پیــشەی کیمیــا و ئەستێرەناسیدا هەبووە. هـەروەها لـە سـەردەمی خەليفـە (المهـدي ١٥٨ – ١٦٩ك / ٧٧٤ – ٧٨٥ز)دا، (إبراهيم بـن ذکـوان) بـوو بـە کاتـب، بـەڵام لەسـەردەمی خەليفـە هارون الرشيد)دا، ئەم کەسایەتییە کە بە لادەر و بێ دين لە قەڵەم دراو بۆيە بڕيـاری کوشتنی بۆ دەردەکات، بەڵام لە پاشدا خەليفە پاشـگەز بـووەوە و بڕيـاری دا نـەفی بکات، سەرچاوەکان ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کاتێـك کـە خەليفـە (المـأمون ١٩٨ – ٢١٨ك / ٨١٣ – ٨٣٣ز) (حرانی)يەکان دەبينێـت ئـەم ڕووداوەی بيردەکەوێتـەوە لـە سـەردەمی (هـارون الرشـيد)دا و بۆيـە ئـەو بڕيارەيـان بەسـەردا دەدات کـە باسمـان کرد[(1)].

بەم جۆرە (حران)يەکان ڕۆڵێکی بەرچاويان هەبوو لە پێشخستنی شارستانيەتی ئيسلاميدا لە ڕێگـای خوێندنگاکەيانـەوە بـە تايبـەتی لـە بـواری وەرگێڕانـدا، چـونکە هەروەك باسمان کرد لەم شارەدا ژمارەيەکی زۆری يۆنانی هەبوون و زمان و کلتووری يۆنانيش لە خوێندنگايەکەياندا دەخوێندرا، هەروەها ئەم شـارە هـەر زوو تێکـەڵ بـە عەرەبەکان بوو بوون و ئەمەش وايکردبوو کە شارەزاييەکی يەکجار زۆريان هەبێت لە بواری زمانی عەرەبيدا، بۆيە وەرگێڕانەکانی (حران)يەکان وردتر و مانـادارتر بـوون[(2)] و بەتايبەتيش لە سەردەمی يەکەمی عەبباسـييەکاندا کـە لـە بوارەکـانی (بيرکـاری و گەردووننـاســی و پزيــشکيی)دا بابــەتيان وەردەگێــڕا بــۆ زمــانی عــەرەبی کــە خوێندنگاکـەيانی پــێ ناسـرابوو لـەم بوارەشـدا مامۆسـتايان و خوێنـدکارانی ئـەم خوێندنگايە ڕۆڵێکی گەورەيان بينی لە وەرگێڕانـی ئـەو زانستانەی يۆنانييـەکان، لـە ديارترين ئەوانەش (أبو عبدالله البتاني) بوو کە يەکێك بوو لە بـەناوبانگترين کەسـانی

---

(١) الجهشياري: الوزراء و الكتاب، تـح. عبـدالله إسماعيـل الـصاوي، القـاهرة، ١٩٣٨م، ص٦٥، ١٣٤.

(٢) ي. هل: الحضارة العربية، تر. د.إبراهيم أحمد عدوي، مكتبة أنجلو مـصرية، (د.ت)، ص١٠٦ " الجميلي: م.س، ص٢١٠ " خودابخش: م.س، ل ١٥٨.

بواری ئەستێرەناسی و بیرکاری و پزیشکی، هەروەها کەسایەتییەکی پێشەنگ بووە لە بواری ئەندازیاریدا، لەوانەش (ثابت بن قرة ٢٢٢ – ٢٨٩ك / ٨٣٦ – ٩٠١ز) کە سەرباری ئەوەی پزیشکێکی شارەزابوو لە بوارەکانی بیرکاری و گەردووناسیشدا زمانەکانی یۆنانی و عبری و سریانی بەباشی زانیوە، هەروەها (سنان)ی کوڕی (ثابت بن قرة) کە پزیشکێکی شارەزا و لێهاتوو بووە و وەرگێڕێکی باشیش بووە لەهەمانکاتدا، ئەمە جگە لەوەی کە لە سەردەمەکانی دواتری عەبباسییەکاندا چەندین ڕۆڵی (حرانی)یەکان زۆر زیاتر دەرکەوتووە بە تایبەتیش لە سەردەمی بووەیهییەکاندا و توانیویانە کاریگەرییان لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی هەبێت[1].

**چوارەم: نصیبین:**

یەکێکە لە شارە کۆنەکانی گریك و لە سەردەمی ڕۆمانییەکاندا پێی گوتراوە (نسیبیس Nisbis)، هەروەها جوگرافیناسە یۆنانییەکان ناویان ناوە (سورکروس Socaras) یان (مکدونیس Mygdonins)، هەروەك بە (نصیبین الروم)یش ناسراوە[2].

هەڵکەوتەی جوگرافیاکەی دەکەوێتە سەر ڕێگای موسڵ و شام، لە (سنجار)ەوە (٩ فرسخ یان ٥٤کلم) دوورە و وە لە (موسڵ)ەوە (٦ڕۆژ یان ٢١٦ کلم) دوورە و لەگەڵ (دنیسر) (٢ڕۆژ یان ٧٢کلم) دوورە، لەلایەن بولدانییەکانەوە زۆر وەسفی ئەم

---

(١) ابن القفطي: أخبار العلماء، ص٢٨٠ – ٢٨١ " د. توفيق سلطان اليوزبكي: التعريب في العصرين الأموي و العباسي، مجلة آداب الرافدين، جامعة الموصل، العدد السابع تشرين الأول ١٩٧٦م، ص٤٥، ٤٦" الزبيدي: م.س،ص٤٥٩ -٤٦٠ " د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص٩٩.

(٢) كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، تر. بشير رنسيس، كوركيس عواد، مطبعة الرابطة بغداد، ١٣٧١هـ – ١٩٥٤م، ص١٢٤ " مؤلف مجهول: تعريف بأعلام الواردة في البداية والنهاية لإبن كثير، ج٢،ص٣٦٤.

شاره كراوه بەوەی كه شارێكی گەورەو ئاوەدانەو هەروەها وتراوه كه پاكترین شاری (جزيره)يه و زۆرترین خێری تيادایه و له كشتوكاڵ و بازرگانیدا پێشكەوتووه[1].

ئـەم شـاره لـه سـاڵی (٢٧٨ز) كەوتـه ژێـر سـایەی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆرییـەتی رۆمانییـەوه، بەمـەش بـووه یـەكێك لـه شـاره سـنوورییەكانی نێـوان هـەردوو ئیمپراتۆریەتی (ساسانی و رۆمانی)، هەروەها لـه سـاڵی (٣٠١ز) ئـاینی مەسـیحی لـه (نصيبين)دا بڵاو بووەوه و ژمارەیەك له كەنیسه و دێـر و خوێنـدنگای شارسـتانیەتی یۆنانی تیادا كرایەوه، لەو دێرانەش (دير قني) بوو كه لەلایەن (مارماری) كه پیاوێكی ئاینی بوو دامەزراو هەروەها خوێندندنگایەكیشی تیادا دامەزراند و پاشان هـەر لـەم خوێندنگایەدا (متى بن يونس) كـه پیـاوێكی تـری ئـاینی مەسـیحی بـوو دەركـەوت. هەروەها چەند دێرێكی تریش له (نصيبين) دا هەبوو، لەوانەش (دير زعفـران) و (ديـر مار أوجى) و (دير مار يوحنـا) بـوون[2]، لـه پاشـدا كەسـایەتییەكی ئـاینی و زانسـتی گەوره لەم شارەدا دەركەوت كه (مار يعقوب) بوو له ساڵی (٣٠٩ز) ئـەم كەسـایەتییه پاش ئەوەی بوو به (بطريك)ی (نصيبين)، گەورەترین و ناوازەترین كەنیـسەی تیـادا دروستكرد، هەروەها لەگەڵ یـەكێك لـه باشـترین خوێنكارانیـدا كـه (مـار أفـرام) بـوو

---

(١) إبن خرداذبة: المسالك و الممالك، اعادت طبعه بالاوفست عـن طبعـة ليـدن،،١٨٩٩م، مكتبـة المثنى بغداد، ص٨٦ " اليعقوبي: كتاب البلدان، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٢م، ص١١٨ " إبن حوقل: صـورة الأرض، ص ١٩٣ — ٩٤ " إبـن شـداد: الأعـلاق الخطـيرة في ذكـر أمـراء الـشام والجزيرة، تح. يحيى عبارة،منشورات دار الثقافة والارشاد القومي، دمشق، ١٩٨١م، ص٣٦ — ٥٠ " أبو الفداء: تقويم البلدان: بإعتناد رينود و ديسلان، دار الطباعة الـسلطانية، بـاريس، ١٨٤٠م، ص١١٨ " إبن عبد الحق: مراصد الأطلاع على أسماء الأمكنة و البقاء، تح. علي محمد البجـاوي، دار أحياء كتب العربيـة، ط١، القـاهرة، ١٩٥٤م، ج٣، ص١٣٧٤ " الأصـطخري، م.س، ص٣٠ " إبن بطوطة: رحلة إبن بطوطة، تح.عبدالهادي التازي/ مطبعـة المعـارف الجديـدة، الربـاط، ١٩٩٧م، ج١، ص١٨١.

(٢) الشابشتي: الديارات، تح. كوركيس عـواد، ط٢، مكتبة المثنى، بغـداد، ١٩٦٦م، ص٣٧٦ — ٣٨١ " أدي شير: تاريخ كلد و آثور، مطبعة الكاثولكية للآباء اليسوعيين، ٩١٣م، ج٢، ص٤١.

بەشداری لە کۆنگرەیەکی گەورەی تایبەت بە مەسیحییەکاندا کردو لەوێوە بڕیاری ئەوە درا کە خوێندنگایەکی هاوشێوەی (ئەسکەندەریە) لە (نصیبین) درووست بکرێت، بۆیە خوێندنگایەکی گەورەی دامەزراند لەسەر هاوشێوەی خوێندنگاکەی (ئەسکەندەریە) ئامانجی سەرەکی بریتی بوو لە بڵاوکردنەوەی زانستی ئاینی (لاهوتی)یۆنانی لە نێوان ئەو مەسیحییانەی کە بە زمانی سریانی ئەدوان، هەروەها (مار أفرام)ی خوێندکاری کردە بەڕێوەبەری ئەو خوێندنگایە، کە کەسایەتییەکی زۆر شارەزاو لێهاتوو بووە (مار أفرام) توانی ناوبانگێکی گەورە بە خوێندنگاکەی بدات و بە جۆرێ کردیە ناوەندێکی گەورەی بڵاو بوونەوەی شارستانیەتی یۆنانی، هەروەها لەم خوێندنگایەوە چەندین کتێبی (یۆنانی) وەرگێڕدرانە سەر زمانی (سریانی) چونکە هەروەك وتمان ئەم خوێندنگایە بۆ ئەو مەسیحییانە بوو کە بە زمانی (سریانی) دەدوان[1].

بەم جۆرە ئەم خوێندنگایە مایەوە تا لە ساڵی (٣٦٣ز) لەلایەن فارسەکانەوە هێرش کرایە سەر (نصیبین) و داگیرکرا، سەرباری ئەوەی (مار أفرام) بەرگرییەکی زۆری لە شارەکەی و لە خوێندنگاکەی کرد، بەڵام ئەنجام هەڵهات بەرەو شاری (روها) و خوێندنگاکەی بۆ ئەوێ گواستەوە و لەوێ خوێندنگاکەی بنیاتنایەوە، لە (روها)ش پاش نزیکەی سەدەیەك لە ساڵی (٤٨٩ز) ئەم خوێندنگایە لەلایەن ئیمپراتۆری ڕۆمانی (زینون) داخرا، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە زانایان و فەیلەسوفانی ئەم خوێندنگایە پشتگیرییان لە ئاینزای (نسطوری) دەکرد لە بەرامبەر مەسیحییەکانی تردا کە (یعاقب)ەکان بوون[2]، بۆیە زانایان و فەیلەسوفەکان سەرلەنوێ ڕوویان لە (نصیبین) کردەوە و لەوێ بە سەرۆکایەتی (مار برصوم)

---

(١) أفرام برصوم: م.س، ص٢٤٥ " د.شحات السيد زغلول: م.س، ص٨٢ " أولـيري: العلوم اليونانية، ص ٦٢ — ٦٣ " د.محمد حسين الزبيدي: م.س، ص٤١٤.

(٢) إسماعيل مظهر: تاريخ الفكر العربي، نشوءه و تطوره بالترجمة و النقل عن الحضارة اليونانية، مصر — ١٩٢٨م، ص٤" د.عبدالفتاح أحمد فؤاد: م.س، ص٢١ — ٢٢ " ظ.بارتولد: م.س، ص١٣٠.

خوێندنگایـــەکیان دامەزرانـــد، ســـەرجەم لێکۆڵینـــەوە و خوێندنـــە فەلـــسەفییە یۆنانییـــەکانیان بـــۆ گواســـتەوە کـــە لـــە خوێنـــدنگای (روهـــا) لـــەو ماوەیـــەدا پێـــی گەیشتبوون، کە خۆی لە دانراوەکانی (ئەرستۆ)دا دەبینییەوە بە تایبـەتی لـە بـواری لۆژیـك و هـەروەها لـە کتێبـی (ئیساغوجی) و چـەندان بابـەتی تـریش[1]، دیـارترین چـالاکی هـەردوو خوێندنگاکـەی یەکـەم و دووەمـی (نـصیبین)یـش بریتـی بـوو لـە وەرگێڕانی کتێبە فەلـسەفی و لۆژیکییـەکانی شارسـتانیەتی یۆنـانی دەبینییـەوە بـۆ زمانی سریانی، بەجۆرێ کە ئەم چالاکییە لە پاش (فتوحـات)ی ئیـسلامیی* بـۆ ئـەم شارە هەر بەردەوام بوو کە ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لـە گواسـتنەوەی فیکـر و زانـستی شارسـتانیەتی یۆنـانی بـۆ شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، ئەمـەش بـە هـۆی وەرگێڕانـی بابەتەکانیان لە سریانییەوە بۆ عـەرەبی لـە لایـەك و هـەروەها بـەهۆی ئاوێتـەبوون و تێکـەڵبوونی لەگـەڵ شارسـتانیەتی ئیـسلامیدا لـە پـاش (فتوحـات)ی ئیـسلامییەوە، چونکە (نصیبین) بۆ خۆی پێشەنگی ناوەنـدەکانی شارسـتانیەتی یۆنـانی بـوون کـە فەلسەفەی لاهوتی یۆنانی بە ڕۆژهەڵاتداو لە ڕێگای خوێندنگاکەیەوە بڵاوکردەوە[2].

---

(١) إسماعيـل مظهـر: م.س، ص١٠ " ديلاسـي أولـيري: العلـوم اليونـان، ص٦٥،٦٤ " د.فتحـي عثمان: الحدود الاسلامية البيزنطية بين الاحتكاك الحربـي و الاتـصال الحـضاري، القـاهرة، ١٩٧٣م، ج٣،ص٢٦٢، ٢٦٣.

* ئەم شارە لە ساڵی ١٨ – ١٩ك لە لایەن سـوپای مـسوڵمانانەوە بـە سـەرۆکایەتی (عیـاض بـن غنم) بە زۆر (عنوة) فەتح کراوە و پاشان ڕێککـەوتوون لەسـەر دانـی جزیـە. بڕوانـە: أبـو يوسـف: كتاب الخراج، بيروت، دار الحداثة، ١٩٩٠، ص١٤٤ " البلاذري: فتوح البلدان، ص١٨٠ " الطـبري: تاريخ الرسل والملوك، ج٤،ص٥١.

(٢) الجميلي: م.س، ص٢١٤ – ٢١٥ " أوليري: تاريخ الفكر العربي، ص٧٠.

**پێنجەم: روها (ئورفە):**

یەکێکە لە شارەکانی (جزيرة الفرات)ییە، دەکەوێتە باکووری شاری (حران) بە دووری(٤٠کلم)، لە نێوان موسڵ و شامدایە[١]، ئەم شارە بە یۆنانی پێی گوتراوە (أديسا Edessa) و بە سریانیش پێی گوتراوە (اورهای – أورهی Urhoi) و هەروەها لەلایەن ڕۆمانییەکانەوە (أزاسا)شی پێگوتراوە [٢]، ئەم شارە بە کەنیسەکەی ناوبانگی دەرکردووە کە کەنیسەیەکی زۆر گەورە بووە، زۆرینەی دانیشتوانەکەی مەسیحیین، هەروەها لەلایەن مەسیحییەکانەوە زۆر بە پیرۆز دادەنرێت و پێگەیەکی تایبەی خۆی هەبووە[٣]، سەبارەت بە سەرەتای بنیاتنانی (روها) و بنیاتنەرەکەیەوە چەندین بۆچوونی جیاواز هەیە هەندێك پێیان وایە کە پادشای بابلییەکان (نمرود بن كنعان) بنیاتی ناوە، هەندێکی تر دەڵێن کە پادشاکانی ڕۆمانی بنیاتیان ناوە[٤].

لەلایەن (بلدانی)یەکانەوە گەلێ وەسفی ئەم شارە کراوە، بەوەی کە شارێکی نێوەندە و قەڵایەکی بەهێزی هەیە کە لە بەرد دروست کراوە، هەروەها چەندین درەخت و باخ و بێستانی هەیە و چەندین سەرچاوەی ئاو و کانی تیادایە، هەروەها ئەم شارە لە چاو زەوییەکانی دەوروپشتیاندا بەرزبووە، بە جۆرێ کە بەسەریاندا ڕوانیویەتی[٥].

---

(١) ابن الحوقل: صورة الارض،ص٢٠٤ " ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٣، ص١٠٦ " د.كامل مراد: تاريخ آداب السريانية، ص٣٧.

(٢) إبن عبدالحق: مراصد الاطلاع،ج٢،ص٦٤٤ " د.حسين قاسم العزيز: م.س، ص٣٩٩ " د. كامل مراد: م.ن،ل ٣٧.

(٣) الاصطخري: المسالك و الممالك، ص٧٦ " ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٤ " المقدسي: أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، تح. د.محمد مخزوم، دار أحياء التراث العربي، بيروت، ١٤٠٨ هـ / ١٩٨٤م، ص١٤١.

(٤) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محمد جاسم الحمادي: م.س، ل١٢٩.

(٥) إبن خرداذبه: م.س، ص٥٦ " الاصطخري: م.س، ص٧٦ " الحميري: الروض المعطار، ص٢٧٣.

شـاری (روهـا) کـه بـه (سـریانی) ناسـراوه، هـەر لـه سـەردەمانێکی زووەوە پەیوەندییەکی بەهێزی هەبووە بە شارستانیەتی یۆنانییـەوە و بنـەماکان و کلتـووری ئەو شارسـتانیەتە کاریگـەری لـە سـەری هـەبووە، بـە جـۆرێ کـە زۆرێـك لـە وشـەی یۆنانییـان لـە زمانەکەیانـدا بـەکار هێنـاوە، هـەروەها نووسـەران و خوێنـدەوارانی خوێنگاکەیان بە زمانی یۆنانی بابەتەکانیان نووسیوە، لە پاشدا وەریانگێڕاوەتە سەر زمـانی سـریانی، بـۆ ئـەوەی کـە خـەڵکی لێـی تێبگـات، ئـیتر لێـرەوە ئاوێتـەی شارسـتنیەتی یۆنـانی بـوون و بـەجۆرێ کـە وەك شـارێکی یۆنـانی دەردەکـەوت[1]، ئەوەشی زیاتر ڕێگـای بـۆ ئـەم بابەتـە خۆشـکرد، گواسـتنەوەی خوێنـدنگای شـاری (نصيبين) بوو بۆی، ئەم خوێندنگایە لە شاری (روهـا) بـە جـۆرێ پێشکەوت کـە لـە سـەدەی پێنجـەمی زاینیـدا، بـە تـەواوەتی دەسـتیان گرتبـوو بەسـەر خوێنـدن و بڵاوکردنەوەی فەلسەفە و بەرهەمـەکانی (ئەرستۆ)دا، بـەم جـۆرە ئـەم خوێندنگایـە بـەردەوام بـوو تـا کـاتی سـەرلەنوێ گواسـتنەوەی بـۆ (نـصيبين) پـاش نزیکـەی سـەدەیەك، بـە هـۆی لایـەنگیری زانایـان و فەیلەسـوفانی ئـەم خوێندنگایـەوە لـە (نسطوري)یەکان، هەروەها ژمارەیەکیشیان لێ هـەڵهاتن بـەرەو دەوڵـەتی ساسـانی و کیسراکانی ئەوێ دەرگایـان بـۆ کردنـەوە و هەنـدێکیان ڕوویـانکردە (جنديسابور) و لەوێ چەندین بیمارستان و خوێندنگای پزیشکییان کردەوە[2].

شایەنی باسە هەندێك لە نووسەران پێیان وایە کە (روها) گرنگترین ناوەند بـووە کە لێیەوە شارستانیەتی یۆنانی بـۆ شارسـتانیەتی ئیـسلامیی گواسـتراوەتەوە، لـەم بارەیەوە (جـورج حـداد) دەڵێـت: ((خوێنـدنگای روهـا، گـرنگترین ناوەنـد بـووە کـە

---

(١) د.الـشحات الـسيد زغلـول: م.س، ص٧٥ – ٧٧ " د. كامـل مـراد: م.س، ص١٥ – ٢٤ – ٢٦.

(٢) أدي شـير: تـاريخ كلـدو وآشـور: ج٢، ص٤٨ " اسماعيـل مظهـر: م.س، ص٤ – ٨ " ديلاسـي أوليري: العلوم اليونانية، ص٦٥ – ٧٦ " تاريخ الفكر العربي، ل ٣٤ " ظ.بارتولـد: م.س، ص١٣٠ – ١٣١ " د.محمـد حـسين الزبيـدي: م.س، ص٤٦١ " DeBor: the history of philosophy , pp.12 – 13.

ڕۆشنبیری لێوه چووه بۆ عەرەب، بەتایبەتی لە هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمدا کە باشتر دەرکەوت، هەروەك چۆن گرنگترین ناوەندیش بوو کە لێیەوە فیکری سریانی و نسطوري ئاوێتەی فیکری یۆنانی بوون))[1].

بەڵام ئێمە پێمان وایە کە سەرباری ئەوەی کە نکۆڵی ناکرێت لەو گرنگییەی ئەم شارە هەیبووە لە ڕووی کلتوور و زانستی شارستانیەتی یۆنانی و ڕەنگدانەوەکانی بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەم ناوەندە گرنگترین ناوەند بووبێت، چونکە ناوەندەکانی تری وەك (ئەسکەندەریە و حران و هەروەها جندیسابور) لەم بوارەدا ڕۆڵیان لە (روها) گەلێ زیاتر بووە، بۆیە دەتوانین بڵێین کە یەکێکە لە ناوەندەکانی گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی بە پێی تواناو بۆ گونجاندنی لەچاو ناوەندەکانی تردا.

**شەشەم: جندیسابور:**

یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی (خوزستان) و سەر بە (کورە)ی ئەهوازە، ئەم شارە لەلایەن (سابور بن أردشیر ٢٤١ – ٢٧٢ز) دروست کراوە[2]، پاش ئەوەی (سابور) لە ساڵی (٢٥٧ز) لە شەڕێکیدا لە بەرامبەر ڕۆمانییەکان بە سەریاندا سەرکەوت، ژمارەیەکی زۆری لێ بە دیل گرتن بە ئیمپڕاتۆرەکەشیانەوە کە (ڤالیریان ٢٥٣ – ٢٦٠ز)بوو، ژمارەیەکی زۆری لەم دیلانە لە شارە نوێیەکەیدا نیشتەجێ کرد کە (جندیسابور)بوو، چونکە (سابور) هەستی بە باڵادەستی شارستانیەتی ڕۆمانییەکان و دیلەکانی کردبوو بەسەر شارستانیەتی خۆیاندا، بۆیە ئازادی پێبەخشین لە پێڕەوکردنی بیروباوەڕ و ئاین و کلتوور و زمان و ڕێساکانی تایبەت بە خۆیان لە شارەکەدا، هەروەها سوودی لێیان وەرگرت بۆ پەرەپێدانی بوارەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و ئاوەدانی، چونکە سابور بۆخۆی مەیلێکی گەورە بەلای شارستانیەتی یۆنانیدا هەبوو، ئەمەش لە هەوڵەکانی بۆ کۆکردنەوەی کتێبە

---

(١) مدخل الى تاريخ الحضارة، دمشق، ١٩٥٨، ص٤١٨.

(٢) المقدسي: أحسن التقاسيم، ص١٤٩ – ١٥٠ " ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص١٧٠ " د.محمد حسين الزبيدي: م.س، ص٤٠١.

فەلسەفییە یۆنانییەکان و وەرگێڕانیان بۆ زمانی فارسی دەردەکەوێت، لێرەوە ژمارەیەك پزیشکی ناوازە دەرکەوتن کە بە پزیشکی (أبقراط) ناسرابوون، بەم جۆرە (سابور) توانی (جندیسابور) بکاتە یەکێك لە ناوەندە گەورەکانی چالاکی عەقڵی شارستانیەتی یۆنانی لە ناوچەکەدا[1]، هەروەك باسمان کرد لەم شارەدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبی فەلسەفی یۆنانی کۆکرانەوەو وەرگێڕدرانە سەر زمانی فارسی، ئەمەش لە ڕێگای ناردنی چەندین نوێنەر بۆ ناوەندەکانی تری شارستانیەتی یۆنانی، هەروەها ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی تا کتێبی بۆ بهێننەوە و دەرەنجام ئەم کتێبانەی لە گەنجینەیەکی گەورەدا کۆکردنەوە لە جندیسابور دا، هەروەها چەندین کەسایەتی زاناو (حکماء)ی بەناوبانگی لە شارەکەیدا کۆکردەوە لەوانەش (دورسوس)ی، سریانی، ئەم کەسایەتییە ڕوونکردنەوەی لەسەر کتێبەکان دەداو خەڵکی فێر دەکرد[2].

پاش (سابوری یەکەم٢٤٢ – ٢٧٢ز) (سابوری دووەم ٣٠٩-٣٧٩) هات کە کاریگەری (سابوری یەکەمی) لەسەر بوو، لەسەر هەمان ڕێڕەوتی ئەو دەڕۆیشت لە گرنگیدان بە زانست و کلتووری شارستانیەتی یۆنانی، ئەم دەستیکرد بە بانگهێشت کردنی پزیشکانی کارامەو لێهاتوو بەناوبانگ بۆ شارەکە، هەروەها مانەوەی لە

---

(١) اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ج١، ص١٥٩ " الدينوري: أخبار الطوال، تح. د.عمر فاروق الطباع، دار القلم للطباعة و النشر، بيروت، (د.ت)، ص٤٥ " الطبري: تاريخ الرسل والملك، ج٢، ص١٣ المطهر المقدسي: البدء والتاريخ، مكتبة الثقافة الدينية، بورسعيد، مصر، (د.ت)، ج٣، ص١٥٧ " ابن الأثير، الكامل في التاريخ، ج١،ص٢٤١ " إبن خلدن: تاريخ إبن خلدون، ج٢، ص٢٠٦ " آرثر كريستنس: ايران في عهد الساسانيين، تر. يحيى الخشاب، دار النهضة، بيروت، ١٩٥٧م، ص١٠ – ١٣ " اليوزبكي: التعريب في العصرين الاموي و العباسي، ص٤٦ " أوليري: علوم اليونان و سبل انتقالها الى العرب، ص١٩.

(٢) أبو الفداء: المختصر، ج١، ص٢٨ " ابن النديم: الفهرست، ص٣٤٧ – ٣٤٨ – ٤٣٦ " حنا الفاخوري و خليل الجر: تاريخ الفلسفة العربية، دار الجيل، بيروت، ١٩٩٣، ج٢، ص١١ " د. حسين قاسم العزيز: م.س، ص٤٠١ زيغريد هونكة: شمس العرب، ص١٨١.

شـارەکەدا لـەلا خۆشەویـست دەکـردن، لەسـەردەمی ئەمـدا گـەورەترین پزیـشك دەرکـەوت بـەناوی (تیـادورس)[1]، کـاتێکیش کـە ئیمپراتـۆر (زینـو ٤٧٤-٤٩١ز) خوێندنگاکەی (روها)ی داخست لە ساڵی (٤٨٩ز)دا ژمارەیەکی زۆر لە فەیلەسوفان و پزیشکانی ئەم خوێندنگایە ڕوویانکردە (جندیسابور) ئەمەش پاڵنەرێکی تری گـەورە بوو بۆ پێشکەوتن و پەرەسەندنی شارستنیەتی یۆنـانی لـەم شـارەدا، بەتایبـەتی لـە بـواری پزیـشکییدا، لـە ڕووی زمانـەوە لـەم شـارەدا زمـانێکی تایبـەتی نـەبوو بـە خەڵکەکـەی، چـونکە زیـاتر پێکهاتەکـەی تێکەڵەیـەك بـوو لـە یۆنـانی و سـریانی و فارسی*، بەڵام زمانی سریانی زمانی خوێندنی زانستەکانی سروشتی و پزیـشکی بـوو لە خوێندنگاکانیدا، سەرجەم ئەم کارە زانستی و شارستانی و وەرگێڕانانەی کە هـەر لە سەردەمی دیلە ڕۆمانییەکانەوە لەم شارەدا پەرەی سـەند، بـووە سەرچـاوەیەك و ناوەندێکی بەهێزی شارستانیەتی یۆنانی[2]، کە لێیەوە لە سەردەمی (خسروی یەکەم ٥٣١ – ٥٧٩ز)، خوێندنگایەکی گەورەی پزیشکی یۆنانی سـریانی تیـادا دابمـەزرێت، چـونکە ئـەم پادشـایە بۆخـۆی زۆر مـەیلی بـەلای ئـەوەدا بـوو کـە زانـستەکان و شارسـتانیەت و لایـەنی پزیـشکی شارسـتانیەتی یۆنـانی لـە یۆنـانی و ڕۆمانییـدا بـە وڵاتەکەیـدا بڵاوبکاتـەوە، بۆیـە زۆر ئاواتـەخواز بـوو کـە خوێندنگاکـەی هاوشـێوەی ئەسکەندەریە بنیـاتبنێ، ئـەوە بـوو ئـەم هەلـەی بـۆ ڕەخـسا کاتێـك (جـستینیان)ی ئیمپراتۆری ڕۆمانی هێرشـی کـردە سـەر (أثینـا)، لـە ئـەنجامی ئەمەشـەوە زۆرینـەی

---

(١) ابن النديم: م.ن، ص٤٣٦ " ابن أبي أصيبعة: عيون الأنباء، ج١، ص٣٠٨ " ديلاسي أوليري: العلوم اليونانية، ص٩٠ – ٩١.

* المقدسي لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەڵێـت: (کـورد دەسـەڵاتی تـەواویان بەسـەر ئـەم شـارەدا گرتـووە و زۆرینـەی کـوردە). أحـسن التقاسـيم،ص١٥٠" کـي لـسترنج: بلـدان الخلافـة الـشرقية، ص٢٢٩.

(٢) أحمد أمين: ضحى الاسلام، ص٢٥٥ " د. حكمت عبدالكريم فريحات و ابراهيم ياسين الخطيـب: مدخل الى تاريخ الحضارة العربية الاسلامية، دار الشروق، عمان، ١٩٩٩م، ص٢٦١ " د.الـشحات السيد زغلول: م.س، ص٦٥.

فەیلەسوف و زانایانی ئەم شارە هەڵاتن لەم کاتەدا (خسروی یەکەم) دەرگای شارەکەی بۆ کردنەوە و هانیدەدان کە لە (جندیسابور) نیشتەجێ ببن، ئەم فەیلەسوفانە بە پێی فرمانی (خسروی یەکەم) کەوتنە وەرگێڕانی ژمارەیەکی زۆر لە کتێبی لۆژیکی و پزیشکی لە زمانی یۆنانییەوە بۆ زمانی فارسی، لە ئەنجامی هەوڵەکانی ئەم فەیلەسوفانەوە خوێندگایەکی گەورەو هاوشێوەی ئەسکەندەریە لە (جندیسابور) دروست بوو، کە بووە ناوەندی بڵاوبوونەوەی شارستانیەتی یۆنانی[1].

ئەم خوێندنگایە هەموو هەوڵەکانی خۆی لەوەدا چڕ کردبۆوە کە لەسەر هاوشێوەی خوێندنگای ئەسکەندەریە بڕوات و هەروەها لە بواری پێڕەوکردنی پرۆگرامی خوێندنیش سوودی باشیان لێ وەربگرێت، بەتایبەتی لە بواری پزیشکییدا، چونکە ئەم خوێندنگایە زیاتر پزیشکی بوو، بۆ نموونە کتێبەکانی (جالینوس) کە لە سالآنی (٢٠٠ز) لە ئەسکەندەریە ژیاوە، بوو بە پرۆگرامی خوێندنگای (جندیسابور)[2].

ئەم خوێندنگایە هەمیشە دەرگای والآ بووە بۆ وەرگرتنی خوێندکار و فێرکردنیان لە بواری پزیشکییدا لە سەرجەم ناوچەکاندا هەر لە پێش (فتوحات)ی ئیسلامیشەوە، بۆنموونە سەرچاوەکان باس لە کەسایەتییەك دەکەن بەناوی (الحارث بن کلدة) کە پزیشکێکی لێهاتوو بووە لە پێش هاتنی ئیسلام و لە سەرەتای دەوڵەتی ئیسلامیشدا لە نیمچە دوورگەی عەرەبی، ئەم کەسایەتییە سەردانی (جندیسابور)ی کردووە و لەوێ فێری پیشەی پزیشکی بووە و لە گەڕانەوەشیدا بە شێوەیەکی بەرچاو دەرکەوتووە، کە پێغەمبەر (د.خ) خۆی خەڵکی بۆ ناردووە کە ئەو پشکنین و

---

(١) ابن النديم: الفهرست، ص٣٤٨ " د.شحات السيد زغلول: م.س، ص٦٦ " ماكس فانتاجو: المعجزة العربية، تر. رمضان لاوند، دار الكشاف، بيروت، ١٩٥٤م، ص٢٥.

(٢) احمد امين: ضحى الاسلام، ص٢٥٥ " أوليري، العلوم اليونانية، ص٥٠ " د.الشحات السيد زغلول: م.ن، ص٦٧.

چارەسەری بۆ بکات، هەروەك (سعد بن أبی وقاص) بەمەبەستی چارەسەرکردن دەنێرێت بۆلای ئەم پزیشکە [1].

ناوبانگی ئەم قوتابخانەیە لە پاش (فتوحات)ی ئیسلامیش * لەناو شارستانیەتی ئیسلامیدا بەتایبەتی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا بەجۆرێك بوو کە ئەگەر کەسێك مەسیحی نەبوایە و خەڵکی(جندیسابور) نەبوایە وەك پزیشك لێی نەدەڕوانراو کاری دەست نەدەکەوت و متمانەی خەڵکی بەدەست نەدەهێنا[2]، بەم جۆرەش ئەم خوێندنگایە لە تەواوی سەردەمەکانی ڕاشدین و ئومەوی و عەبباسییەکاندا توانیبووی پارێزگاری لە ناوبانگ و ئاستی زانستی خۆی بکات، لێرەوە ئەم شارە بوو بە ناوەندێکی سەرەکی وا کە مسوڵمانان زانیارییە پزیشکییەکانی خۆیانیان لێوە وەردەگرت، بە تایبەتیش لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور)ە وە کاتێك بۆ یەکەم جار ڕاستەوخۆ ناردی بە شوێن (جورجیس بن بختیشوع) کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی پزیشکی بوو لە (جندیسابور) بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی کە لە (گەدە)یدا بوو، ئیتر لێرەوە ئەو پەیوەندییە گەورەیە درووست دەبێت لە نێوان بنەماڵەی (آل بختیشوع) و (بلاط)ی عەبباسییەکاندا کە لەپاشدا لە سەردەمی (هارون الرشید)دا (بختیشوع بن جورجیوس) دێت و هەروەها پاش ئەمیش (جبرائیل

---

(١) الذهبي: تاريخ الاسلام، تح. عمر عبدالسلام التدمري، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧هـ – ١٩٨٧م، ج٤، ص١٩٢ – ١٩٣ " ابن القفطي: أخبار العلماء، ص١٦١.

* ئەم شارە لە ساڵی (١٧ – ١٨ – ١٩ ك) لە سەردەمی خەلافەتی (عمر بن الخطاب) بە سەرکردایەتی (أبو موسى الأشعري) بە شێوەی ڕێککەوتن فەتح کراوە. قدامة بن جعفر: الخراج و صناعة الكتابة، ت.ح.محمد حسين الزبيدي، دار الرشيد، العراق، ط١، ص٣٨٥ " ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج١، ص٤٤٧ " السيوطي: تاريخ الخلفاء، ص٥٣.

(٢) الجاحظ: البخلاء، ج٢، ص٤ – ٥ " د.أميرة حلمي مطر: م.س، ص٧٩.

بن بختيشوع) دەبێتە پزیشك هەروەك لە باسی یەکەمی ئەم بەشە لەم بنەماڵەیەو کارەکانیان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییدا دواین [1].

هەروەها یەکێکی تر لەو ڕۆڵە بەرچاوانەی خوێندنگای (جندیسابور) بینی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا بریتی بوو لە وەرگێڕان و دەستخستنی چەندین بابەتی پزیشکی و فەلسەفی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامیی و هەروەها بڵاوکردنەوەی ئەو شارستانیەتە و گرنگی پێدنی لە ناویدا.

لەم بارەیەوە (د. رشید الجميلي) دەڵێت: ((خوێندنگای جندیسابور خوێندنگایەکی گرنگ و کاریگەر بوو بۆ عەرەب لەماوەی بزووتنەوەی وەرگێڕاندا، کە ڕۆڵی پێشەنگیان دەگێڕا لەو بوارەدا، ئەویش بەوەی کە ئەم خوێندنگایە چەندین وەرگێڕی کارامەو لێهاتووی پێشکەش کرد، کە توانییان زۆرێك لە کلتووری شارستانیەتی یۆنانی وەربگێڕنە سەر زمانی عەرەبی، نەك هەر ئەمە بە تەنها، بەڵکو ڕۆڵەکانی ئەم خوێندنگایە، بەهۆی پیشەکەیانەوە کە پزیشکی بوو، توانییان زۆرێك لە لێکۆڵینەوەی نوێ و وەرگێڕدراوی تری ئەم بابەتانە کە لە پێشتردا ئەنجامدرابوون، زیاد بکەنە سەر بابەتە وەرگێڕدراوەکان و بەمەش کلتووری شارستانیەتی ئیسلامییان پێ دەوڵەمەندتر کرد))[2].

بەم جۆرە ئەم ناوەندانە هەر یەکەو بە پێی خۆی توانی ڕۆڵی هەبێت لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامیی چ بە ڕێگای ڕاستەوخۆ بێت یان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ و ڕەنگدانەوە بێت لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا، لە پاش پرۆسەی (فتوحات)ی ئیسلامیی بۆیان، لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی شارستانیەتی ئەو ناوەندانەوە بە شارستانیەتی ئیسلامیی.

---

(١) ابن أبي أصيبعة: عيون الأنباء، ج١، ص١٢٣ " ابن القفطي: أخبار العلماء، آرثر كريستنس: م.س، ص٤٠٧ " اليوزبكي: م.س، ص٤٧ " خودابخش: م.س، ص ١٥٧ " د.حسين قاسم العزيز: م.س، ص ٤٢٣ " ظ. بارتولد: م.س، ص٥٣ " كي لسترنج: م.س، ص٣٧٣ " د.ماكس مايرهوف: م.س، ص٥٥.

(٢) حركة الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنين الثالث و الرابع للهجرة، ص٢٢٤.

# باسی دووەم: ڕۆڵی نەتەوە و گەلە ناعەرەب و ناموسڵمانەکان لە گەیاندن و پەرەپێدانی شارستانیەتی یۆنانی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا

لە ئەنجامی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیی بۆ هەرێمەکانی (عێراق و شام و فارس و میسر)، ژمارەیەکی زۆر لە گەلان و نەتەوەی جیاجیا کەوتنە ژێرسایەی خەلافەتی ئیسلامییەوە. هەریەك لەم گەل و نەتەوانەش خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەی شارستانیەت و کلتووری خۆیان بوون کە پاشماوەی هەردوو ئیمپراتۆریەتی (ساسانی و ڕۆمانی)بوون[1]، ئەم گەل و نەتەوانە تێڕوانین و بۆچوونیشیان سەبارەت بەم ئاینە نوێیە جیاوازبوو، لێرەوە هەندێکیان بوون بە مسوڵمان و بە (موالي)یەکان ناسران، هەندێکی تریشیان، بەتایبەتی ئەوانەیان کە (أهل الكتاب)یان پێدەگوترا لە (مەسیحی و جوولەکە و صابیئە و مەجوس)، لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە و بە (أهل الذمة*)ناسران.

بە تێڕوانینیشمان لە بارودۆخی تایبەتی هەریەك لەم دوو کۆمەڵەیە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا دەتوانین لە ڕێژەی بەشدارییان لە شارستانیەتی ئیسلامییدا بگەین، کە ڕۆڵی گەورەیان لەبەرەو پێشبردنی شارستانیەتی ئیسلامیی بەردەکەوێت، ئەمیش بە ئاوێتەبوونی شارستانیەتەکەیان لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامییدا.

---

(١) د.جوزيف نسيم يوسف: الإسلام والمسيحية و صراع القوى بينهما في العصور الوسطى، دار الفكر الجامعي، الاسكندرية، (د.ت)،ص ١١٣ - ١١٤.

* أهل الذمة: بریتین لە دانیشتوانی ناموسڵمانی وڵاتانی ئیسلامیی، بۆیە ئەم ناوەشیان پێدەگوترێت چونکە لەبری پاراستن و مانەوەیان لەسەر ئاینی خۆیان و دابینکردنی ئارامی و لێبوردەیی بۆیان، لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە و لەبری وەرگرتنی بڕێك پارە کە بە (جزیە) ناسراوە. د.علي حسنى الخربوطلي: العرب و الحضارة، مكتبة الأنجلو مصرية، ١٩٦٦م، ص١٠٢.

**یەکەم: مەوالییەکان:**

ئەم زاراوەیە لە سەرەتادا زیاتر بەوانە دەگوترا کە لە شەڕەکاندا بە دیل دەگیران و پاش ئازاد بوونیان و مسوڵمان بوونیان بە (موالي) دەناسران، بەڵام ئەم ناوە لەپاشدا لەلایەن مێژوونووسانەوە بە سەرجەم ئەو مسوڵمانانە دەگوترا کە عەرەب نەبوون[1]، ئەم (موالي)یانە لەناو دەوڵەتی ئیسلامییدا ژمارەیان یەکجار زۆربوو، کە بەشێکیان (الحمراء)یان پێدەگوترا و کەمێکیشیان لە (سریان)ەکان بوون کە مسوڵمان بوو بوون[2]، بەگشتی بارودۆخی (موالي)یەکان لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەوییدا زۆر نالەبار بوو، ئەمەش لەبەر هەوڵەکانی ئومەوییەکان بۆ ئەوەی کە سروشتێکی عەرەبی بەسەر دەوڵەتەکەیاندا بسەپێنن، لە ڕووی عەقڵییەتی خێڵەکی عەرەبییەوە خۆیان لە عەجەمەکان بەگشتی بە گەورەتر دەزانی، هەروەها دەسەڵاتیشیان بە (موالي)یەکان نەدەدا، ئەگەر ئومەوییەکان خۆشیان ڕێگایان بدایە کەسێکی ناعەرەب ببێت بەدەسەڵاتدار و خەڵکی ڕێگایان نەدەدا کە کەسێك گومان لە بنەچەیدا هەبێت ببێت بە دەسەڵاتداریان[3]، هەرچەندە هەندێك نووسەری عەرەبی بەرپەرچی ئەم بۆ چوونە دەدەنەوە و پێیان وایە ئەم بارودۆخ و مامەڵەیە لە

---

(١) د.علي حسني الخربوطلي: تاريخ العراق في ظل الحكم الاموي، دار المعارف، ١٩٥٩م، ص٢٥٣" د. فاروق عمر فوزي: دور الموالي و مركزهم في المجتمع الإسلامي، مجلة الإستشراق، بغداد، ١٩٩١م،عدد ٥،ص٨١ " د.محمد بديع شريف: الصراع بين الموالي والعرب، ص٢٢ " نەریمان عبدالله عەلی: ڕەوشی مەوالی لە سەردەمی ئومەوییەکاندا (٤١-١٣٢ ك – ٦٦١ – ٧٤٩ز)، ماستەرنامەیەکی بڵاونەکراوەیە، پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی کراوە لە ساڵی ٢٠٠٥ – ٢٠٠٦ز، ل١٤.

(٢) الخربوطلي: العرب والحضارة، ص٩٤-٩٥ " تاريخ العراق، ص٢٥٧.

(٣) الجاحظ: البيان والتبيين، تح.فوزي عطوي، دار الصعب، بيروت، (د.ت)، ج٣، ص٢٧٢، ٢٩٣، ٢٩٧ " أبو الفرج الأصبهاني: الأغاني، تح. علي مهنا و سهير جابر، دار الفكر للطباعة والنشر، لبنان، (د.ت)، ج١٤، ص١١٤" د.الشحات السيد زغلول: السريان والحضارة الإسلامية، الهيئة المصرية العامة للكتاب، الأسندرية، ط١، ١٩٧٥، ل ١١٧ – ١١٨.

بەرامبەر (موالي)يەكان لەسەردەمی ئومەوییدا زیاتر هەڵسوكەوتی كەسی بووە و پەیوەندی بە سیاسەتی دەوڵەتەوە نەبووە[1]، بەهەرحاڵ ڕاستی هەرچۆن بێت، ئەم بارودۆخە پاڵی بە (موالي)یەكانەوە نا تا زیاتر بەرەو زانست و هونەر بچن و خۆیان بەو لایەنەوە خەریك بكەن[2]، و لەم بوارەدا چەندین زانای گەورە و ناودار لەناویاندا دەركەوتن، بەجۆرێ كە بەتەواوی دەستیان گرتبوو بەسەر لایەنی زانستییدا لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، لەم بارەیەوە (إبن عبدربه) دەڵێت: ((إبن أبي ليلى وتی: عیسی بن موسی كە كەسایەتییەكی ستەمكار و زۆر دەمارگیربوو، لێی پرسیم، كێ (فقیە) زانای بەسرەیە؟ وتم (الحسن بن أبي الحسن)، وتی: پاشان كێ؟ وتم: (محمد بن سيرين) وتی: ئەمانە كێن؟ وتم: مەوالین، وتی: ئەی كێ زانای مەككەیە؟ وتم (عطاء بن أبي رباح) و (مجاهد بن جبر) و (سليمان بن يسار)، وتی: ئەمانە كێن؟ وتم مەوالین، ڕەنگی گۆڕدراو، وتی: كێ زانای خەڵكی (قباء)ە؟ وتم (ربيعة الرأي و كوڕەكەی أبي الزناد)، وتی: ئەمانە كێن؟ وتم مەوالین، دەموچاوی گرژبوو، پاشان وتی: ئەی زانای یەمەن كێیە؟ وتم: (طاوس و كوڕەكەی و همام بن منبه)ە وتی: ئەمانە كێن؟ وتم: مەوالین، زیاتر ناڕەحەت بوو هەستایە سەرپێ و وتی: ئەی كێ زانای خۆراسانە؟ وتم: (عطاء بن عبدالله الخراساني)، وتی: ئەم عطاء كێیە؟ وتم مەوالییە، زیاتر دەموچاوی گرژبوو وە ڕەش داگیرسا و وتی: ئەی كێ زانای شامە؟ وتم (مكحول)ە، وتی: ئەم مكحولە كێیە؟ وتم مەوالییە، زیاتر توڕەبوو وە وتی: كێ زانای جەزیرەیە؟ وتم (ميمون بن مهران) وتی: ئەی ئەم كێیە؟ وتم: مەوالییە، هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشاو وتی: ئەی كێ زانای كوفەیە؟ ئەگەر لێی نەترسامایە ئەمگوت (الحكم بن عيينة وعمار بن سليمان)ن بەڵام بینیم كە شەڕی لێ ئەبارێ بۆیە

---

(١) د. فاروق عمر فوزي: م.س، ل ١١٨ – ١٢٥.

(٢) نەریمان عبدالله علی: م.س، ص١١٩ – ١٢٠.

وتم (إبراهيم و الشعبی)ن وتی: ئەمانە کێن؟ وتم عەرەبن، وتی: الله أکبر و هاتەوە سەرخۆی))[(١)].

ئەگەر لەم دەقەی سەرەوە بڕوانین ئەم بابەتەمان بەتەواوەتی بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام سەرباری ئەمانە ئەم مەوالییانە زیاتر بە زانستە شەرعی و ئیسلامییەکانەوە خەریك بوون و زیاتر ڕۆڵیان لەو بوارەدا بینیوە، هەروەها زیاتر هەوڵی گواستنەوەی شارستانیەتی فارسییان داوە بەتایبەتی لەسەردەمی ئومەوییەکان و سەردەمی یەکەمی عەبباسیی، چونکە هەروەك وتمان زۆرینەیان فارس بوون[(٢)]، بۆیە زۆر کەمتر ڕۆڵیان هەبووە لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانی کە مەبەستی باسەکەی ئێمەیە، ئەمە جگە لەوەی لەسەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا زیاتر ڕۆڵ و کاریگەرییان دەرکەوت کە بوونە هۆی سەرکەوتنی بانگەوازی عەبباسییەکان و دروستبوونی دەوڵەتەکە[(٣)]، هەروەها پاشان لە دەوڵەتی عەبباسییدا بەشدارییان کردو چەندین پلەوپایەی بەرزیان وەرگرت وەك وەزیر و والی دەوڵەتی عەبباسی، چەندین کەسایەتی و بنەماڵەی دیاریشیان تیا دەرکەوتن[(٤)].

**دووەم: أهل الذمة:**

ئەو گەل و نەتەوانەی بە (أهل الذمة) ناسرابوون، کە بریتی بوون لە (سریانەکان بەگشتیی و (نسطوري* و یعاقبة**) بە تایبەتی و صابیئەکان و جوولەکە و

---

(١) العقد الفريد: دار أحياء التراث العربي، بيروت، ط١، ١٤٢٠هـ، ١٩٩٩م، ج٣، ص٣٨٠ – ٣٨١.

(٢) د.حسن إبراهيم حسن: تاريخ الإسلام السياسيي و الديني و الثقافي و الإجتماعي، دار أحياء التراث العربي، بيروت، ط٧، ١٩٦٤م، ج٢، ص٣٢٠ - ٣٢١

(٣) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: نەریمان عبدالله علی: م.س، ص١١٤ – ١١٨.

(٤) د.حسن إبراهيم حسن: م.س، ج٢، ل ٢٥٣، ٢٥٧، ٢٥٨، ٢٦٨.

* نسطوري: یەکێك بووە لە ئاینزا بەربلاوەکانی مەسیحی لە ڕۆژهەڵاتدا، سەرەتاکەیان دەگەڕێنەوە بۆ ڕاهیبێك لە ئەنتاکیا، ئەم ڕاهیبە لە ساڵی (٤٢٨ز) بوو بە (بطريك) لە قوستەنتینیە و ئاینزاکەی لەسەر ئەوە بنیاتنابوو کە مەسیح مرۆڤە و (مريم العزراء) مرۆڤی=

قبطي)ەكان، ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە گواستنەوە و پەرەپێدانی شارستانیەتی یۆنانی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەمان ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەو شارستانییەتەوە هەبوو، هەر لە سەردەمی هاتنی (ئەسکەندەری مەکدۆنی)یەوە بۆ ڕۆژهەڵات لە ساڵی (٣٣٢پ.ن) تێکەڵ بە شارستانیەتی یۆنانی بوو بوون و لە ئەنجامی ئەم تێکەڵبوونەشەوە ئاوێتەی یەکدی بوو بوون و شارستانیەتی (هیلنستی Hellenistic Civilization) دروست بوو[1]، هەروەك لە بەشی یەکەم لێی دواین، چەندین ناوەندی شارستانیەتی یۆنانیش لە ناوچەکانیاندا بوو، سەرباری ئەمانەش، زۆربەی ئەم گەلانە پاشماوەی ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانیی بوون.

بارودۆخی (أهل الذمة) لەناو دەوڵەتی ئیسلامییدا بە گشتیی زۆر باش بوو، بە جۆرێك تەواو بە پێچەوانەی (موالي)یەکانەوە بوون، لێبوردەیی ئاینی گەورە لە

---

=بووە، نەك خواوەند، ئەم ئاینزایە لە کاتی خۆیدا شۆڕشێکی گەورەی لەناو مەسیحییەکاندا هەڵگیرساند.

ئەم (نسطوري)یانە زۆرترین پەیوەندییان بە زانستەکانی یۆنانی هەبووە، زۆر کتێبی ئایینی و فەلسەفیی و پزیشکییان لە یۆنانی بۆ سریانی وەرگێڕا. القلقشندي: صبح الأعشى في صناعة الإنشا، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٧م، ج١٣، ص٢٨٣ " القرطبي: الإعلام بما في دين النصارى، تح. د.أحمد حجازي السقا، دار التراث العربي، القاهرة، ١٣٩٨هـ، ج١، ص١٢٧ " دي لاسي أوليري: علوم اليونان وسبل انقالها الى العرب، تر. وهيب كامل، القاهرة، ١٩٦٢، ص٦٩ " M.M.SHAREF: موسوعة النظم و الحضارة الإسلامية، تر. د.أحمد شلبي، مكتبة النهضة المصرية، ط٨، ١٩٨٦، ج٢، ص٤٠.

** يعاقبة: یەکێکن لە ئاینزا مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات، بە پێچەوانەی (نسطوري)یەکانەوە پێیانوایە عیسا خوداوەندە و خاوەنی دوو سروشتە، یەکێکیان خوداوەندیە و ئەویدیکەیان مرۆڤیە، ئەمانە دەچنەوە سەر (يعقوب البرادعي) ئەسقەفی روها، کە خوێندکاری (دیسفوروس) بووە، القرطبي: م.س، ج١، ص١٢٧ " M.M.SHAREF: موسوعة النظم و الحضارة الإسلامية، تر. د.أحمد الشلبي.

(١) د.حكمت عبدالكريم و إبراهيم ياسين الخطيب: مدخل الى تاريخ الحضارة العربية الإسلامية، دار الشروق للنشر والتوزيع، رام الله، المنارة، ط١، ١٩٩٩م، ص٦٠.

بەرامبـەریان پێـڕەو دەكـرا[1]، ئەمـەش ڕەنگـە لەبـەر هـەر دوو هۆكـاری (ئـایینی و سیاسیی) بێـت، چـونكە لـە ئیـسلامدا زۆر گرنگـی بـە (أهـل الذمـة) دراوە و جـەخت لەسەر ڕێزلێگرتنیان كراوەتەوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و دەفـەرموێت: ((وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّـا بِالَّـذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَـيْكُمْ وَإِلَهُنَـا وَإِلَهُكُمْ وَاحِـدٌ وَنَحْـنُ لَـهُ مُسْلِمُونَ))[2]، ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەكی دیكەیـشەوە لایـەنی سیاسـیی ڕۆڵـی بەرچـاوی بینـی لـەم بـوارەدا و لـە گرنگییدانی دەوڵەتی ئیسلامیی بە (أهل الذمة) بە گشتی و بەتایبەتی مەسیحییەكان، ئەم گرنگیی پێدانەش هـەر لـە سـەردەمی (مەعاویـەی كـوڕە سـوفیان)ەوە، دەست پێدەكات، كاتێك دەبێت بە والی لە (شام)، چـونكە ئـەوەی بـۆ دەركـەوتبوو كـە ئـەم مەسـیحییانە خـاوەنی زانـست و ئـەزموونی گـەورەن لـە بوارەكانـدا، بۆیـە لـە خـۆی نزیككردنەوە، پاشانیش كاتێـك دەبێـت بـە خەلیفـە و خەلافـەتی ئومـەوی لـە(شـام) دروست دەكات و (دیمەشق) دەكات بە پایتـەختی خەلافەتەكـەی، زیـاتر هەسـت بـە گرنگیی ئەم مەسـیحییانە دەكـات لـە ڕووی شـارەزایی لـە سیاسـەت و ئیـدارەكردنی دەوڵەت، بەتایبەتی كاتێك كە (مەعاویە) دەیوست دەوڵەتێكی بەهێز دروسـت بكـات، هەروەها ئەم ناوچـەیەش كـە دەوڵەتەكـەی تیـادا دامەزرانـدبوو، ناوچـەیەك بـوو كـە

---

(١) جوستاف.أ.ظون جرونباوم: حضارة الإسلام، تر. عبدالعزيز توفيق جاويـد، دار الـصر للطباعـة والنـشر، ط١، (د.ت)، ص٢٢٢ – ٢٢٣، د.الـشحات الـسيد زغلـول: م.س. ص١٢٨" زيغريـد هونكة: شمس العرب تسطع على الغرب تر. فاروق بيضون، كمال دسوقي، المكتب التجاري للطباعة والتوزيـع، ط١، ١٩٦٤م، ل ٣٦٤ " د.مـصطفى الرافعـي: حـضارة العـرب في العـصور الإسـلامية الزاهرة، دار الكتب اللبناني، ط١، ١٩٦٠م، ص٩٦ " الأب سهيل قاشا: دور النصارى في الحضارة الإسلامية، سایتی ئینتەرنێتیی http://www.terezia.org.

(٢) العنكبوت آية ٤٦.

پێشتر سەر بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی بوو، لێرەوە دەبینین ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی مەسیحیی بەشداریی پێدەکات[1].

لەم بارەیەوە ف.بارتولد دەڵێت: ((مەسیحییەکان لە ژێر دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامییدا باشترین حاڵیان هەبووە، ئەمەش لەبەر پێویستی زۆری (فاتحەکان) بە ڕەگەزی مەسیحییەکان کە لە ڕووی شارستانییەتەوە باڵادەستتر بوون بەسەر عەرەبەکاندا))[2]، هەروەها (قبطي)یەکانی میسر بەهەمان جۆر لەو بارودۆخە باشەدا بوون، بۆ نموونە کاتێك کە (عەمری کوڕی عاص) کە والی میسر دەبێت کۆچی دوایی دەکات، ئەم (قبطي)یانە زۆریان پێ ناخۆش دەبێ، چونکە ئەم میرە بە تەواوەتی بەرژەوەندیی دەپاراستن و ڕێزی لێدەگرتن و هەروەها هەرگیز لەو بڕە (جزیة) و (خراج)ەی لەکاتی فتوحاتدا لەسەری ڕێککەتبوون، زیاتری لێ نەدەسەندن[3].

هەروەك ئاماژەمان پێی دا، ئەم لێبوردنە ئاینییە و ئەم گرنگییپێدانە بە (أهل الذمة) و گواستنەوەی خەلافەت لە حیجازەوە بۆ شام، بوونە هۆکاری گرنگ لە بەشدارییکردنی (أهل الذمة) لە شارستانیەتی ئیسلامییدا و هەوڵدانیان بۆ پێشکەوتنی ئەم شارستانیەتە و هەروەها لە ڕێگاشیانەوە ئاوێتەبوونی هەردوو شارستانییەتەکە بە یەکتری، چونکە کاتێك مسوڵمانان فەتحی ئەم ناوچانەیان دەکرد، ئەو ژیانە عەقڵی و زانستییانەی ئەو ناوەندانەیان نەدەوەستاند و ناوەندە زانستییەکان وەك خۆیان دەمانەوە، بۆ نموونە (دیمەشق)، کە بووە پایتەختی دەوڵەتی ئومەوی، پێشتر بۆ خۆی شارێکی کۆنی ڕۆمانیی بوو، هەروەها بارەگای (أساقفة)، پیاوانی ئایینی مەسیحییەکان بوو، چەندین خوێندنگای تیادا بوو کە هەتا

---

(١) د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص١٣٠، جوستاف أ.ظون جرونباوم: م.س، ص٢٣٠ – ٢٣١ " دى لاسي أوليري: العلوم اليونانية وسبل إنتقالها الى العرب، تر. وهيب كامل، ص١٨٧ - ١٨٩.

(٢) الحضارة الإسلامية، تر. حمزة طاهر، دار المعارف المصرية، ط٣، (د.ت)، ص٥١.

(٣) يعقوب نخلة روفيله: تاريخ الأمة القبطية، (ب. ش)، ١٩٩٨م، ط٢، ل ٦٢ – ٦٣.

پاش فتوحاتی ئیسلامییش ئەم خوێندنگایانە مانەوە و لە بڵاوکردنەوەی زانست بەردوام بوون[1].

هەروەها لە ڕووی سیاسییەوە، معاویە و خەلیفەکانی دیکەی پاش ئەو، کەوتنە ژێر کاریگەریی کولتووری شارستانیەتی یۆنانییەوە، بۆ نموونە شێوازی دەوڵەتەکەی وەك ئیمپراتۆریەتێکی گەورە بنیات نا، بە هاوشێوەی ڕۆمانییەکان دراوی زێڕیان لێدا و سیستمی حکومڕانی خەلافەتیشی کردە پشتاوپشت، هەروەها چەندین کەسایەتیی لە (أهل الذمة)، بۆ پۆستە باڵاکان بەکارهێنا و پلەی کاتبی یەکەمی دا بە مەسیحییەکان، جگە لەوەی کە زمانی ڕەسمیی دەوڵەتەکەی تا دەیەی یەکەمی دەسەڵاتیان بە یۆنانی بوو، هەروەها زۆرینەی فەرمانبەرە مەدەنییەکانی دەوڵەتیش لە مەسیحییەکان بوون، تەنانەت لە سەردەمی (عەبدولمەلیکە کوڕی مەروان)، کاتێك زۆر هەوڵی دا ئەو پلە و پایە بەرزانەیان لێ بسێنێتەوە و زیاتر وێنای دەوڵەتەکەی عەرەبی بنوێنێت، بەڵام نەیتوانی، هێندەی پێکرا کە زمانی یۆنانی بکات بە عەرەبی و هەروەها لەسەر دراوەکان بە عەرەبی بنووسێت[2].

هەروەك باسمان کرد، کاتی فتوحاتی ئیسلامیی بۆ هەرێمەکان، نەبووە هۆی وەستاندنی ئەو گیانە زانستییەی کە پێشتر لەو هەرێمانەدا باو بوو، بە پێچەوانەوە، لە سەردەمی ئومەوییەکاندا ئەم بارە زیاتر بوو و ئەو لێبوردنە ئایینییەش بووە هۆی

---

(١) دي لاسي أوليري: العلوم اليونانية، ص١٨٩ – ١٩١ " د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص١٢٩ – ١٣١ " زغيتر هونكة: م.س، ل ٣٦٤ – ٣٦٥.

(٢) حسين العودات: العرب والنصارى عرض تاريخي، الأهالي للنشر والتوزيع، دمشق، ط١، ١٩٩٢م، ص١٠٥ – ١٠٧ " د.الشحات السيد زغلول: م.س، ل ١٢٩ " د.سلوى بالحاج صالح – العايب: المسيحية العربية وتطوراتها من نشأتها الى القرن الرابع الهجري / العاشر الميلادي، دار الطليعة بيروت، ط٢، ١٩٩٨م، ص٢١٤ " أوليري: العلوم اليونانية، ص١٨٨" الرافعي: م.س، ص٥٨.

کردنـەوەی دەرگـای پـەیڤین و گفتوگـۆی ئـایینی لـە نێـوان ئـایینی مەسـیحیی و ئیسلامدا، کە زۆرجار خەلیفەکان خۆشیان ئامادە دەبوون[1].

لێرەوە دەبینین کە مەسیحییەکان هەوڵیانـدا فێـری زمـانی عـەرەبی بـبن، بـەم جـۆرەش لـە ڕووی زمانەوانییـەوە خۆیـان لەگـەڵ مـسوڵمانە (فـاتح)ەکانـدا یـەکلایی کردەوە، زمانی عەرەبی بوو بە زمانی ڕەسمیی ئەو هەرێم و ناوچانە، ئەمـەش بـووە هۆکارێـك تـا زیـاتر بتـوانن پـەیڤینی ئـایینی لەگـەڵ مـسوڵمانانـدا بکـەن و لەلایـەکی دیکەیشەوە لـەم ڕێگایـەوە بتـوانن فەرهـەنگ و کولتـوور و شارسـتانیەتی سـریانی و یۆنانی وەربگێڕنە سەر زمـانی عـەرەبیی، ئەمـە جگـە لـەوەی چـەندین کاریگـەرییان لەسەر زمان و ڕێزمانی عەرەبیی هـەبوو[2]، هـەروەك لـەم بارەیـەوە (الخـوارزمي) لـە کتێبەکەیدا بەشێك بە ناوی ((في وجوه الإعراب على مذهب فلاسفة اليونان)) دادەنێت و تیایدا باس لە بابەتی ئەم کاریگەرییە زمانەوانیە بە چەند دێڕێك دەکات [3].

لە ئەنجامی ئەم پەیڤین و گفتوگۆیانەشەوە بە کاریگەریی فیکری مەسیحییەکان و فەلسەفەی یۆنـانی، چـەندین بابـەتی فەلـسەفیی و فیکریـی لـە نـاو ئیـسلامدا لـەم سەردەمەدا دەرکەوتن، لە ئەنجامدا بووە هۆی دەرکەوتنی چـەندین گـروپ و ڕێبـازی

---

(١) د.أميرة حلمي مطر: الفكر الإسلامي و تراث اليونان، الهيئة المصرية العامة للكتـاب، مـصر، ط١، ١٩٩٦م، ص٨ -٩ " العودات: م.س، ص ١٠٨ – ١٠٩ " فاضل خليـل إبـراهيم: خالـد بـن يزيد سيرته وإهتماماته العلمية – دراسـة في العلـوم عنـد العـرب، دائـرة الـشؤن الثقافـة والنـشر، العراق، ط١، ١٩٨٤م،ص٣٧ " جوستاف أ. ظون جرونباوم: م.س، ص ٢٣٢ – ٢٣٧.

(٢) الأب سـهيل قاشـا: الفكـر الـسرياني وأثـره في الفكـر العربـي، سـايتی ئینتـەرنێتیی http://www.terezia.org " دور النـصارى في الحـضارة الإسـلامية، سـایتی ئینتـەرنێتیی http://www.terezia.org " زغيريد هونكة: م.س، ص٣٦٧ " د.الشحات السيد زغلـول: م.س، ل ١٢٣– ١٢٥.

(٣) بڕوانە: مفاتيح العلوم، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، (د.ت)، ص٣١.

جیاواز لە ناو فیکری ئیسلامییدا، لە دیارترینی ئەوانەش گرووپی (القدریة*) بوون کە بە دوایدا (المعتزلة**)هات و هەروەها بە دوای ئەمانیشدا (الجبریة***) لە کۆتایی سەردەمی ئومەوییەکاندا، لە هەردوو ناوەندی زانستیی ئەوکاتی جیهانی ئیسلامیی

---

* القدرية: یەکەم کەسێك کە بانگەشەی (القدرة)ی کردووە، پیاوێك بوو لە عێراق بە ناوی (سوسن)، سەرەتا مەسیحیی بوو، پاشان بوو بە مسوڵمان و پاشان بوویەوە بە مەسیحی، پاش ئەمیش (معبد الجهني) ئەم بۆ چوونەی وەرگرت و بانگەشەی بۆ کرد، لێرەوە بیرەکە بڵاوبۆتەوە، و پوختەی بۆچوونەکانیشیان ئەوەیە کە مرۆڤ ئازادە لەوەی کە چی دەکات و توانای خۆیەتی لە کردەوەکاندا، خۆیەتی کە ئەو کردەوانە ئەنجام ئەدات، چ بە چاکە بن، یان بە خراپە و پاشان لەلایەن خوای گەورەوە پاداشتی کردەوەکانی خۆی وەردەگرێتەوە لە دواییدا. إبن قتيبة: المعارف، تح. د.ثروة عكاشة، دار المعارف، القاهرة،(د.ت)، ل ٦٢٥" الأشعري: مقالات الإسلاميين وإختلاف المصليين، تح. هلموت ريتر، دار أحياء التراث العربي، بيروت،ط٣ (د.ت)، ص٤٣٠ " إبن العبري: تاريخ مختصر الدول، تح. ألأب أنطوان صالحاني اليسوعي، دار الرائد اللبناني، بيروت،ط٢، ١٤١٥هـ / ١٩٩٤م، ص٤١.

** المعتزلة: ئەم زاراوەیە بە سەر شوێنکەوتووانی (واصل بن عطاء ٨٠ – ١٣١ ك) و (عمرو بن عبيد ٨٠ – ١٤٥ك) دابڕا، کاتێك لە کۆڕی وانەوتنەوەی (حەسەنی بەسری ٢١ – ١٠٨ك)، لە مزگەوتی بەصرە خۆیان دوورە پەرێزگرت، ئەمەش لەبەر جیاوازیی بۆ چوونیان لەگەڵ مامۆستاکەیاندا لە بارەی ئازادیی و هەروەها دەربارەی خاوەنی تاوانە گەورەکان، پوختەی بۆچوونەکانیشیان لە ئازادی مرۆڤ و نەفی سیفاتی خواوەندیی و هەروەها (المنزلة بين المنزلتين) و چەند شتێکی دیکەدا دەبینێتەوە، دەتوانین بڵێین درێژکراوەی گرووپی (القدرية) بوون، بڕوانە: البغدادي: الفرق بين الفرق، دار الآفاق الجديدة، بيروت، ط٢، ١٩٧٧م، ص١٥ – ١٨ " الأسفراييني: التبصر في الدين وتمييز الفرقة الناجية عن الفرق الهالكين، تح.كمال يوسف الحوت، عالم الكتب، بيروت، ط١، ١٤٠٣هـ -١٩٨٣م، ص٢٢ – ٢٤.

*** الجبر: شوێنکەوتووانی ئەم گرووپە پێییانوایە کە سەرجەم کار و کردەوەکانی مرۆڤ لە دەست خوای گەورەدایە و خۆی هیچی لە دەسەڵاتدا نییە، لە بانگەشەکارانی ئەم گروپەش (الجعد بن درهم ١٢٠ك) و (الجهم بن صفوان ١٢٨ك ) کۆچی دواییان کردووە، الشهرستاني: الملل و النحل، ج١، ص٧٩.

که بریتی بوون له (کوفه و بەصره) پەیدا بوون[1]، لەم بارەیەوە (إبن العبری) لە دەقێکیدا دەڵێت: ((پێدەچێت ڕێبازی (قەدر) ئەنجامی کاریگەریی مەسیحیی یۆنانیی بێت، قەدەرییەکانیش کۆنترین گروپی فەلسەفیی ئیسلامیین و دەتوانین ڕێژەی بەربڵاوی بۆچوونەکانیان بەوەدا بزانین، که دوو خەلیفەی ئومەوییەکان قەدری بوون، ئەوانیش معاویەی دووەم و یەزیدی دووەم بوون))[2].

به هاتنی دەوڵەتی عەبباسییش، ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو، چونکە ئاشکرایە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان سەردەمی بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامیی و پێشکەوتنیەتی، هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە، خەلیفەکانی هەوڵیان دەدا کە هانی زانست بدەن و هۆکارەکانی ڕابوونی زانستیی لە سەردەمیاندا فەراهەم بکەن، ئەمەش لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور)ەو زیاتر دەردەکەوێت، کاتێك زانایانی (أهل الذمة)ی لە خۆی نزیك دەکردەوە و پلە و پایەی بەرزی پێدەدان و هانی زانست و وێژە و وەرگێڕانی دەدا، بەتایبەتی لە شارستانیەتی یۆنانییەوە، پاش ئەمیش (هارون الرشید)، ژمارەیەکی زۆری لە زانایانی دەستەبژێر لە دەوری خۆی کۆکردەوە، پاش ئەمانیش (مأمون)[3]، توانی پێشەنگی ئەوانەی پێشووی بێت لە هاندانی زانستکاران و وەرگێڕاندا، بەتایبەتی لە شارستانیەتی ڕۆژئاواوە، بۆ ئەمەش چەندین وەرگێڕی کارامەی لە دەوری خۆی کۆکردەوە کە لە (أهل الذمة) بوون، هەروەها چەندین پارەی خەرج کرد لەپێناو دەستکەوتنی کتێبەکانی شارستانیەتی یۆنانی و وەرگێڕانیان، لە سەردەمیدا سەرەتای گرنگییدان بە پەیڤینی فەلسەفیی و زانستە پزیشکییەکان و چەندین کێشەی فیکریی دەرکەوتن، کە لە ئەنجامی تێکەڵی

(١) د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص١٥٦ – ١٦٤ " دي لاسي أوليري: العلوم اليونانية، ل ١٩٥ – ١٩٩" فاضل خليل إبراهيم: خالد بن يزيد سيرته وإهتماماته العلمية - دراسة في العلوم عند العرب، دائرة الشؤن الثقافية والنشر، العراق، ط١، ١٩٨٤، ص٣٩ – ٤٣.

(٢) تاريخ مختصر الدول، ص٤٩.

(٣) لەبارەی کۆڕبەندی زانایان لە سەردەمی (هارون الرشید) و کوڕەکانیدا بڕوانە: الزجاجي: مجالس العلماء، تح. عبدالسلام هارون، وزارة الإعلام، الكويت، ١٩٨٤م، ل ٨، ٣٥، ٤٢، ١٩٧، ٢٥٥.

و ئاوێتەبوونی شارستانیەتی یۆنانییەوە بوو، ئەمیش لە ڕێگای (أهل الذمـة)ەوە بـوو بەگشتی.

بەهـەر حـاڵ، هـەر لـە بـارەی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکانەوە، کۆمەڵـە هۆکـارێکی دیکـە هـەبوون کـە پاڵنـەر بـوون بـۆ ڕابوونـە زانـستییەکەیان، ئـەوانیش کردنەوەی (بیت الحکمة) بۆ نووسینی کتێب و وەرگێڕان، هەروەها بەسوود وەرگـرتن لە (چینییەکان)یش لە سەردەمی (هارون الرشید) کاتێك یەکەم کارگەی دروستکردنی وەرەقە دروست بوو کە ڕۆڵـی گـەورەی بینـی لـە زۆربـوونی وەرەقـە و کتێبیـشدا[1]، هەروەها لـەم سـەردەمەدا چـەندین بنەماڵـە و کەسـایەتیی ناعـەرەب دەرکـەوتن کـە یارمــەتیی و هــانی پێــشکەوتنی زانــست و بــە تایبــەتیش وەرگێڕانیــان دەدا لــە شارستانیەتی یۆنانیەوە، لەوانەش بنەماڵەی (البرامکة)کان و کوڕەکـانی (موسـی بـن شـاکر) و هــەردوو وەزیـر (الفـضل بـن سـهل و محمـد بـن عبـدالملك الزیـات)، کـە گرنگییــەکی زۆریــان بــە زانــستەکان و هــەروەها وەرگێــڕان دەدا، بــە تایبــەتی لــە گریکییەوە، دیارە ئەگەر بە وردییش لەم بابەتە بڕوانین، ئەو بەرزبوونەوەیەی ئاستی (مـوالي)مـان بـۆ دەردەکـەوێت کـە هـەر لـە سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکانەوە دەرکەوتووە، هەروەك لە باسی (موالي)یەکاندا لێی دواین، بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە ئەم ڕابوونە زانستییەی سەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکان، بەتایبـەتی لـە سەردەمی (هارون الرشید) نە دەهاتە دی ئەگەر ئەو پێشکەوتنە داراییە نەبوایـە کـە لە سەردەمی عەبباسییەکاندا بەدەستهاتبوو، بـە تایبـەتییش لـە سـەردەمی خەلیفـە (هارون الرشید) کە سەرجەم هەرێمەکان پاش ئەوەی پێداویستی خۆیان لە (خـراج و جزیة) دەردەکرد، ساڵانە (٤٠٠) ملیۆن درهەمیان بۆ (بیـت المـال) دەنـارد، هـەروەها

(١) أحمد الرفاعي، عصر المأمون، القاهرة، ط١، ١٩٢٧م، ل ٣٣ – ٣٧ " د. أميرة حلمـي مطـر: م.س، ص٩.

کاتێکیش کە خەلیفە (هارون الرشید) کۆچی دوایی کرد، (٩٠٠) ملیۆن درهەمی لە (بیت المال)دا بەجێهێشت[(١)].

هێشتنەوەی ناوەندە زانستییەکانی یۆنانیی لە ڕۆژهەڵاتدا لە سەردەمی ئومەوییەکاندا و هەروەها ئەو ڕێزگرتنەی کە لە (أهل الذمة)یان دەگرت بەگشتی، بووە یارمەتیدەر و بنەمایەکی باش بۆ عەبباسییەکان و سوودیان لێوەرگرت لە ڕابوونە زانستییەکەیاندا، بەتایبەتییش ئەگەر ئەوە بزانین کە ئومەوییەکان بەلای زانستەکانی یۆنانییدا کە بە (علوم الأوائل)یان پێدەگوت، نەدەچوون، لەم بارەیەوە (حاجي خليفة) دەڵێت: (((علوم الأوائل) لە سەردەمی ئومەوییەکاندا پشتی تێکرابوو))[(٢)].

بە هەرحاڵ بەمجۆرە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانیشدا (أهل الذمة)، هەمان ئەو ڕۆڵەی خۆیان هەبوو کە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا هەیانبوو، بەڵکو دەتوانین بڵێین زیاتریش بوو، چونکە لەم سەردەمە ئیدی دەوڵەت ڕووی کردە زانستەکانی یۆنانیی و باشترین کەسانێکیش کە بیانتوانیایە ئەم زانستانە بگەیەنن بە شارستانیەتی ئیسلامیی بریتی بوون لە (أهل الذمة)کان بە گشتی و (سریانەکان بە هەردوو ڕێبازی (نسطوری) و (یعاقبة) و (صابیئە)کان بەتایبەتی، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەلایەك ئەمان بۆ خۆیان پاشماوەی ئەو شارستانیەتە بوون و وەك کولتوورێك لە سەردەمی (هیلنستی)یەکانەوە بۆیان مابۆوە، لەلایەکی دیکەیشەوە بۆ خۆیان زۆرێکیان لە زانستەکانی یۆنانی وەرگێڕابووە سەر زمانی سریانی، چ بۆ

---

(١) لەبارەی ڕابوونی زانستیی شارستانییەت و بنەما و دیاردەکانی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، بڕوانە: إبن خلدون: المقدمة، ص٤٦٧ " إبن طباطبا: الفخري في الآداب السلطانية، بيروت، (د.ت)، م ١٤٩ – ١٥٠ " إبن صاعد الأندلسي: طبقات الأمم، تح. حياة بوعلوان، بيروت، ١٩٨٥م، ص ١٢٨ – ١٢٩ " السيوطي: تاريخ الخلفاء، تح. رحاب عكاوي، بيروت، ١٩٩٢م، ص٢٥٩، ٢٦١، ٢٦٩، ٢٨٤، ٣٢٧ " محمد خضري بك: الدولة العباسية، بيروت، ١٩٩٤م، ص٨٩، ١٣٠، ١٣٢، ١٣٧، ١٤٣، ١٥٧.

(٢) كشف الظنون، ج١، ل ٣٤.

خۆشەویستی ئەو زانستانە بێت، یان بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گروپە فەلسەفییانەی کە لەناو مەسیحییەکاندا دەردەکەوتن، سەرباری ئەمانەش (أهل الذمة)کان هەر لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە زۆر بە باشی فێری زمانی عەرەبیی بوون، هەروەك لە پێشەوە لێی دواین، لە کاتێکدا زۆر بە باشی زمانی یۆنانیی و سریانییشیان دەزانی، بۆیە دەتوانرا سوودیان لێ وەربگیرێ بۆ وەرگێڕان، بە تایبەتی لە هەردوو زمانی یۆنانیی و سریانییەوە کە لە دواجاردا بوونە پێشەنگی وەرگێڕکارانی دەوڵەتی عەبباسی لە گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانییدا، بەهەرحاڵ، لێرەوە بوو کە خەلیفەکانی عەباسی هەر زوو هەستیان بە گرنگیی ئەمانە کرد و لە خۆیانیان نزیككردنەوە و دەرگای زۆرێك لە بابەتەکانیان لە بەردەمدا واڵاکردن و هەروەك سەردەمی ئومەوییەکان چەندین دەسەڵات و پلەو پایەی دیاریان لەناو خەلافەتدا، پێدرا[1]، ئەوەی جێگای باسە لە سەردەمی عەبباسییەکاندا، بە هاوشێوەی ئومەوییەکان، لێبوردەیی ئایینی لە بەرامبەر (أهل الذمة)کاندا هەر بەردەوام بوو، بۆ نموونە هەرگیز خەلیفەکانی عەبباسی خاوەن پلەوپایەکانی ناو کۆشکەکانیان کە مەسیحی بوون، ناچار نەکراون کە ببنە موسوڵمان، لەم بارەیەوە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بۆ ڕووداوێك دەکەن کە جارێکیان خەلیفە (أبوجعفر المنصور) لە کاتی نەخۆشکەوتنیدا لە بەغدا لە ساڵی (١٥٢ ك – ٧٦٩ز) بە پزیشکە تایبەتیەکەی (جورجیس)، دەڵێت: ((ئەی حەکیم لە خوا بترسە و مسوڵمان ببە!!)) ئەویش لە وەڵامدا زۆر بە سانایی پێی دەڵێت: ((من لەسەر ئایینی خۆم ڕازیم، هەرچەندە ئەگەر

---

(١) الأب باسيليوس محفوظ، دور المسيحيين العرب في بناء الحضارة الإسلامية، سایتی ئینتەرنێتیی http://frbassilmahfoud.orthodoxonline.org “ الأب جورج شحاتة قنواتي: المسيحية والحضارة العربية، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، ط٢، ١٩٨٤، ل ٩٦ - ٩٧، ١٠٢ – ١٠٣ “ حكمت نجيب عبدالرحمن: دراسات في تاريخ العلوم عند العرب، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٣٩٧هـ، ١٩٧٧م، ص١٩ – ٢٠ “ د.سلوى بالحاج صالح – العايب، م.س، ٢١٤ – ٢١٥.

باوانم له بەهەشتدا، بن یان لـه ئـاگر))، خەلیفـەش بـەم هەواڵـه پێدەکـەنێت[1]، لـەم دەقەوە تا ڕاددەیەك لێبوردەیی ئایینی و هەروەها پلەوپایەی ئەو مەسیحییانەشمان بۆ دەردەکەوێت کە لە ناو (بلاطي) عەبباسییدا کاریان کردووە، بەجۆرێك کە خەلیفە ڕێگای دا بە (الجاثلیق*)ی (نسطوري)یەکان کە لە بەغداد نیشتەجێ ببێت [2].

بـەڵام پێدەچـێت ئـەم لێبوردنـە ئایینییـە و ئـەم ڕێگەپێدانـە تـەنها ئـەو (أهـل الذمة)انەی گرتبێتەوە کە بە لایەنی زانستییەوە خـەریك بـوون، بـۆ خۆیـان دوور لـە سیاسەت و بـە بێـوەیی لـە ژێـر سـایەی خەلافـەتی ئیـسلامییدا ژیـاون، چـونکە لـەم سەردەمەدا ئەو مەسیحییانەی کە لە (ثغور) بـەرەکانی شـەڕ بـوون و یارمـەتی ڕۆمـە بێزەنتییـــەکانیان دەدا لـــە دژی دەوڵـــەتی خەلافـــەت، یـــاخود لـــەناوخۆی وڵاتـــدا هەڵگەڕانــەوەی سیاســییان ئەنجامــدەدا، بــە توندترین شــێوە لەلایــەن خەلافــەتی ئیـسلامییەوە بەرپـەرچ دەدرانـەوە[3]، بۆیـە دەبیـنین زۆرێکیـان لـە پێنـاو مانـەوەی خۆیان و هەروەها بۆ ئـەوەی ئـەو لێبوردنـە ئایینییـە بیانگرێتـەوە کـە لێـی دوایـن و لەبەر بەرژەوەندیی تایبەتی خۆشیان، ڕوویان کـردە لایـەنی زانـستیی و وەرگێـڕان و بڵاوکردنەوەی فیکر و فەلسەفە و پەیڤین کردن لەگەڵ موسوڵمانەکاندا، بۆیە لێـرەوە

---

(١) القفطي: أخبار العلماء، ص١١ " إبن العبري: م.س، ص٦٧.

* الجاثليق: زاراوەیەکی یۆنانیە کە بە (Catholicos) هاتووە و مانای (گشتی)یـە، مەبەسـت پێی سەرۆکی ئاینی بەرزی گەیاندووە لەلای نساگرەکان لە هەردوو سەردەمی پادشا ساسانیەکان و خەلیفەکانی عـەبباسـی، وە لـە ئـەمڕۆدا ئـەم زاراوەیـە هـاو واتـای (البطریـك)ە (patriarch). الشابشتي: الديارات، تح. كوركيس عـواد، مطبعـة المعـارف / بغـداد، ط٢، ١٣٨٦هـ/ ١٩٦٦م، ص٢٨.

(٢) الأب جورج شحاتة القنواتي: م.س، ل ١٠٢.

(٣) ا.س.برتون: أهل الذمة في الإسلام، تر.حسن حبشي، دار المعارف، القاهرة، ١٩٦٧م، ص١٩٤ " جان موريس فيت: أحوال النصارى في خلافة بني العباس، تر. حسين زينـة، دار المشرق، بـيروت، ١٩٩٠م، ص٩٤ " توفيق سلطان اليوزبكي: أهل الذمـة في العـراق، الريـاض، ١٩٨٣، ص١٥٣ — ١٥٤ " يعقوب نخلة روفيله: م.س، ص٨١، ٨٢.

مەسیحییەکان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا جۆرێك لە قۆرخکارییان تیادا دەرکەوت لە سەرجەم بوارەکانی زانستەکان و وەرگێڕانیشدا، بە تایبەتی کاتێك هەندێك بنەماڵەیان تیادا دەرکەوت، بۆ نموونە بنەماڵەی (آل بختشیوع)، قۆرخکاریی لەم بنەماڵەیەدا لەوەوە دەردەکەوێت، کە نەیاندەهێشت زانست و پیشەی پزیشکیی لە ناو (بلاط)ی عەبباسییدا لەخۆیان دەربچێت، بۆیە دەبینین پزیشکەکە نهێنی پیشەکەی و چۆنییەتی کردارەکانی فێری کوڕەکەی دەکرد، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کاتێك (جورجیس) نەخۆشخانەکەی بەجێهێشت لە (جندنیسابور) و بەرەو بەغداد کەوتە ڕێ، بۆ چارەسەرکردنی خەلیفە (ابو جعفر المنصور)، بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکەی بۆ (بختشیوع)ی کوڕی بەجێهێشت، کاتێکیش خەلیفە (هارون الرشید) پرسیاری لە (بختشیوع) کرد، کە ئەو زانستی پزیشکییە لە کێوە فێر بووە، لە وەڵامدا وتی: ((لە (جورجیس)ی باوکیەوە فێر بووە))[1]، هەروەها ئەم بنەماڵانە خوویان بەوەوە گرتبوو کە پێویستە باوك کتێبێك بۆ کوڕەکەی دابنێت، بۆیە دەبینین (بختشیوع) کتێبی (التذکرة)ی بۆ کوڕەکەی، (جبرائیل)، بەجێهێشت، بۆ ئەوەی وەك ڕێبەرێك لەبەردەستیدا بێت لە کاتی ئەنجامدانی پیشەکەیدا، هەروەها ئەگەر نموونەیەکی دیك هەر لەسەر ئەم بنەماڵەیە وەربگرین، دەبینین کاتێك (جعفر البرمکي) داوا لە (بختشیوع) دەکات، کە پزیشکێکی بۆ دیاریی بکات تا خزمەتی بکات، ئەویش (جبرائیل)ی کوڕی بۆ دیاریی دەکات و پێی دەڵێت کە لە خۆی باشترە[2]، ئەمەش زیاتر ئە بابەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن هەوڵیان داوە ئەو پلەوپایەیان لە دەست نەچێت، لەم بارەیەوە (الجاحظ) لە دەقێکیدا دەڵێت: ((جارێکیان (أسد بن جاني) کە پزیشکێکی بە ڕەگەز عەرەب دەبێت بە بێ کەڵك و ئیش و کار دادەنیشێت، یەکێك دێت و پێی دەڵێت: لەکاتێکدا چەندین نەخۆشی زۆر بڵاوبۆتەوە و تۆش زانایت و خاوەنی ئارامگریی و خزمەتێکی زۆری و شارەزایی و

---

(١) إبن أبي اصيبعة: عيون الأنباء، ج٢، ص٣٨ – ٤٣ " إبن النديم: الفهرست، ص٥٩١ " القفطي: م.س، ص٧١ " الأندلسي: م.س، ل ٤٠.

(٢) إبن أبي أصيبعة: م.ن، ج٢، ل ٤٣ – ٤٦ " القفطي: م.ن، ٩٤ – ٩٩.

زانیارییت هەیە لە بواری پزیشکییدا، ئەم بێکەڵك دانیشتنەت لە چی؟!!، لە وەڵامدا پێی دەڵێت: ئەمە لەبەر چەند هۆکارێکە، یەکەم لەبەر ئەوەیە کە من مسوڵمانم، ئـەم قەومەش پێش ئەوەی من ببم بە پزیـشك، بـەڵکو پـێش ئـەوەی منـیش دروسـت بـبم پێیانوابووە کە مسوڵمان بـە کـەڵکی پیـشەی پزیـشکیی نایـەت، مـن نـاوم (أسـد)ە، دەبوایە ناوم (صليب، يان مرايل، يان يوحنا، يان وبيرا) بوایە، هـەروەها نازناوەکـەم (أبوالحارث)ە، دەبوایە أبو عيسى، یان أبو زكريا، یان إبراهيم بوایە، هەروەها دەبێت جلوبەرگی سپی بپۆشم، نەك جلوبـەرگی حـەریری ڕەش، بـە عـەرەبیش دەدوێـم کـە دەبوایە بە زمانی خەڵکی جندیـسابور قـسەم بکردایـە))[1]، لـەم دەقەشـەوە ڕاددەی قۆرخکردنی ئەو پیشەیەمان بۆ دەردەکەوێت، بەتایبـەتی لەلایـەن مەسـیحییەکانەوە لەو سـەردەمەدا، کـە ئەمـەش دواجـار بـووە هـۆی بڵاوبوونـەوەی ئـەم زانـستانە لـە ڕێگایانەوە بە تێکەڵبوونیان لە ناوەندە زانستییەکانیانەوە بە خەڵکیی.

هەروەها لە بواری وەرگێڕاندا، (أهل الذمة)کان، بـە هـەمان شـێوە قـۆرخی ئـەم بوارەشیان کردبوو، بە هەردوو زمانی وەرگێڕانی شارستانیەتی یۆنـانیی (سـریانیی و یۆنانیی) بۆ عەرەبیی، هەروەك چۆن ئەمانە لە پاش وەرگێڕانی ئـەو زانـستانەش لـە گەیاندنیاندا بە شارستانیەتی ئیسلامیی ڕۆڵیان هـەبووە و مـسوڵمانانیان فێرکـردووە لە زانستە وەرگێڕدراوەکانی وەك فەلسەفە و پزیشکیی و دەرمانسازیی و سروشـت و بیرکاریی و گەردووناسی و تەواوی زانستەکانی دیکە، چەندین وەرگێڕی کارامـە لـەم بوارەدا دەرکەوتن، لەوانەش (أصطغان القديم و بطريق و کوڕەکەی أبو زكريـا يحيـى بن بطريق حجاج بن مطر و عبـدالله الحمـصي النـاعمي و سـلام الأبـرش و أبـو نـوح و إبراهيم بن الصلت و عيسى بن نوح دريع الراهب و قسطا بن لوقـا حـنين بـن إسـحق و عبادي و ثابت بن قرة و کوڕەکەی سنان و عيسى بن يحيـى و يحيـى بـن عـدى و بنـو

---

(١) البخلاء، تح. أحمد العوامري بك و علي الجارم بك، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م، ج٢، ص٤ – ٥.

حماتي النصاري الأقباط) و ژمارەیەکی دیکەی یەکجار زۆری وەرگێڕکاران کە لەم بوارەدا ڕۆڵی دیاریان بینیوە[1].

**سێیەم: خوێندنگای (دێرە) مەسیحییەکان و ڕۆڵیان لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانی بە شارستانیەتی ئیسلامیی:**

لە دێرەکانی مەسیحییەکاندا بە هەردوو ئاینزای (نساطرة و یعاقبة)، چەندین خوێندنگای تایبەتیان هەبوو کە بە سریانی (أسكول)یان پێدەگوت و ئەمیشیان لە زاراوەی یۆنانیی (Scholae) وەرگرتبوو، کە مەبەست لێی خوێندنگای مەسیحیی، یان ئەو خوێندنگایانەی کە بە دێرەکانەوە بەستراو بوون[2].ئەم خوێندنگایانە لە پاش (فتوحات)ی ئیسلامییەوە بۆ ناوچەکانیان وەك خۆیان مانەوە و بە شێوەیەکی گشتییش لەم خوێندنگایانەدا سەرباری زانستە ئاینییەکانی مەسیحیی، زانستەکانی دیکەی وەرگێڕدراوی شارستانیەتی یۆنانیی بە چڕیی دەخوێندران، وەك: فەلسەفە و پزیشکیی و مۆسیقا و بیرکاریی و گەردووناسیی کە لەلایەن پیاوانی ئاینیی مەسیحییەوە دەگوترانەوە، هەروەها لەم خوێندنگایانەدا زۆرجار مسوڵمانیش وانەی دەخوێند و فێری زانستەکان دەبوو، هەروەها هەندێکجار ڕۆڵی ناوەندی بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیریی یۆنانییشیان دەبینی، ژمارەشیان زۆر بوو، چەندین کەسایەتیی دیاریشیان تیادا دەرکەوت، بەتایبەتی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا کە زیاتر لەم ماوەیەدا ڕۆڵیان بینی، سریانەکان بە تەنها لە ناوچەی عێراقی ئێستادا، پەنجا خوێندنگایان دامەزراندبوو، کە تیایاندا زمانی عەرەبیی لە پاڵ زمانەکانی سریانیی و یۆنانیی و فارسییدا دەخوێندرا، لەپاڵ ئەمانەشدا زانستە عەقڵییەکانی بە باشی تیادا دەخوێندرا، کە بریتی بوون لە زانستەکانی پزیشکیی و

---

(١) حسين العويدات: م.س، ص١١٠ – ١١١.

(٢) الأب د.جورج شحاته قنواتي: م.س، ص٩٣.

لۆژیـك و فەلـسەفە و زانـستی ئایینـەكان (علـم اللاهـوت)، هـەروەها هەریـەك لـەم خوێندنگایانەش چەندین گەنجینەی كتێبی گەورەیان هەبوو[1].

كاتێـك كـە خەلیفـە (أبـو جعفـری منـصور) بەغـدادی دروسـت كـرد و خـەڵكیش ڕوویان لەم شارە نوێیە كرد، (سبریشوع الجثلیق) كە یەكێك بـوو لـە گـەورە پیـاوانی ئـایینی مەسـیحیی ئـەوكات، ڕووی كـردە بەغـداد و (أسـكول)ێكـی دروسـتكرد و فێرخوازانی تیادا كۆكردەوە، هەروەها لە بەری (كرخ) خوێندنگایـەكی دیكـە هـەبوو، هەر لەوكاتەدا كە بە دەیەها خوێندكار تیایانـدا دەیانخوێنـد، بـەڵام گـەورەترین ئـەو خوێندنگایانە خوێندنگای (مارماری) بوو، لە بەغدادەوە دوور بوو، لـەناو (دیـرقنی)دا بوو، لەم خوێندنگایەوە چەندین زانای گەورەی سـریانی و مەسـیحیی پێگەیـشتوون، لە ناوچەی (موسڵ)یش چەندین خوێندنگای تیـادا دەركـەوت، لەوانـەش خوێنـدنگای (دیرمار جبرائیـل)ی ناسـراو بـە (دیـر الأعلـی) لەسـەر ڕووبـاری دیجلـە، خوێنـدنگای (دیرمـار میخائیـل) لـە بـاكوری موسـڵ، خوێنـدنگای (الـنبي یـونس) لـە نەینـەوا، و خوێندنگای (مار إیلیا الحیری) لە ڕۆژئاوای موسـڵ، كـە لـەم خوێندنگایانـەدا تـەواوی زانـستەكانی فەلـسەفە و لاهـوت و زمانـەكان دەخوێنـدران. هـەروەها چـەندین خوێندنگای دیكەیش هەبوون كە سریانەكان، بەتایبەتی (نساطرة) دایانمەزرانـدبوون، لەوانەش: خوێندنگاكانی (قسطنون) و خوێندنگای (قنسرین) لەسەر (فوڕات) كـە بـە خوێنـدنی فەلـسەفەی یۆنـانیی ناوبـانگی دەركردبـوو[2]، دیـارترین فێرخوازانیـشی (سـویریوس) بـوو كـە زانـستی فەلـسەفە و زانـستی ئـایینی وەرگێڕایـە سـەر زمـانی سـریانی و لـە فێرخوازەكـانی ئـەمیش (یعقـوب الرهـاوی) بـوو كـە زانـستی (نحـو)ی سریانی دانا و هەروەها (جورجیوس) كە بە (أسقف العـرب) ناسـرابوو، تـوانی چـەند كتێبێكی ئەرستۆ وەربگێڕێـت، ئـەم (أسـكول)انـە چـەندین ڕۆڵـی دیاریـان هـەبوو لـە

---

(١) إبن النديم: م.س، ص٢٢٣" فاضل خليل إبراهيم: م.س، ص٣٨ " حكمت نجيب عبدالرحمن، م.س، ص٢٠ " الأب سـهيل قاشـا: السريان وأثـره في الفكـر الاسـلامي، سـایتی ئینتـەرنێتیی http://www.terezia.org.

(٢) الشابشتي: م.س، ص٣٩٣-٣٩٦ " الأب سهيل قاشا:م.ن.

بڵاوكردنـــەوەی ڕۆشـــنبیریی و شارســـتانیەتی یۆنانییـــدا، هـــەروەها هـــەر لـــەم خوێندنگایانەشەوە بوو كە چەندین زانـا و ئـەدیب و نووسـەری سـریانیی لـە هـەردوو ئـاینزای (نـساطرة و یعاقبـة)وە دەركـەوتن و دیارترینیـشیان لـە سـەردەمی یەكـەمی عەبباسییدا (یوحنا بن ماسویە) كـە سـەرۆكی گـەورەترین خوێنـدنگای بەغـداد بـوو، هـەروەها لـە سـەردەمی (هـارون الرشـید) كـرا بـە چـاودێری سـەرجەم خوێنـدنگا مەسیحییەكان و پاشان پلەی سەرۆكی نهێنی وەرگێڕانی وەرگـرت كـە تـا سـەردەمی (المتوكـل علـى الله) لـەو پۆسـتەی مایـەوە (حـنین بـن إسـحاق) كـە پێـشەنگی وەرگێڕكارانە و بـە سـەرۆكی دەسـتەی فەیلەسـوفان و پزیـشكانی سـەردەمی خـۆی دادەنرێت[1].

بەهەرحاڵ، لێرەوە و لە كۆتایی ئەم باسەدا دەگەینە ئەو ڕاستیەی كە ئـەنجامی فتوحاتی ئیسلامیی تێكەڵ بوون و ئاوێتەبوونی گەلانی ناعەرەب و نامسوڵمان بوو بە شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، بـە تایبـەتی (أهـل الذمـة)كـان، كـە بـەو زانـست و شارستانیەتەی هەیانبوو توانیان لە ڕێگای گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانییەوە بۆ شارســـتانیەتی ئیـــسلامیی كاریگـــەریی گـــەورەیان لـــە بەرەوپێـــشبردنی ئـــەو شارسـتانییەتەدا هـەبێت و ئەنجامەكەشـی ڕابـوونی شارسـتانیەتی ئیـسلامیی لـە سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكاندا لێبكەوێتەوە.

(١) العویدات: م.س، ص١١٠ – ١١١ " فاضل خلیل إبراهیم: م.س، ص٣٩ – ٤٣.

## بەشی سێیەم: بزووتنەوەی وەرگێڕان و ڕۆڵی لە گەیاندنی شارستانیەتی یۆنانیی بە شارستانیەتی ئیسلامیی لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا

### باسی یەکەم: بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا و دیاردە و هۆکارەکانی:

سەردەمی خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنصور ١٣٦–١٥٨ك ٧٥٣–٧٧٤ز

سەردەمی خەلیفە هارون ئەلڕەشید ١٧٩–١٩٣ك / ٧٨٦–٨٠٨ز

سەردەمی خەلیفە مەئمون ١٩٨–٢١٨ك / ٨١٨–٨٣٣ز)

سەردەمی خەلیفە ئەلواسیق بیللا ٢٢٧–٢٣٢ك / ٨٤١–٨٤٦ز)

هۆکاری ئایینی:

پشتگیریی و هاندانی هەندێك بنەماڵە بۆ بزووتنەوەی وەرگێڕان

پشتگیریی و هاندانی هەندێك لە وەزیران و کاربەدەستان

پێویستی لەو سەردەمەدا

زیادبوون و دروستکردنی وەرەقە (کاغەز)

### باسی دووەم: دیارترین وەرگێڕکاران و بەرهەم و شێوازەکانیان:

یوحەننا بن بەتریق. حەججاج بن مەتر. یوحەننا بن ماسویە. حونەین بن ئیسحاق ئەلعیبادی. یەعقوب بن ئیسحاق ئەلکیندی. قستا بن لۆقا بەعلەبەکی. حەبیش بن ئەلحەسەن ئەلئەعسەم

شێوازی وەرگێڕانی حەرفیی

شێوازی مانایی بۆ وەرگێڕان

## باسی یەکەم: بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا و دیاردە و هۆکارەکانی:

لە دوو بەشی پێشووی لێکۆڵینەوەکەماندا، بە وردیی باسمان لە گرنگترین بنەماکانی شارستانیەتی یۆنانیی کرد، هەروەك باسمان لە ئاوێتەبوونی ئەو شارستانیەتەش بە شارستانیەتی ئیسلامیی و کاریگەریی لەسەری کرد، ئەمەش چ بە پەیڤین و گفتوگۆکردن بێت لەگەڵ خاوەن شارستانیانی دیکە لە گەلان و وڵاتانی فەتحکراو، یان بە کاریگەریی ناوەندە زانستییەکانی، وەك: (ئەسکەندەریە و ئەنتاکیا و حران و روها و نصیبین و جندیسابور) بێت، هەروەك لێی دواین.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لە یەکێکی دیکە لە گرنگترین ڕێگا ڕاستەوخۆکانی گەیشتن و کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی بکەین بە شارستانیەتی ئیسلامیی، دیارە ئەویش بزووتنەوی وەرگێڕانە لە شارستانیەتی یۆنانییە و بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، هەرچەندە ئەم بزووتنەوەی وەرگێڕانە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا وەك بزووتنەوەیەکی داڕێژراو و ڕێکوپێك دەرکەوت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە لە پێش ئەم ماوەیەدا هیچ جۆرە چالاکیی و جموجۆڵێکی وەرگێڕان نەبووبێت، بەتایبەتی لە سەردەمی ئومەوییەکاندا سەرباری ئەوەی چەند هەوڵێك دەرکەوتووە وەك سەرەتایەك بۆ وەرگێڕانی زانستی یۆنانیی، وەك لە بەشەکانی پێشوودا لێی دواین، بەڵام ئەم هەوڵانە تاکەکەسیی بوون و بە شێوازێکی دەزگایی ڕێکخراو نەبوون، بۆیە دەبینین کاتێك کە ئەو کەسایەتییە نەماوە وەرگێڕانەکەش بەرەو لاوازیی و کۆتایی چووە.

بەهەرحاڵ، دەتوانین بڵێین ئەم هەوڵانەی سەردەمی ئومەوییەکان و پێش ئەمانیش، سەرەتایەك بوون بۆ وەرگێڕانی شارستانیەتی یۆنانیی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، کە دواجار لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا بە جۆرێکی دیکە دەرکەوتەوە و گەیشتە لوتکە.

لەم سەردەمەدا کە بە سەردەمی ڕابوونی زانستیی و پەرەسەندن و بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامیی دادەنرێت، یەکێك لە گرنگترین ڕووخسارەکانی ئەو ڕابوونە زانستییەش بریتیە لە بزووتنەوەی وەرگێڕان لەم سەردەمەدا، بە تایبەتییش لە شارستانیەتی یۆنانیەوە بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، بابەتێکی وا کە تەواوی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانی پێدەناسرێتەوە، بەڵام دیارە ئەمە مانای ئەوە نییە کە سەرجەم خەلیفەکانی ئەم سەردەمە وەك یەك وابووبێتن لە گرنگیپێدانی بابەتەکەدا و سەردەمەکانیان وەك یەك تیایدا بزووتنەوەی وەرگێڕان پەرەسەندوو بووبێت، بەڵکو ئەم بابەتە لە سەردەمی خەلیفەیەکەوە بۆ خەلیفەیەکی دیکە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە و هەر یەکە و دیاردە و هۆکاری تایبەتی سەردەمی خۆی هەبووە کە کاری کردۆتە سەر بابەتی بزووتنەوەی وەرگێڕان، بۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەین بەپێی پەرەسەندنی بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی خەلیفەکاندا، سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان بکەین بە چەند قۆناغێکەوە:

**١- سەردەمی خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصور ١٣٦ - ١٥٨ك/ ٧٥٣ - ٧٧٤ ز:**

لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمی عەبباسییەکان (أبو العباس السفاح ١٣٢ - ١٣٦ك / ٧٤٩ - ٧٥٣ ز) هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی وەرگێڕان بەرچاو ناکەوێت، ئەمەش لەبەرئەوە بووە کە ئەم خەلیفەیە زیاتر بە دانان و دامەزراندن و پتەوکردنی بناغەی دەوڵەتەکەیەوە خەریك بوو[1]، بەڵام بە هاتنی خەلیفە (أبو جعفر المنصور)، لایەنەکانی شارستانییەتیش بەرەو هەڵکشاندن چوو، (أبوجعفر المنصور) بە یەکەم خەلیفەی عەبباسییەکان دادەنرێت کە گرنگیی دابێت بە وەرگێڕان، لە سەردەمیدا بزووتنەوەی وەرگێڕان بۆ یەکەمجار بە شێوازێکی ڕێکخراو ڕێکوپێك دەرکەوت و ئەم خەلیفەیە هانی وەرگێڕان و چالاکبوونی بزووتنەوەکەی داوە بە هەموو شێوازێك و بە

---

(١) بۆ زیاتر شارەزایی لە بارەی ئەم خەلیفەیەوە، بڕوانە: محمود شاكر: التاريخ الاسلامي، الدولة العباسية، المكتب الاسلامي، ١٤٢١هـ - ٢٠٠٠م،ط٦، مج٥ /ج١ /ص٦٦ - ٩١" د.عبدالعزيز الدوري: العصر العباسي الأول دراسة في التاريخ السياسي و الاداري و المالي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت، ط٣، ١٩٩٧م، ص١٧٩ - ١٨٦.

چەندین ڕێگای جیاواز[1]، لەم بارەیەوە (السیوطي) دەڵێت: ((المنصور، یەکەم خەلیفە بووە کە لە سەردەمیدا کتێبی لە زمانەکانی سریانی و عەجەمییەوە بۆ وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی عەرەبیی[2])).

بۆیە دەبینین لە سەردەمیدا چەندین دانراوی جیاواز لە چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبیی، ئەمەش ڕەنگە لەبەر ئارەزووی تایبەتی خەلیفە (أبوجعفر المنصور) خۆی بووبێت، کە مەیل و ئارەزووی تەواوی بەلای زانستەکاندا هەبووە، بە تایبەتییش زانستی گەردوونناسیی و گەردوون ناسی، ئەمەش وای لێکردبوو کە لەو بوارەدا هانی وەرگێڕان بدات، بەتایبەتیی لە بوارێکدا کە پەیوەندیی بەو زانستەوە هەبوایە[3]، لەم بارەیەوە (المسعودي) دەڵێت: ((المنصور، یەکەم خەلیفە بوو کە ئەستێرەناسانی لە خۆی نزیك دەکردەوە و هەروەها کاری بە بنەماکانی ئەستێرە دەکرد[4]))، هەروەها سەرباری ئەم بوارەش، لە سەرجەم بوارەکانی دیکەیشدا کتێبی بۆ وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی، لەوانەش کتێبی (کلیلة و دمنة) لە زمانی پەهلەوی و کتێبی (السند هند) لە زمانی سانسکریتی هندی و هەروەها کتێبی (ئەرستۆتالیس) لە بواری لۆژیك و کتێبی (أقلیدس) لە بواری ئەندازیارییدا لە زمانی یۆنانیی و ڕۆمانییەوە.

هەروەها بە مەبەستی بەدەستخستنی زانستەکانی یۆنانیی، پەیوەندیی کردووە بە ئیمپراتۆری ڕۆمانییەوە بۆ ئەوەی کە کتێبی یۆنانیی لەو بوارانەدا بۆ بنێرێت لەم بارەیەوە (إبن خلدون) دەڵێت: ((أبو جعفر المنصور ناردی بۆ لای پادشای ڕۆمانیی بۆ

---

(١) حاجي خليفة: كشف الظنون، ج١، ص٣٤" الخفاجي: الآداب العربية في العصر العباسي الأول، دار الجيل – بيروت، ١٤١٢هـ – ١٩٩٢م، ص٥٤.

(٢) تاريخ الخلفاء، ص١٥٠.

(٣) الأندلسي: م.س، ص٦٣ – ٦٤" الجميلي: حركة الترجمة في القرنين الثالث و الرابع للهجرة، ص٧٨" د.محمد الصادق عفيفي: م.س، ص٣٧.

(٤) مروج الذهب و معاد الجوهر، ج٤، ص٥١١٤ – ٥١٥.

ئەوەی کە کتێبی لە بواری زانستەکاندا بۆ بنێرێ، ئـەویش کتێبـی أقلیـدس و هەنـدێك کتێبی لە بواری سروشتناسییدا بۆ نارد، پاشان مسوڵمانان خوێندیانەوە[1])).

هـەروەها لـەم سـەردەمەدا کۆمـەڵێك وەرگێـڕی کارامـەو لێهـاتوو دەرکـەوتن، لـە دیارترینیان (عبدالله بن المقفع)، ئەم کەسایەتییە وەرگێڕێکی شـارەزا بـووە لـە زمـانی فارسیدا (پەهلەوی)، لەم زمانەوە ژمارەیـەکی یـەکجار زۆر کتێبـی وەرگێڕاوەتـە سـەر زمانی عەرەبی، لەوانـەش کتێبـی (کلیلـة و دمنـة)، هـەروەها لـە بـواری شارسـتانیەتی یۆنانییدا بە تایبەتی فەلسەفە، کـە شـارەزاییەکی بەرچـاوی هـەبووە و لـەم بوارەشـدا کۆمەڵە وەرگێڕانێکی هەبووە کە هەرسێ کتێبی (ئەرسـتۆتاڵیس)ی لـە بـواری لۆژیکـدا وەرگێڕاوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبی، کتێبـەکانیش (قاطاغوریـاس و بـاری أرمینـاس و أنالوطیقا) بوون، کە پێدەچێت ئەم کتێبانەی لە فارسییەوە وەرگێڕابێت[2].

هـەروەها هەرلـەم سـەردەمەدا چـەندین وەرگێـڕی دیکـەیش هـەبوون، لەوانـەش (جورجیس بن جبرائیل)ی پزیشك، ئەم کەسایەتییە سەرباری ئەوەی کتێبـی پزیـشکی بۆ خۆی، کتێبی فەلسەفییشی وەرگێڕاوە، هەروەها (یوحنا بـن ماسـویە) کـە ئـەم دوو کەسـایەتییە سـەرباری وەرگێـڕان، پـشتگیریی وەرگێڕانیـشیان کـردووە، هـەروەك لـە باسـی هۆکارەکـانی وەرگێـڕان بـە وردتـر لێـی دەدوێـین، هـەروەها یـەکێکی دیکـە لـە وەرگێـڕە دیارەکـانی لـەم سـەردەمەدا (یوحنـا بـن البطریـق) بـووە، ئـەم وەرگێـڕە بەرهەمـەکانی (ئەرسـتۆتاڵیس) و هـەروەها چـەند کتێبێکـی (أبقـراط)ی لـە بـواری پزیشکییدا وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی، سـەرباری ئەمانـەش، لـەم سـەردەمەدا چەند وەرگێڕێکی دیکەی وەك (سلام الأبرش و باسیل مطران) هەبوون، کە کەم تا زۆر، ڕۆڵیان لە وەرگێڕاندا هەبووە [3].

---

(١) المقدمة، ج١، ص٤٨٠ " هەروەها بڕوانە: حاجی خلیفة، کشف الظنون، ج١، ص٦٧١.

(٢) إبن النـديم: م.س، ص١٧٢ " القفطـي: م.س، ص٢٢٠ " Debor: The History of Philosophy in Islam, p.17..

(٣) الأندلـسي: م.س، ص١٧٥ " القفطـي، م.س، ص٢٤٩ " إبـن العـبري: مختـصر تـاريخ الـدول، ص٣٢٩ " أوليري: مسالك الثقافة الإغريقية الى العرب، ص٤٧.

شـايەنی بـاس خەلیفـە (أبـوجعفر المنـصور) سـەرباری وەرگێـڕان، بـۆ خۆیـشی گرنگیی زۆری بەو بابەتە وەرگێڕاوانـە دەدا، هـەروەها هـەوڵی کۆکردنـەوەی زانایـان و فەیلەسـوفانی دەدا لــە بوارەکـانی گەردووونناســی و ئەنــدازیاریی، بەتایبــەتی لــە وڵاتەکەیدا، ئەمە سەرباری ئەوەی کە پشتگیریی تەواوی لایەنی ماددیی ئەو بوارانەشی دەکرد[1].

بە هەرحاڵ، ئەوەی جێگای ئاماژە بۆ کردنە، سەرباری ئەو پێشکەوتنە زانستییە گەورەیە و ئەو جموجۆڵە زۆرەی بواری وەرگێڕان کە لە سـەردەمی خەلیفـە (أبـوجعفر المنصور)دا هەبوو، بە هاتنی هەردوو خەلیفە (المهدي ١٥٨ – ١٦٩ك / ٧٧٤ – ٧٨٥ز) و خەلیفـە (الهـادي ١٦٩ – ١٧٠ك / ٧٨٥ – ٧٨٦ز)، تـا ڕاددەیـەك زۆر ئـەم چالاکییە گەورەیە بەرەو لاواز و کزبوون چـوو، ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی ئـەم خەلیفانـە سـەرباری ئەوەی کە هیچ مەیلێکیان بەلای زانست و وەرگێڕاندا نەبووە، هـیچ هاندانێکیـشیان بـۆ ئەو بابەتە نەبووە و زیاتر بە کاروباری وڵاتەوە خەریك بوون[2].

**٢- سەردەمی خەلیفە هارون ئەلڕەشید ١٧٩ – ١٩٣ك / ٧٨٦ – ٨٠٨ز:**

سەردەمی خەلیفە هارون ئەلڕەشید یەکێکە لە سەردەمە گەشەکانی بوژاندنەوە و پەرەسەندنی شارستانیەتی ئیسلامیی، بـە جۆرێك ئـەم شارسـتانیەتە پێـشکەوت کـە گەیـشتە ترۆپـك، وەرگێـڕانیش شانبەشـانی ئـەو لایەنانـەی دیکـە لـەم سـەردەمەدا سەرلەنوێ پێشکەوتنی بەرچاوی لـە ڕووی جـۆریی و ڕێژەییـەوە بەخۆیـەوە بینـی کـە هەرگیز لە سەردەمەکانی پێش ئەمدا بەو جۆرە نەبووە، چاودێرییکردنی ڕاسـتەوخۆی خەلیفە (هارون الرشید) بۆ خۆی و پشتگیریی و هاندانی لایەنی مەعنەویی و ماددیی لـە

(١) الجميلي: م.س،ص٨٥ – ٨٦ " مريم سلامة – كار: الترجمة في العصر العباسي، مدرسة حنين بن إسحق و أهميتها في الترجمة، تر.د.نجيب الغزاوي، وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٨م، ص١١٢ – ١١٣.

(٢) جلال مظهر: الحضارة الاسلامية أساس التقدم العلمي الحديث، مركز كتب الشرق الأوسط، (د.ت)، ص٦٨ " د.محمد عبدالمنعم الخفاجي: م.س، ص٥٥.

هەرە هۆکارە گرنگەکانی ئەو پێشکەوتنەی ئەم سەردەمەدا بوون لە بزووتنەوەی وەرگێڕاندا [1].

خەلیفە (هارون الرشید) نوێنەری خۆی دەنارد بۆ ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی تا هەرچیان لە کتێب و دەستنووسی گرنگی یۆنانیی دەست دەکەوێت بیکڕن و پەیدای بکەن و لەگەڵ خۆیاندا بیهێننەوە، بەتایبەتییش ئەوانەی کەپەیوەندییان بە بواری پزیشکییەوە هەبووە، لەم بوارەشدا چەندین پارەی زۆری خەرج کردووە [2]، دیارە ئەمە سەرباری ئەوەی کاتێك کە هەردوو شاری (أنقرة و عمورية) فەتح دەکات، فەرمان دەکات بەوەی کە دەست لە کتێبخانەکانیان نەدرێت، پاشان ژمارەیەك لە زانایان و وەرگێڕکارانی لە بەغداوە بۆ دەنێرێت بۆ ئەوەی کە کتێبە گرنگە ناوازەکانیان کە دەست ناکەوێت، دەربهێنن، بە تایبەتیی لە بوارەکانی پزیشکیی و فەلسەفیی و گەردووناسییدا، ئەوانیش ژمارەیەکی زۆر کتێبی ناوازە و گرنگ دەردێنن و لەگەڵ خۆیاندا بۆ بەغدادی دەگوێزنەوە و لەوێدا خەلیفە (هارون الرشید) بڕیار دەدات کە وەرگێڕی کارامەی بخرێتە سەر و وەربگێڕدرێنە سەر زمانی عەرەبیی [3].

ئەمە جگە ئەوەی کە لە سەردەمیدا چەندین کاری گرنگ کراوە لە بواری وەرگێڕاندا، بۆ نموونە کتێبی (الأصول)ی (أقليدس) لە سەردەمی ئەمدا بۆ یەکەمجار لەلایەن (حجاج بن مطر)ەوە وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبیی، لێرەوە ئەم وەرگێڕانە

---

(١) ابن دحية: النبراس في تاريخ خلفاء بني العباس، بغداد، ١٩٤٦م، ص٣٦ " السامرائي: م.س، ص٨٧ " عمر فروخ: تاريخ العلوم عند العرب، ص١٢١ " السيد أمير علي: مختصر تاريخ العرب و التمدن الاسلامي، ت ر. رياض رأفت، مطبعة لجنة التأليف والترجمة و النشر، القاهرة، ١٩٣٨م، ص٢١٦ – ٢١٧.

(٢) السامرائي: م.س، ص٨٧ " السيد أمير علي: م.س، ص٢١٦ – ٢١٧.

(٣) القفطي: م.س، ص٢٤٩ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص١٧٥ " حاجي خليفة: م.س، ج٢/ ص٦٨١" د. أحمد شلبي: موسوعة الحضارة الاسلامية، ج٣ / ص٢٣٠ " د.حسن إبراهيم حسن: تاريخ الاسلام، ج٣/ص٣٤٦ " مريم سلامة – كار: م.س، ص١٣.

بە (الهاروني) ناسرا، واتە لە سەردەمی خەلیفە (هارون الرشید) وەرگێڕدراوە[1]، هەروەها لەم سەردەمەدا بە فەرمانی (یحیی بن خالد بن برمك) كتێبی (المجسطي) وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبیی كە یەكێكە لە كتێبە بەناوبانگەكانی بواری گەردووناسیی[2]، هەروەها لە كۆتایی سەردەمی خەلیفە (هارون الرشید)دا پاش ئەوەی كە بینی ژمارەی وەرگێڕكاران ڕوو لە زیادیی دەكەن، بڕیاری دا لە ناوەندێكدا كۆیان بكاتەوە و ناوی دەزگاكەشی نا (بیت الحكمة)، ئەم دەزگایە توانی كە پاڵێكی زۆر گەورە بنێت بە بزووتنەوەی وەرگێڕانەوە، چ لە سەردەمی (هارون الرشید)دا بێت، یان لە سەردەمانی دواتردا، چونكە لە ناو (بیت الحكمة)دا تەنها كاریان هەر وەرگێڕان نەبووە، بەڵكو زۆرێكی لە زانستخوازان و مامۆستایانی پلەبەرزی تیادا كۆبووبوویەوە كە هەموو بەردەوام فێر دەبوون، ئەمە سەرباری ئەوەی كە چەندین كتێبی بە نرخی تیادا كۆبووبوویەوە كە بەردەوام لە ناوچەكانی (ئاسیای بچووك و قسطنطینیە و میسر و شام)ەوە كتێبی بۆ دەهات و هەروەها وەردەگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبیی[3]، بەم جۆرەش ئەم ناوەندە شێوەیەك بوو لە ئەكادیمیایەكی پێشكەوتووی سەردەمی خۆی، لەم بارەیەوە (أستانوودكب) كە ڕۆژهەڵاتناسێكی ئەمریكیە دەڵێت: ((بیت الحكمة یەكەم زانكۆ بووە كە لە جیهاندا دامەزرابێت بە مانا نوێیەكەی[4])).

---

(١) الديوه جي: م.س، ص١٣ " الخفاجي: م.س،ص٥٥" د.محمد الصادق عفيفي: م.س، ص٣٧ – ٣٨.

(٢) القفطي: م.س، ص٦٩.

(٣) د.سعيد عبدالفتاح عاشور و آخرون: دراسات في تاريخ الحضارة الاسلامية العربية، الكويت، دار السلاسل، ١٤٠٦هـ – ١٩٨٤م، ط٢، ص٨٩ " كوركيس عواد: خزائن الكتب القديمة في العراق القديم منذ أقدم العصور حتى سنة ١٠٠٠ للهجرة، دار الرائد العربي، بيروت، ١٩٨٦م، ط٢، ص١٠٥ – ١٠٦.

(٤) المسلمون في تاريخ الحضارة، تر.محمد فتحي عثمان، ١٩٧٢م، ص٤٢، ٤٣.

بەم جۆرەش دەبینین هەروەك باسمان کرد، بزووتنەوەی وەرگێڕان لە سەردەمی خەلیفە (هارون الرشید)دا بنەماکانی خۆی دارشت و گەیشتە ترۆپك، پاشان وەك بنەمایەکی پتەویش بۆ سەردەمەکانی دیکەی پاش خۆی سوودی لێوەرگیرا.

لەپاش خەلیفە (هارون الرشید)، خەلیفە (الأمین ١٩٣ – ١٩٨ك /٨٠٨ – ٨١٣ز) شوێنی گرتەوە، بەڵام ئەم خەلیفەیە سەرباری ئەوەی کە بزووتنەوە وەرگێڕان لە سەردەمیدا بەردەوام بوو، بەڵام بۆ خۆی هیچ ئارەزوویەکی بە لای زانست و وەرگێڕاندا نەبووە، هیچ هاندان و داهێنانێکی گەورە لەسەردەمیدا بەرچاو ناکەوێت، ئەمەش زیاتر بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانەش لاوازیی خەلیفە (الأمین) بۆ خۆی و هەروەها خەریکبوونی بە دەسەڵاتەوە و بەردەوامیی ململانێ ناوخۆییەکانی وڵاتەکەی لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم بارە بوون لە سەردەمیدا [1].

**٣- سەردەمی خەلیفە مەئمون ١٩٨ – ٢١٨ك / ٨١٨ – ٨٣٣ز:**

سەردەمی خەلیفە (مأمون) یەکێکی دیکە لە ڕازاوەترین سەردەمەکانی ڕابوونی شارستانیەتی ئیسلامیی بە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی لە ڕێگای بزووتنەوەی وەرگێڕانەوە، چونکە خەلیفە (المأمون) بۆ خۆی سەرباری ئەوەی کە خەلیفە بوو، کەسایەتییەکی شارەزا و زانایەکی گەورە بوو لە بوارەکانی زانستدا، هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن، ئەگەر (المأمون) خەلیفە نەبوایە ئەوا یەکێك دەبوو لە زانا گەورەکانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، بەجۆرێك کە بە (حکیم بني عباس) ناسراوە، ئەم خەلیفەیە بە جیاواز لە خلیفەکانی دیکەی پێش خۆی لە نێوەندێکی زانستیانەدا گەشەی کردبوو[2]، هەر ئەمەش بوو بووە مایەی ئەوەی کە ڕێبازی (المعتزلة) هەڵبژێرێ لە پێڕەوکردنی بیروباوەڕەکانیدا، چونکە ئەم ڕێبازە پشتی بە عەقڵ دەبەست لە هەڵسەنگاندنی بابەتەکاندا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەلیفە (المأمون) پشت بە پێگە سیاسییەکەی ببەستێت بۆ پشتگیریی چالاکییە

---

(١) محمد شاكر: م.س، مج٥/ج١/ص١٦٥ – ١٨١ " الدوري، م.س، ص١٤١-١٥٦.

(٢) الدينوري: الأخبار الطوال، ص٣٦٦ " كوركيس عواد: م.س، ص١٠٦" الخفاجي: م.س، ص٥٦.

شارستانییەتەکانی سەردەمی، لێرەشەوە فەرمانی کرد بەوەی هەرچی کتێبێکیان لە بارەی فەلسەفە و لۆژیکەوە بەردەست دەکەوێت، وەریبگێڕنە سەر زمانی عەرەبیی، ئەمەش لە پێناوی پشتگیرییکردنی ڕێبازی (المعتزلة)دا بوو[1]، دیارە هەوڵەکانی خەلیفە (المأمون) بە تەنها هەر بە وەرگێڕانی کتێبی فەلسەفییەوە نەوەستا، بەڵکو سەرجەم بابەتە زانستییەکانی گرتبوویەوە[2]، لەم بارەیەوە (إبن خلکان) دەڵێت: ((مأمون ئارەزووی لە وەرگێڕانی کتێب بۆ عەرەبی چاککردن و دەرهێنانیان دەکرد[3]))، هەروەها پارەیەکی یەکجار زۆری لەو پێناوەدا خەرج کرد، لەم بوارەشدا بە کەسایەتییەکی دەستکراوە بۆ وەرگێڕکاران ناسرابوو، بە جۆرێك کە بە ئەندازەی کتێبە وەرگێڕدراوەکە زێڕی دەدایە کەسی وەرگێڕ، بۆ نموونە بە هێندەی وەرگێڕانەکانی (حنين بن اسحق) کە وەرگێڕێکی کارامەی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان بوو، زێڕی پێدا[4].

سەرباری ئەمانە، خەلیفە (المأمون) بە هەموو توانایەوە هەوڵی ئەوەی دەدا، کە دەستنووس و کتێبی بە بایەخ لە شارستانیەتی یۆنانیی لە وڵاتی ڕۆمانەوە بەدەست بخات، بۆیە دەبینین چەندین جار لەگەڵ پادشای ڕۆمەکان و خاوەنی (صاحب قبرص)، ئەگەر پەیوەندیی ببەستایە یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی ناردنی کتێب و دەستنووسی یۆنانی بوو بۆی لە سەرجەم بوارەکاندا بەگشتیی و کتێبی (الحكمة) بەتایبەتیی، ئەمە جگە لەوەی کە چەندین جار نوێنەری ناردووە بۆ وڵاتی ڕۆمانی بۆ

---

(١) د.محمد الصادق عفيفي: م.س، ص٣٨ " د.يوسف الزيدان: حركة الترجمة والنقل، درس تاريخي، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی www.ziedan.com.

(٢) د.محمد أبو ريان: تاريخ الفكر الفلسفيى في الاسلام، ج١/ص٨٧، ٨٨، ٩٢.

(٣) وفيات الأعيان، ج١ / ص٢٠٩.

(٤) إبن قتيبة الدينوري: فضل العرب و التنبيه على علومها، تح. د.وليد محمود خالص، أبوظبيي، ١٩٩٨م، ص١٤٩ "إبن أبي أصيبعة: م.س، ج٢/ص١٤٣" د.أحمد فريد رفاعي: عصر المأمون، ص٣٧٧ " أنور الرفاعي: الاسلام في حضارته و نظمه، دار الفكر، دمشق، ١٩٨٦م، ط٣، ص٣٢ " زهير حميدان، م.س، ص٤٠٦.

ئەوەی کە دەستنووسی گرنگ و ناوازەی بۆ بکڕن لە سەرجەم بوارەکاندا و لەگەڵ خۆیاندا بیهێننەوە. بۆنموونە کاتێك کە بەسەر ڕۆمانەکاندا سەردەکەوێت لە ساڵی (٢١٥ك / ٨٣٠ن)، داوا لە ئیمپڕاتۆر (ثیوفیل) دەکات لەبری ئەو (باجە)ی کە دەکەوێتە سەریان، ئەو کتێب و دەستنووسانەی بۆ بنێرێ کە لە خەزێنەی کەنیسەکان و لە ژێر زەمینەکاندا شاردوویانەتەوە، پاش ئەوەی کە ئیمپڕاتۆری ڕۆم ڕازی دەبێت، خەلیفە (المأمون) گەورە وەرگێڕانی بەردەستی خۆی بۆ دەنێرێت و تیایدا داوایان لێدەکات کە هەرچی کتێبیان لە بوارەکانی ئەندازیاریی و فەلسەفەدا بەردەست دەکەوێت لەگەڵ خۆیاندا بیگوێزنەوە بۆ لای ئەو، هەروەها پاش گەڕاندنەوەی ئەو کتێبانەش فەرمان دەدات بە وەرگێڕانیان و هەروەها بڵاوکردنەوەیان لەناوخەڵکیدا بۆ ئەوەی کە سوودی لێ وەربگرن[1].

هەروەها کاتێك کە پەیوەندیی دەبەستێت لەگەڵ ئیمپڕاتۆری بێزەنتی (میخائیلی سێیەم)، مەرجی ئەوەی لەسەر دادەنێت کە یەکێك لە کتێبخانە بەناوبانگەکانی (قسطنطينية)ی پێبدات و لە ئەنجامدا پاش ئەوەی ڕێکدەکەون، ژمارەیەکی زۆری لە وەرگێڕکارانی بۆ دەنێرێت و لە گرنگترین ئەو کتێبانەش کە لەم گەنجینەیەوە بە دەستی دەکەوێت، کتێبی (المجسطي)ی (بطليموس) بوو، دووبارە لەم سەردەمەدا وەردەگێڕدرێتەوە کە بە (المأموني) ناسراوە[2].

سەرباری ئەمانەش نوێنەری تایبەتی دەنێرێ بۆ لای (صاحب قبرص) و داوای کتێبی لێدەکات لە بارەی کتێبی فەلسەفی بە تایبەتی بابەتەکانی (ئەرستۆتاڵیس)ی بۆ بنێرێ، پاش گەڕانێکی زۆر ئەم پادشایە بابەتەکانی لە گەنجینەی کەنیسەیەکدا بۆ دەدۆزێتەوە و پاش پرسیار کردن لەبارەیانەوە بە پێنج بار دەینێرێت بۆ خەلیفە،

---

(١) إبن النديم: م.س، ص٣٣٩ " توفيق الطويل: العرب و العلم في عصر الاسلام الذهبي، دار و مطابع الشعب، القاهرة، ١٩٨٦م، ص٧٥ " السامرائي: م.س، ص٨٣ " عمر فروخ: م.س، ص١١٤.

(٢) ابن النديم: م.س، ص٢٤٣ " اليوزبكي: التعريب في العصرين الأموي و العباسي، ص٥٧.

ئـەویش وەرگێڕکـارانی دەخاتەسـەر و فـەرمانیان پێـدەکات کـە هەرچـی دەتـوانن وەریبگێڕنە سەر زمانی عەرەبی[1].

خەلیفە (مأمون) هەر بەمـەوە ناوەسـتێت، بـەڵکو جـارێکی دیکـەیش پەیوەنـدیی دەکاتــەوە بــە پادشــای ڕۆمانەکانــەوە و داوایــان لێـدەکات کـە ڕێگـا بـە زانایـان و وەرگێڕکاران بدات کە سەردانی وڵاتەکەی بکەن بۆ ئەوەی کە کتێـب و دەسـتنووس لـە بارەی (الحكمة)ەوە بە سەرجەم بوارەکانیەوە بکـرن، پـاش ڕازیبـوونی پادشـای ڕۆم، خەلیفە وەفدێك دەنێرێت کە پێکهاتبوو لە (حجاج بن مطـر و إبـن البطريـق)، هـەروەها سەرچـاوەکان ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن کـە سـەرۆکی (بيـت الحكمـة) (يوحنـا بـن ماسويه)شی تیـادا بـووە، لـە ئـەنجامی ئەمەشـەوە دەتـوانن ژمارەیـەکی زۆری کتێـب بەدەست بخەن و دەیگوێزنەوە بۆ بەغداد [2].

لەپاش ئەمانەوە و لە ئەنجامی چەند هەوڵێکی دیکەی خەلیفـە (المـأمون)، تـوانرا ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبی شارستانیەتی یۆنانیی کۆبکرێتەوە، خەلیفـە تـەنها هـەر بەوەوە نەدەوەستا کە وەریانبگێڕێتە سەر زمـانی عـەرەبی، بـەڵکو بـۆ هـەر کتێبێکـی وەرگێڕدراو نیشانەیەکی دادەنا و خەڵکی هاندەدا بۆ ئەوەی کە بیانخوێننـەوە و فێـری زانستەکانیان ببن، ئەمە سەرباری ئەوەی کە لە سەردەمیدا بـەردەوام کـۆڕ و سـیمینار (مناظرات) دەبەسـترا بـە ئامـادە بـوونی خـۆی و هـەروەها سەرکەوتووانیـشی خـەڵات دەکـرد، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە دەرگـای خەلافەتەکـەی کردبوویـەوە بـۆ زانایـان و فەیلەسوفان و بە هـەموو شـێوەیەك لـەخۆی نزیـك دەکردنـەوە، ئەمانـەش پاڵنـەرێکی دیکەی گەورەی ئەو ڕابوونە زانستیە گەورەیەی سەردەمی خەلیفە (المـأمون) بـوو بـە کاریگەری شارستانیەتی یۆنانیی [3].

---

(١) القفطي: م.س، ص١٨.

(٢) ابن النديم: م.س، ص٣٣٩ " الأندلسي: م.س، ص٧٥" الـديوه جـي: م.س، ص١٨ " ي. هـل: الحضارة العربية، تر.د.إبراهيم أحمد العدوي، ص١٠٧.

(٣) الرفاعي: م.س، ص٥٣٢ ٨٩ " خودابخش: الحضارة الاسلامية، تر. د. علي حسني الخربوطلي، ص١٦٣،١٦٢ " د.سعيد عبدالفتاح آشور وآخرون: م.س، ص٨٨.

لێرەدا وای بە باش دەزانین کە ئاماژە بە گێڕانەوەیەك بدەین، کە هەندێك سەرچاوە بە هۆکاری سەرەکیی دادەنێن لەوەی کە خەلیفە (المأمون) ڕوویکردۆتە بواری وەرگێڕانی کتێبی فەلسەفیی و لۆژیکی بەتایبەتی، ئەویش ئەوەیە گوایە خەلیفە (مأمون) خەوی بینیوە بە (ئەرستۆتالیس)ەوە[1]، لەم بارەیەوە (إبن النديم) دەڵێت: ((مأمون لە خەویدا پیاوێکی سوور و سپی برۆ پان و ناوچەوان ئەستووری سەر و قژ کۆکراوەی بینی کە سیما ڕێك و پێك و هەڵسوکەوت جوان بوو، لەسەر جێگایەك دانیشتبوو، مأمون دەڵێت لەبەردەمیدا خۆم بە خاوەن پلە و پایە دەزانی و لێم پرسی تۆ کێیت؟ وتی: من (ئەرستۆتالیس)م، زۆر دڵخۆش بووم و پێم گوت، ئەی حەکیم پرسیارت لێبکەم؟ وتی: بپرسە، وتم: چاکە چییە؟ وتی: چاکە لە عەقڵدایە، وتم: پاشان، وتی: چاکە لە ئاییندایە، وتم: پاشان، وتی: چاکە لەلای جمهورە، وتم: پاشان، وتی: نا.. نا، وتم: زیاتر ئامۆژگارییم بکە؟ وتی: هەرکەسێك ئامۆژگاری کردی ئەوە لەلات وەك زێڕ وابێت، دەستیش بگرە بە یەکێتی و یەکڕیزییەوە.....[2]))، کاتێك کە خەبەری دەبێتەوە پرسیار دەکات لە بارەی (ئەرستۆتالیس)، پێی دەڵێن کە ئەوە کەسێکی دانای یۆنانییەکانە، ئەویش (حنين بن إسحق) بانگ دەکات بەوپێیەی باشترین وەرگێڕ بووە لە سەردەمی خۆیدا و فەرمانی پێدەکات کە کتێبی لەو بوارەدا بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبیی[3].

ئێمە پێمانوایە کە ئەم بابەتە خورافەیە و زیاتر لە چیرۆکەوە نزیکە، چونکە هەروەك باسمان کرد کە هۆکاری سەرەکیی چوونی خەلیفە (مأمون) بەلای فەلسەفە و بواری لۆژیك دا بیروباوەڕی تایبەت بە خۆی بوو کە هەڵگری بیری (معتزله) بوو، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەیشەوە خەلیفە بۆخۆی مەیل و ئارەزووی بە لای بواری شارستانیەتی یۆنانییدا هەبووە، هەروەها بزووتنەوەی وەرگێڕان و دروستکردنی (بيت

(١) بۆ نموونە: بڕوانە: جوستاف.أ.ظون جرونيباوم: حضارة الاسلام، تر.عبدالعزيز توفيق جاويد، ص٧٧ " د.محمد حسن عبدالعزيز: م.س، ص٩١.

(٢)الفهرست، ص٣٣٩.

(٣) إبن النديم: م.ن، ص٣٣٩ " زهير حميدان: م.س، ص٤٠٦.

الحكمة) له پێش ئـەمیش هـەر هـەبووە، بـە تایبـەتیی لـە سـەردەمی خەلیفـە (هـارون الرشید)دا[(١)].

پـاش خەلیفـە (المـأمون)، خەلیفـە (المعتـصم ٢١٨ – ٢٢٧ك / ٨٣٣ – ٨٤١ز)ی بـرای شـوێنی دەگرێتـەوە، ئـەم خەلیفەیـە بـە پێـچەوانەی خەلیفـەی پـێش خـۆی، کەسایەتییەك دەبێت کە کەمتر بە لای زانست و زانیارییـدا دەچێت و بایـەخ بـە بـواری وەرگێڕان نادات، بە جۆرێك کە هەندێك سەرچاوە بە نەخوێنـدەوار نـاوی دەبـەن، ئـەم خەلیفەیە زیاتر کەسایەتییەکی سەربازیی بووە و لـەو بـوارەدا بـەهێز بـووە، لەوانـەش توانیبووی چەند سەرکەوتنێك بەسەر ڕۆمە بێزەنتیەکاندا بەدەست بێنێـت و هـەروەها توانی کە بزاڤی (بابەکی خوڕڕەمی*) له ناوبەرێت، شایەنی باسە ئـەم خەلیفەیـەش بـە کاریگەریی (مأمون)ی برای سەر بە ڕێبـازی (المعتزلـة) بـووە، بـەڵام وەك بیروبـاوەڕ و پێڕەوکردن هیچی له بارەی ئـەم ڕێبـازەوە نـەدەزانی، هـەروەها هـیچ پێـشکەوتنێکی گەورە له بواری وەرگێڕاندا لەسەردەمیدا بەرچاو ناکەوێت[(٢)].

## ٤– سەردەمی خەلیفە (الواثق بالله) ٢٢٧ – ٢٣٢ك / ٨٤١ – ٨٤٦ز:

بە گرتنە دەستی خەلافەت لەلایەن خەلیفە (الواثق بالله) لـە سـاڵی (٢٢٧ك)، وەك دوا خەلیفەی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، سـەرلەنوێ بزووتنـەوەی وەرگێڕانـی شارستانیەتی یۆنانی بوژاندنەوەی بەخۆیەوە بینی و لەم سەردەمەدا ئەم بزووتنەوەیە

---

(١) بـۆ زیـاتر شـارەزابوون لـەم بارەیـەوە بڕوانـە: أحمـد أمـین: ضـحی الاسـلام، ج١، ص٢٦٨ " د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص١٨٢،١٨١.

* گەورەترین بزاڤی ئایینی سیاسیی بـووە لـە سـەردەمی خەلافـەتی یەکـەمی عەبباسـییەکان لـە ناوچەی ئازەربایجانی ئێرانی ئـەمڕۆ کـە نزیکـەی (٢١) سـاڵی خایانـدووە (٢٠١ – ٢٢٣ك)، ئـەم جوڵانەوەیە بەوە ناسراوە کە زۆر فراوان و ڕێکخراو بووە و لە سەردەمی خەلافەتی (المعتـصم بـالله) دا کۆتایی پێهات. بۆ زیاتر شارەزایی لەم بابەتە بڕوانە: الدوري: م.س، ص١٧٩ – ١٨٦.

(٢) القلقشندي: مآثر الانافة في معالم الخلافة، تح. عبدالستار أحمد فراج، مطبعة حكومة الكويت، الكويـت، ١٩٨٥م، ط٢، ج١/ص٢١٨-٢١٩ " محمـد خـضري بيـك: محاضـرات في تـاريخ الأمـم الاسلامية، الدولة العباسية، بيروت، ١٩٧٠م، ج١/ص٢١٦.

به جۆرێك پێشكەوت كە سەربارى بووژاندنەوەى كارەكانى پێشوو، پاڵێكى گەورەشى بە بزووتنەوەى وەرگێڕانەوە نا كە پاش خۆيشى هەر بەردەوام بوو، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو كە ئەم خەليفەيە بۆخۆى يەكێك بووە لە زاناو شارەزايانى سەردەمى خۆى لە بوارەكانى زانستدا و مەيلێكى گەورەى بەلاى وەرگێڕاندا هەبووە[1]، لەم بارەيەوە (إبن العمراني) دەڵێت: ((واثق شاعير و ئەديبێكى بەخشندە و پارێزەرى شيعرى عەرەبيى بووە،..... بە (مأمون الصغير) ناسراوە، (مأمون) لە مەجليسدا دايدەنيشاند لە كاتێكدا كە باوكى بە پێوە دەبوو، (مأمون) خۆى پەروەردەى كردووە، هەروەها هەر خۆيشى فێرى ئەدەب و نووسينى كردووە و قورئانى پێخوێندووە، بۆيە تەواوى هەڵسوكەوت و بارودۆخى هاوشێوەى (مأمون) بووە[2])).

هەروەها (إبن طبا طبا) دەڵێت: ((الواثق باشترين خەليفەكانيان بووە، كەسايەتييەكى خاوەن پلە و پايە و عەقڵ بووە، زمان پاراو و شاعير بووە، هاوشێوەى مأمون بووە لە جووڵە و وەستاندا[3])).

لەم دەقانەى سەرەوە دەگەينە ئەوەى كە پێگەياندنى (الواثق) لەلايەن خەليفە (مأمون)ەوە يەكێك بووە لە هەرە هۆكارە بەهێز و سەرەكييەكانى ئارەزووبوونى خەليفە (الواثق) كە بەلاى زانست و زانياريدا بڕوات و لەسەر هەمان شێوەى خەليفە (المأمون) خەلافەت ڕێكبخاتەوە، لە سەردەميدا گرنگييەكى زۆر درا بە وەرگێڕانى زانستەكانى شارستانيەتى يۆنانى و لەم بوارەشدا چەندين كتێب وەرگێڕدرايە سەر زمانى عەرەبيى، هەروەها (بيت الحكمة)ش زيندوو كرايەوە پاش ئەوەى بۆ ماوەيەك لاواز بوو بوو، پەيوەنديى شارستانى لە نێوان دەوڵەتى عەبباسى و ئيمپڕاتۆرييەتى ڕۆمانى دا زۆر بەهێز بوو بوو[4].

---

(١) د.فتحي عثمان: الحدود الاسلامية البيزنطية، ج١، ص١٧.

(٢) الأنباء في تاريخ الخلفاء، تح.د.قاسم السامرائي، دار أحياء الكتب العربية، القاهرة، ١٩٧٥م،ص١١.

(٣) الفخري في الآداب السلطانية، ص٢٣٦.

(٤) أبو الفداء: المختصر، ج٢/ص٣٦ " القلقشندي: مآثر الانافة، ج١،ص٢٢٦.

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە سـەردەمی ئـەم خەلیفەیـەدا بایەخدان و گرنگی پێدانێکی زۆر گەورە هەبووە بۆ زانایان و زانیـاریی، بـە جۆرێـك کـە چەندین کۆڕ دەگیرا لە سەردەمی ئەم خەلیفەیەدا و خەلیفە بۆخۆی ئامادە دەبوو، کـە تیایدا ئامادەبووان پرسیاریان لە زانایان دەکرد و ئەوانیش وەڵامیان دەدانەوە[1].

شایەنی باسە کە لەم سەردەمەیـشدا چـەندین وەرگێڕکـاری کارامـە و لێهـاتوو بـە کارەکانی وەرگێڕانەوە خەریك بوون، لەوانە: (یوحنا بن ماسویە) و (حنين بن إسـحاق) و چـەندانی دیکـەیش بـوون، کـە لـە باسـی دووەمـی ئـەم بەشـەماندا لـە خۆیـان و بەرهەمەکانیان دەدوێین[2]، بەهەرحاڵ، سەردەمی ئەم خەلیفەیەش وەك دوا خەلیفەی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکان بـە سـەردەمێکی ڕازاوە و گـرنگ دادەنرێـت لـە بوارەکانی زانـستی وەرگرتنـی شارسـتانیەتی یۆنانییـدا، بـەجۆرێك لـە سـەردەمەکانی دیکەدا کاریگەریی ئەو شارستانییەتە لـە بنیاتنـانی شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا کـە لـە تەواوی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانی گرتەوە، دەرکەوت.

بەڵام دیاردەیەکی ئاوا گەورە کە بزووتنەوەی وەرگێڕانە هـەر لـە خـۆوە نـەبووە، سەرباری مەیل و ئارەزوو و پشتگیریی ئـەو چـەند خەلیفەیـە بـۆ بزووتنەوەکـە، چـەند هۆکارێکی گرنگ هەبوون کە لـە پـشتی ئـەم دیـاردە گەورەیـەوە بـوون و پـەرەیان بـە بابەتەکـە داوە، لـە خـوارەوە هەوڵـدەدەین بـۆ زیـاتر ڕوونکـردەوەی بابەتەکـەمان لـە گرنگترین هۆکارەکانی ئەو دیاردەیە بدوێین:

**١- هۆکاری ئایینی:**

لە هەڵاوێر و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامییدا بابەتێك هەیە کـە نابێـت توێژەری ئەو بوارە فەرامۆشی بکـات، ئـەویش بەشـداریی ئـایینی ئیـسلامە لـەناو ئـەو مێـژووەدا، بێگومـان بابـەتێکی گرنگـی وەك بابـەتی کاریگـەربوون بـە شارسـتانیەتی یۆنانیی و وەرگێڕانی ئەو شارستانییەتە پێویستی بـە پاڵپـشتییکردنێکی بـەهێزی ئـەو ئایینە دەبـوو تـا سـەر بگـرێ و بێتـە دی، بۆیـە ئەگـەر چـاوێك بـە هـەردوو سەرچـاوە

(١) المسعودي: مروج الذهب، ج٤،ص٧٧، ٧٩.

(٢) المسعودي: م.ن، ج٤، ص١٩٠ " القفطي: م.س، ص٢٤٩.

ڕەسەنەکەی ئیسلامدا بگێڕین کە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێت) چەند دەقێك دەدۆزینەوە کە دەبنە پاڵپشتی تەواو بۆ بزووتنەوەی وەرگێڕان و بەدوادا گەڕانی زانست و زانیاریی نوێ و گەلانی دیکە.

لەم بارەیەوە (زیغرید هونکە) دەڵێت: ((موحەممەد وای دەبینی ئەگەر شوێنکەوتووانی قووڵ ببنەوە لە دیراسەکردنی دروستکراوەکاندا و هەروەها لە نهێنیە سەرسوڕهێنەرەکانیان، هۆکارێك دەبێت بۆ زانینی توانای دروستکەر، هەروەها وای دەبینی کە زانیاریی ڕێگای باوەڕ ڕۆشن دەکاتەوە و لێی دووبارەدەکردنەوە کە (داوای زانست بکەن ئەگەر لە چین یش بێ)، بۆیە پێغەمبەر سەرنجی بۆ لای زانستی سەرجەم گەلان ڕادەکێشان، زانستیش خزمەتی ئایین دەکات، زانیارییش لە لایەن خواوەیە و بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە پێویست بوو لەسەریان کە بیگەنێ و دەستی پێبگەیەنن ئەگەر سەرچاوەکەی هەرچیەك بێت، ئەگەر ئەو زانستە لای بێباوەڕێکیش بێت[1])).

بۆ ئەمەش چەند ئایەتێك لە قورئاندا هەیە کە پشتگیریی لەم بابەتە ئەکات، ئەو ئایەتانەش:

((إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ))[2]، یاخود ((يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ))(٣)، ((قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ))[4]، یان ((يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا))[5]، هەروەها ((وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا))[6]، ئەمە سەرباری چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) لەم بوارەدا، هەروەك دەفەرموێت: ((مَن سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ

(١) شمس العرب، ص٣٦٩.

(٢) سورة الفاطر آية (٢٨).

(٣) سورة المجادلة آية (١١).

(٤) سورة الزمر آية (٩).

(٥) سورة البقرة آية (٢٦٩).

(٦) سورة طه آية (١١٤).

عِلْمًا سَهَّلَ الله له طَرِيقًا إلى الْجَنَّة وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ وَإِنَّ طَالِبَ الْعِلْمِ يَسْتَغْفِرُ له من في السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ حتى الْحِيتَانِ في الْمَاءِ وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ على الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ على سَائِرِ الْكَوَاكِبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ إِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لم يُوَرِّثُوا دِينَارًا ولا دِرْهَمًا إنما وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ))[١]، هەروەها ((تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ وَعَلِّمُوهُ الناس))[٢].

لەم دەقانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لایەنی ئایینی لە ئیسلامدا یەکێك بووە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی ڕووکردنە زانست و هەروەها زانینی شارستانییەت و زانستی گەلان، لە ڕێگای وەرگێڕانەوە، ئەمەش بە جیاوازیی لە ئایینی مەسیحیی کە ڕێگایان لەو زانستانە گرت کە لە شارستانیەتی یۆنانییەوە بۆیان مابوویەوە و شاردیانەوە، لەم بارەیەوە (ستانوود کب) دەڵێت: ((مەسیحییەکان ڕووناکیی زانستی یۆنانییان هەنگاو بە هەنگاو شاردەوە، پاش ئەوەی کە جیهانی کۆنی ڕووناك کردبوویەوە، بەم جۆرەش لاهوتی مەسیحی فەلسەفە و زانستی (وثنی) لاداو شوێنیانی گرتەوە هەر لە سەردەمی قوستەنتینەوە[٣]))، هەروەها دەڵێت: ((بەڵام ئیسلام کە هات ڕووی تێکرد و زانستەکانی لە مەسیحییەکانەوە لە باوەش گرت[٤])).

**٢- پشتگیری و هاندانی هەندێك بنەماڵە بۆ بزووتنەوەی وەرگێڕان:**

سەرباری خەلیفەکان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، چەند بنەماڵەیەکی زانستیی بەناوبانگ هەبوون کە پشتگیریی و هانی بزووتنەوەی وەرگێڕانیان دەدا لە شارستانیەتی یۆنانییەوە بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی، لەم بوارەدا چەندین پارەی

---

(١) ابن ماجة: سنن إبن ماجه، تح. محمد فؤاد عبدالباقي، دار الفكر، بيروت، (د.ت)، ج١، ص٨١، فەرموودەی ژمارە (٢٢٣).

(٢) الدارمي: سنن الدارمي، تح. فواز أحمد زمرلي، خالد سبع العلمي، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٠٧هـ، ج١، ص٨٧، فەرموودەی ژمارە (٢٢١).

(٣) المسلمون في تاريخ الحضارة، ص١١٣.

(٤) م.ن، ص١١٩.

زۆریـان خـەرج دەکـرد، هـەروەها نوێنـەریان دەنـارد بـۆ ناوچـەکانی ئیمپڕاتۆرییـەتی ڕۆمانیی بۆ پەیـداکردنی سەرچـاوە و دەستنووسـی پێویـست لـە بوارەکـانی زانـستدا، چەندین وەرگێڕی کارامەش کاری وەرگێڕانی بۆ دەکـردن، کـە بەرهەمـەکان سـەرباری ئەوەی بۆ کاری تایبـەتی خۆیـان سـوودی هـەبوو، خـەڵکانی دیکـەیش بـە گـشتیی لـە دواجاردا سوودیان لێدەبینین و کارەکانیان بە هەنگاوێکی گـرنگ دادەنرێـت لـە بـواری بـەرەو پێـشەوەچوونی ڕەوتـی کاریگـەر بـوون بـە شارسـتانیەتی یۆنـانیی لـە ڕێگـای وەرگێڕانەوە[1].

لە دیارترینی ئەو بنەماڵانەش، بنەماڵەی (بني موسى بن شاكر)ە، کە بریتی بوو لە هەرسێ کوڕەکەی (موسى بن شاكر)، ئەوانیش (أحمد و محمد و حسن) بوون، (موسـى بن شاكر) بۆخۆی یـەکێك بـووە لـە زانـا گـەورەکانی دەربـاری خەلافـەتی (المـأمون) و لێیەوە نزیك بووە[2]، ئەمە سەرباری ئەوەی کـە هەریـەك لـە کوڕەکـانی بـۆ خۆیـان لـە جۆرێك لە زانـستی وەرگـیراو لـە شارسـتانیەی یۆنانییـەوە شـارەزا بـوون، (محمـد بـن موسى بن شاكر) بۆخۆی لە بواری ئەندازیاریی ئەستێرەناسییدا شارەزا بووە، هەروەك شارەزایی تەواوی لە کتێبەکانی (أقليـدس) و (المجـسطي)دا هـەبووە، ئەمـە سـەرباری ئەوەی کە زانستەکەی وەك پیشەیەك وەرگرتـووە و کـاری پێکـردووە، لـەم بوارەشـدا پارەیەکی یەکجار زۆری دەستکەوتووە، بۆ نموونە ساڵانە لە وڵاتـی فـارس و دیمـشق و چەند ناوچەیەکی دیکەوە بڕی دەستکەوتووی بریتی بـووە لـە (٤٠٠) هـەزار دینـار[3]، هەروەها (أحمد بن موسى بن شاكر) شارەزایی تەواوی لە بواری دروسـتکاری (الكحـل)

---

(١) الجميلي: م.س، ص٥٠ – ٥١.

(٢) الأندلسي: م.س، ص٧٣ " القفطي: م.س، ص٣١٥ – ٣١٦ " إبن خلكان: م.س، ج٥/ص١٦١ " زيغريد هونكة: م.س، ص١١٣ " قدري طوقـان: تـراث العـرب العلمـي في الرياضـيات و الفلـك، القاهرة، ١٩٦٣م، ص١٨٧.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء،ج١٢/ ص٣٣٩،٣٣٨ " الصفدي: الوافي بالوفيـات، ج٥/ ص٥٧ " الزركلي: الأعلام، مطبعة كوستاتـسوما، (د.م)، ١٩٥٤م" ج٧/ص١١٦ – ١١٧" الجميلـي: م.س، ص١٦٤.

میكانیك دا هەبووە، ئەمیش بەم كارەی پارەیەكی یەكجار زۆری دەست كەوتووە كە ساڵانە بەدەستهاتووەكانی نزیكەی (٧٠٠) هەزار دینار بووە، هەروەها (حسن بن موسی بن شاكر) لە بواری ئەندازیارییدا شارەزاییەكی زۆری هەبووە، هەرچەندە تەنها شەش وتاری (أقلیدس)ی لەو بوارەدا خوێندبوویەوە، بەڵام بەوە ناسرابوو كە خۆی داهێنانكاریی لە بوارەكەیدا كردووە[1].

لە بارەی ئەم بنەماڵەیەوە، (إبن صاعد الاندلسي) دەڵێت: ((موسی بن شاكر و كوڕەكانی سەرجەمیان لە پێشەنگانی بواری زانستەكانی فەلسەفە و گەردوونناسیی و جووڵەی هەسارەكان بوون و شارەزاییان لە لێكدانەوی هەسارەكاندا هەبووە، چاودێری پێوانەیشیان كردووە، موسی بن شاكر لە ئەستێرەناسانی (المأمون) بووە[2])).

هەروەها (القفطي) دەڵێت: ((موسی بن شاكر و كوڕەكانی لە پێشەنگانی زانستی ئەندازیاریی بوون، هەروەها سەرجەمیان لە بواری بیركاری و لێكدانەوەی گەردوونناسیی و جووڵەی ئەستێرەكاندا پێشەنگ بوون[3])).

جێگای ئاماژە بۆ كردنە كە ئەم بنەماڵەیە ڕۆڵێكی بەرچاویان هەبووە لە پێشخستنی بزووتنەوەی وەرگێڕاندا، بە تایبەتی لە شارستانیەتی یۆنانییەوە، بە جۆرێك كە كۆشكی (بني موسی بن شاكر) ململانێی لەگەڵ (بیت الحكمة)دا دەكرد، هەروەها خەڵكیان دەنارد بۆ ناوچەكانی ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیی بۆ بەدەستخستنی دەستنووس و كتێبی گرنگی یۆنانیی لە بواری زانستەكاندا، بۆ ئەوەی یارمەتییان بدات لە كارەكانیاندا، ئەمە سەرباری ئەوەی كە بۆخۆیشیان چەندین جار بۆ ئەو مەبەستە گەشتیان كردووە، لەم بوارەشدا چەندین پارەی زۆریان خەرج كردووە[4]،

---

(١)ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ص٨٦ " الجميلي: م.س، ص١٦٥.

(٢) طبقات الامم، ص٧٥.

(٣) أخبار العلماء، ص١٣٦.

(٤) إبن خلكان: م.س، ج٥/ص١٦١، ١٦٢ " الصفدي: م.س، ج٥/ص٥٧ " د.حسن إبراهيم حسن: تاريخ الاسلام، ج٣،ص٣٤٧ " جوستاف.أ ظون جرونيباوم: م.س، ٧٧، ٧٨ " زيغريد هونكة: م.س،

هەروەها چەندین وەرگێڕی کارامە کاری وەرگێڕانی بۆ کردوون، لەوانەش (حنين بن إسحق العبادي) بوو کە سەرباری ئەوەی کتێبی بۆ وەردەگێڕان، دەشیاننارد بۆ وڵاتی ڕۆمانی بۆ ئەوەی کتێبیان بۆ بهێنێت، لەم بارەیەوە (إبن النديم) دەڵێت: ((لەوانەی کە کتێبیان دەردەهێنا لە وڵاتی ڕۆمان (بنوشاكر المنجم) بوو، کە حنين بن إسحاق و جگە لە ئەمیشیان دەنارد بۆ وڵاتی ڕۆم، ئەوانیش چەندین کتێبی بە بایەخیان لە بوارەکانی گەردوونناسیی و فەلسەفە و ئەندازیاریی و مۆسیقا و أرثماطيقى و پزیشکیی دەهێنا و ئەوانیش وەریانگێڕانە سەر زمانی عەرەبی... بني منجم مانگانە نزیکەی (٥٠٠) دیناریان دەدایە کۆمەڵێك لە وەرگێڕکاران، وەك: حنين بن إسحاق و حبيش بن الحسن و ثابت بن قرة، جگە لەمانەش بۆ وەرگێڕان و پێویستی[1])).

شایەنی باسە ئەم بنەماڵەیە هەندێك وەرگێڕی لێهاتووی تایبەت بە خۆیان هەبوو کە بە تایبەتی لە کۆشکەکەیاندا کتێبیان بۆ وەردەگێڕان، لە دیارترینی ئەوانەش (ثابت بن قرة الحراني) بوو، ئەم کەسایەتییە بۆ یەکەم جار لەلایەن (محمد بن موسى بن شاكر)ەوە وەك وەرگێڕ ناسێنرا، کاتێك کە لە یەکێك لە گەشتەکانیدا ڕوویکردە ناوچەی جەزیرە و لەوێ لە ناوچەی (حران) چاوی کەوت بەم کەسایەتییە و زیرەکیی و لێهاتوویی بۆ دەرکەوت و داوای لێکرد کە لەگەڵیدا بچێت بۆ بەغداد و لەوێ کاری وەرگێڕانی بۆ بکات، ئەویش ڕازی بوو، ئەم کەسایەتیە لە کۆشکی (بنی موسی الشاكر)دا پاش جێگیربوونی توانی چەندین بەرهەمی گرنگ بۆ ئەم بنەماڵەیە لە بوارەکانی گەردوونناسیی و بیرکاریی و ئەندازیاریی و پزیشکیی لە بەرهەمەکانی (ئەرستۆتالیس و أفلاطون و أقليدس و جالينوس و أبقراط و بطليموس) وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی، ئەمە سەرباری ئەوەی کە بە بابەتە وەرگێڕدراوەکانی (إسحق بن

---

ص٣٧٩ " د.محمد أبو ريان: م.س،ج١/ص٩١، ٩٢" د.يوسف الزيدان: حركة الترجمة والنقل، درس تاريخي، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی www.ziedan.com.

(١) الفهرست، ص٣٣٩.

حنين) و (حنين بن إسحق)دا چووەتەوە کە پێشتر وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبیی[1].

بەم جۆرەش، ئەم بنەماڵەیە توانییان لە بەرەوپێشبردنی بزووتنەوەی وەرگێڕان هاوشانی، خەلیفەکان ڕۆڵێکی گەورە بگێڕن لەو بوارەدا.

**٣- پشتگیریی و هاندانی هەندێك لە وەزیران و کاربەدەستان:**

هەندێك لە وەزیران و کاربەدەستان و پزیشکانی ناو خەلافەت ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە پشتگیریی کردن و هاندانی بزووتنەوەی وەرگێڕان و پێشخستنی، هەروەها بەردەوام هەوڵی پەیداکردنی دەستنووسی یۆنانییان دەدا و ئارەزوویان لە وەرگێڕانی دەکرد بۆ زمانی عەرەبیی و لەم بوارەشدا چەندین پارەیان خەرج کردووە.

لە دیارترینی ئەو کەسایەتیانەش: (یحیی بن خالد البرمکي) وەزیری خەلیفە (هارون الرشید) بووە، ئەم کەسایەتییە ئارەزوویەکی گەورەی هەبووە لە پەیداکردنی کتێب و دەستنووسی یۆنانیی و وەرگێڕانیان بۆ زمانی عەرەبی[2]، شایەنی باسە ئەم کەسایەتییە بۆ بەدەستخستنی دەستنووسی یۆنانیی چەندین هەوڵی تایبەتی داوە، لەوانە: پەیوەندیی کردووە بە قەیسەری ڕۆمانیەوە و چەندین دیاری بە نرخی بۆ ناردووە، دەرەنجام کاتێك کە قەیسەری ڕۆمانی داوای لێدەکات کە لە بری ئەو دیاریانە چی ئەوێت بۆی بکات؟، (یحیی بن خالد البرمکي) دەنووسێت کە ئەو کتێبانەی بۆ بنێرێت کە لە ژێر کەنیسەکانتاندا شاردووتاننەتەوە، ئەویش بڕێکی زۆری لەو کتێبانە بۆ دەنێرێت.

لەم بارەیەوە (السیوطي) دەڵێت: ((فارسەکان کاتێك لە دەوڵەتی عەبباسییەکاندا دەسەڵاتیان گرتە دەست زۆرێکیان لە داهێنان لەناو ئیسلامدا کرد، یەکەم داهێنان کە کردیان دەرهێنانی کتێبی یۆنانیی بوو بۆ خاکی ئیسلام و وەرگێڕانیان بوو بۆ سەر

(١) إبن خلكان: م.س، ج٥/ص١٦١، ١٦٢ " القفطي: م.س، ص٥٢.

(٢) ابن قتيبة الدينوري: عيون الأخبار، ج٢/ص٢٠ " المسعودي: مروج الذهب، ج٢٧٩/٣ " إبن خلكان: م.س، ج٦/ص٢١٩ " حاجي خليفة: م.س، ج٢/٨-١٥.

زمانی عەرەبیی و بڵاوبوونەوەیان بوو لەناو مسوڵمانانداء هۆکاری ئەم دەرهێنانەش لە خاکی ڕۆمانەکانەوە بۆ خاکی ئیسلام، (یحیی بن خالد البرمکي) بوو[1])).

ئەمە سەرباری ئەوەی کە چەندین کتێبی تایبەتی بەناویەوە وەرگێڕدراوە، بە تایبەتی لە بواری گەردووناسییدا کە بنەماڵەی (برمكي)یەکان بەگشتیی بەو بوارەوە پێناسرابوون، لەو کتێبانەش کتێبی (المجسطي) بووە[2].

هەروەها کەسایەتییەکی کاریگەری دیکەی هەر لە چینی وەزیران کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لە بواری بەرەوپێشبردنی بزووتنەوەی وەرگێڕان، (محمد بن عبد الملك الزيات)ە، ئەم کەسایەتییە وەزیری هەرسێ خەلیفە (المعتصم، الواثق و المتوكل) بووە و لە ساڵی (٢٣٣ك / ٨٤٧ز) کۆچی دوایی کردووە، لە بارەی ڕۆڵی لە بەرەوپێشبردنی بزووتنەوەی وەرگێڕاندا، (إبن أبي أصيبعة) دەڵێت: ((پێبەخشینەکانی بۆ وەرگێڕکاران و کۆپیکاران لە مانگێکدا هەزار دینار بووە، بە ناویەوە چەندین کتێب وەرگێڕدراوە[3])).

ڕەنگە گرنگی پێدانەکانی ئەم وەزیرە بۆ بزووتنەوەی وەرگێڕان لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە بۆخۆی کەسایەتییەکی زانا و شارەزا بووە لە سەرجەم زانستەکاندا، بۆیە بەردەوام گرنگیی بەم لایەنە داوە، لەم بارەیەوە (الشابشتي) دەڵێت: ((محمد بن عبدالملك بن زيات، دادەنرێ بە بەناوبانگترین وەزیرانی زانا لە سەردەمی عەبباسییەکاندا[4])).

---

(١) صون المنطق و الكلام عن فن المنطق و الكلام، تح. علي سامي النشار، القاهرة، ١٩٥٥م، ص٦-٩.

(٢) ابن النديم: م.س، ص١٧٧ " ابن طاووس: فرج الهموم في تاريخ علماء النجوم، النجف الاشرف، ١٩٦٧م، ص١٤٨ " الجهشياري: الوزراء والكتاب، ص٢٤٩" إبن طباطبا: م.س،ص٢١٣، ٢١٤ " الشابشتي: الديارات، ص٦٤.

(٣) عيون الأنباء، ج٢،ص١٧٦.

(٤) الديارات، ص٦٣.

سەرباری ئەمانەش، چەندین پزیشك و كەسانی پسپۆڕی بوارە جیاوازەكان هەبوون لە دەرباری خەلافەتدا كە پشتگیریی و هانی بزووتنەوەی وەرگێڕانیان داوە، لەوانەش:

(یوحنا بن ماسویه)، ئەم كەسایەتییە یەكێك بووە لە پزیشكە دیار و تایبەتیەكانی خەلیفەكانی عەبباسییەكان، بەتایبەتی پزیشكی هەرسێ خەلیفە (مـأمون، المعتصم و الواثق) بووە و لە ساڵی ٢٤٣ك /٨٥٧ز كۆچی دوایی كردووە، ئەم كەسایەتییە بە هاوشێوەی پزیشكانی دیكەی دەرباری خەلافەتی عەباسییەكان خاوەنی ڕێز و پلە و پایەی تایبەتی خۆی بووە، ئەمەش یارمەتی دابوو لە پێناو بەدەستهێنانی زانیاریی زیاتر و هانی بزووتنەوەی وەرگێڕان بدات كە كتێبی لە بواری پزیشكییدا بۆ وەربگێڕن، لەوانەش داوای لە (حنين بن إسحق العبادي) كردبوو كە كتێبی بەتایبەتی لە بواری دەرمانسازییدا بۆ وەربگێڕێت لە بەرهەمەكانی (جالینوس)، ئەمە سەرباری ئەوەی كە ئەم كەسایەتییە چەندین جار لە نێوان ئەو نێردە زانستییانەدا بووە كە لەلایەن خەلیفەكان بە تایبەتی (المـأمون) دەنێردران بۆ پەیداكردنی كتێب و دەستنووسی یۆنانیی، ئەمە سەرباری ئەوەی ئەم كەسایەتییە بۆخۆیشی چەندین كتێبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی[1].

هەروەها یەكێكی دیكە لە پزیشكە دیارەكانی كە پشتگیریی بزووتنەوەی وەرگێڕانیان كردووە (جبرائيل بن بختيشوع) بووە، ئەم كەسایەتییە ڕۆڵێكی گرنگی بینیوە لە زیادبوونی كتێبی وەرگێڕدراوی پزیشكیی بۆ زمانی سریانیی و عەرەبیی و بە تایبەتیش بۆ عەرەبی، ئەمەش لە پاش ئەوەی كە داوای لە دیارترین وەرگێڕاكارانی سەردەمی خۆی كردووە بۆ ئەوەی كە كتێبی یۆنانیی بۆ وەربگێڕن، بەتایبەتی كتێبەكانی (جالینوس) لە بواری (تشريح)دا، شایەنی باسە ئەم كەسایەتییە بۆخۆی

(١)ابن النديم: م.س، ص٢٤٣ " ابن جلجل: طبقات الأطباء و الحكماء، تح.فؤاد السيد، القاهرة، ١٩٥٥م، ص٦٦،٦٥ " ابن أبي أصيبعة: م.س، ج٢/ص١٢٣، ١٢٤.

هیچ بەرهەمێکی وەرنەگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی، بەڵکو لە زمانی یۆنانییەوە بۆیان وەرگێڕاوە و ئەویش سوودی لێوەرگرتوون بۆ پیشەکەی خۆی[1].

(بختیشوع بن جبرائیل بن بختیشوع) یەکێکی دیکەیە لەو پزیشکە ناودارانەی کە هانی وەرگێڕانی داوە لە سەردەمیدا، ئەم کەسایەتییە پزیشکی تایبەتی خەلیفەکانی (هارون الرشید، أمین، مأمون، معتصم، الواثق و المتوكل) بووە، ئەم کەسایەتییە لە کۆشکی خەلافەت دا خاوەنی متمانەیەکی گەورە بووە، بۆیە ڕێگایان پێدەدا کە چارەسەری ژنانی کۆشکی خەلافەت بکات، هەروەها لەلایەن خەلیفەکانەوە پارەیەکی یەکجار زۆری بۆ خەرج دەکرا، ئەمەش هانیدابوو کە داوا بکات چەندین کتێبی تایبەتی بۆ وەربگێڕدرێت، لەم بارەیەشەوە چەندین کتێب بەناویەوە لەلایەن (حنین بن إسحق العبادي)ەوە وەرگێڕدرا [2].

هەروەها یەکێکی دیکە لەو کەسانەی کە ڕۆڵی هەبوو لە پەرەپێدان و هاندانی بزووتنەوەی وەرگێڕان (سلمویە بن بنان) بووە، ئەم کەسایەتییە سەرباری ئەوەی کە پزیشکی خەلیفە (المعتصم) بووە، زۆر لێشی نزيك بووە و (کاتب)ی خەلیفەش بووە و ئەو نامانەی کە بۆی دەهات، (سلموية بن بنان) بۆی دەخوێندەوە و وەڵامەکانی بۆ دەنووسییەوە، گرنگیی ئەم کەسایەتییە لەوەدا دەردەکەوێت کە لە سەردەمی (المعتصم) کاتێك بزووتنەوەی وەرگێڕان لاواز دەبێت ئەم هانی (حنين بن إسحاق) دەدات کە چەند کتێبێکی بۆ وەربگێڕێت، لەو سەردەمەشدا ڕۆڵێکی بەرچاوی دەبێت[3].

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بە هاوشانی خەلیفەکان و بنەماڵە ناودارەکانی وەك (موسى بن شاكر)، لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا چەندین کەسایەتی

---

(١) الجهشياري: م.س، ص٢٢٦، ٢٢٧ " القفطي: م.س، ١٣٤،١٤٤ " ابن أبي أصيبعة: م.س، ج٢،ص٤٣ " التنوخي: نشوار المحاضرة و أخبار المذاكرة، بيروت، ١٩٧١م، ج٨،ص١٤٥،١٤٤..

(٢) ابن النديم: م.س، ص٢٩٦ " القفطي: م.ن، ص٧٢ " التنوخي: م.س، ج١٤٥/٨، ١٤٧.

(٣) ابن النديم: م.س، ص١٤٢ " القفطي: م.ن، ص٢٠٧، ٢٠٨ " ابن ابي أصيبعة:م.س، ج٢، ص١٦٣.

پایەدار هەبوون کە هاندەری بزووتنەوەی وەرگێڕدراو بوون و بە پێی خۆیان ئەگەر لە دوو چینەکەی پێش خۆشیان کەمتر بووبێت، بەڵام توانیویانە پشکیان لەو بزووتنەوە گەورەیەدا بەربکەوێت.

٤- پێویستیی لەو سەردەمەدا:

یەکێکی دیکە لە هەرە هۆکارە گرنگەکانی دەرکەوتن و برەوسەندنی بزووتنەوەی وەرگێڕان، بریتییە لەو پێویستییە شارستانی و ڕۆشنبیریی و زانستییەی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان هاتەکایەوە بۆ وەرگێڕانی شارستانیەتی یۆنانیی.

ئەمەش دیارە چەند هۆکارێکی تایبەت بە خۆی هەبووە، لە گرنگترینیان، فراوانبوونی سنووری دەسەڵاتی خەلافەتی ئیسلامیی پاش فراوانبوونی فتوحاتی ئیسلامیی، لە ئەنجامی ئەمەشەوە تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونی گەلانی دیکەی خاوەن شارستانییەت لەگەڵ مسوڵمانان کە سەرجەمیان لەژێر سایەی یەك دەسەڵات کۆدەبوونەوە کە خەلافەتی ئیسلامیی بوو، بۆ ئەوەش لە ڕووی شارستانییەتەوە هاوتا ببنەوە لەگەڵ ئەو گەلانەدا، بزووتنەوەی وەرگێڕان وەك پێویستیەك هاتەکایەوە[1].

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەیشەوە هاتنەکایەی پێویستیە سەردەمەکانی دیکە، بۆ نموونە دەرکەوتنی گروپە فەلسەفیەکانی ناو ئیسلام و هاتنەکایەی پێویستی بە گفتوگۆ و پەیڤین کردن، لە دیارترین ئەو گروپانەش گروپی (المعتزلة) بوو، کە پشتیان بە عەقڵ دەبەست لە لێکدانەوەکانیاندا بۆ بابەتەکان، بووە هۆی زۆربوونی کتێبی فەلسەفیی و لۆژیکیی داواکاریی لەسەریان بۆ وەرگێڕان، هەروەها ئەو پەیڤینە ئاینییە قوڵانەی کە لەگەڵ خاوەن ئاینانی دیکەدا دەکرا، بە تایبەتی و مەسیحی و جوولەکەکان، بووە هۆی هێنانەکایەی پێویستی وەرگێڕانی کتێبی لۆژیکیی و فەلسەفیی، چونکە لە قسەکانیاندا ئەم خاوەن ئایینانەی دیکە پشتیان بە بابەتی فەلسەفیی و لۆژیکیی دەبەست بۆ قسەکردن لەسەر ئیسلام، بۆ وەڵامدانەوەشیان

---

(١) ابن خلدون: المقدمة، ج١،ص٤٨٠، ٤٨١ " الدبيان:م.س، مج١،ص٣٩،٣٨.

مسوڵمانان پێویستیان بەوە هەبوو کە شارەزای ئەو بابەتانە بن کە ئەمان قسەیان پێدەکرد، ئەمەش زیاتر پێویستی وەرگێڕانی هێنایە کایەوە[1].

دیارە ئەمە سەرباری هاتنە کایەی پێویستیەکانی دیکەی وەك ژماردن (حساب) و پاش ئەوەی کە وەدەست هاتووەکانی تاکەکەس و دەوڵەت ڕووی لە زیادبوون کرد، هەروەها پێویستی بە وەرگرتنی زانیارییە پزیشکییەکان و بۆ چاکبوونەوە لە نەخۆشیی، بەتایبەتی کاتێك هەندێك خەلیفەی وەك (أبوجعفر المنصور) نەخۆش کەوت بە نەخۆشی گەدە، فەرمانی بە وەرگێڕانی کتێبی پزیشکیی دا بۆ چارەسەرکردنی، دیارە ئەم پێویستییانە یەکێك بوو لە هاندەرە سەرەکییەکانی بزووتنەوەی وەرگێڕان[2].

٥- زیادبوون و دروستکردنی وەرەقە (کاغەز):

زیادبوونی وەرەقە (کاغەز) و دروستکردنی لەناو خەلافەتی ئیسلامییدا بە هاوشێوەی شۆڕشێکی زانستی گەورە وابوو لەم دەوڵەتەدا، چونکە وەرەقە نەك تەنها بۆ وەرگێڕان سوودی هەبوو، بەڵکو بۆ بەدەستخستنی کتێب لە ڕێگای نووسینەوە، هەروەها زیادبوونی کتێبی وەرگێڕدراویش بەناو خەڵکدا سوودی تایبەتیی هەبوو، ئەم بابەتە زیاتر لە سەردەمی خەلیفە (هارون الرشید) زیاتر پەرەی سەند، لە پێش ئەم ماوەیەدا وەرەقە تەنها دەبوایە لە ڕێگای بازرگانییەوە و لە وڵاتی (چین)ەوە بهاتایە، ئەمەش سەرباری ئەوەی بڕەکەی کەم بوو، ماوە و تێچوونێکی زۆریشی دەویست،

---

(١) أسد رستم: الروم في سياستهم و حضارتهم و دينهم و ثقافتهم و صلاتهم بالعرب، بيروت، ١٩٥٥م،ج١/ص٣٤٦ " هنري بيكر: التراث الأوائل في الشرق و الغرب، تر.د.عبدالرحمن بدوي، مقال في كتاب التراث اليوناني في الحضارة الاسلامية، ص١١ " د.الشحات السيد زغلول: م.س، ص١٧٣، ١٧٤.

(٢)أحمد أمين: ضحى الاسلام، ج١، ص٢٦٦، ٢٦٧ " حسن أحمد محمود و أحمد إبراهيم الشريف: العالم الاسلامي في عصر العباسي، القاهرة، ١٩٦٦م، ص٢٧٠" د.حسين قاسم العزيز: دور المراكز الثقافية في تفاعل العرب و المسلمين الحضاري، ص٣٨٩" د.كامل حمود: دراسات في تاريخ الفلسفة العربية، ص٦٢، ٦٣.

بەڵام پاش فەتحکردنی (سەمەرقەند) لەلایەن مسوڵمانانەوە، لەوێدا (کاغەز)یان دۆزیەوە، هەرچەندە لە سەرەتادا نەیانزانی ئەمە چییە، بەڵام دوایی گرنگیی ئەم بابەتەیان بۆ دەرکەوت و بووە یەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی ڕابوونە زانستیی و شارستانییەتەکەیان[1]، هەروەها خەلیفە (هارون الرشید) هەر زوو هەستی بە گرنگیی ئەم بابەتە کرد و کارگەیەکی تایبەتی بە دروستکردنی وەرەقە بنیات نا، لەم بارەیەوە (القلقشندي) دەڵێت: ((کاتێك کە خەلیفە هارون الرشید خەلافەتی گرتە دەست وەرەقە زۆر بوو، لەنێوان خەڵکیدا کارەکانی بڵاوبۆوە و فەرمانی دەرکرد ئەگەر لەسەر وەرەقە (کاغەز) نەبێت خەڵکی شت نەنووسن، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە پێست و هاوشێوەکانی ئاسانە کە بسڕدرێتەوە و شتی دووبارە لەسەر بنووسرێتەوە، ئەمەش بواری ساختەکاریی تیادا زیاد دەکات، بەڵام ئەگەر هەوڵ بدرێت کە بابەتەکانی سەر وەرەقە بسڕدرێتەوە، ئەوا ئەو وەرەقەیە خراپ دەبێت، بەم جۆرەش وەرەقە لە سەرجەم وڵاتدا بڵاوبوویەوە[2])).

بۆیە دەتوانین بڵێین کە دۆزینەوەی وەرەقە (کاغەز)، یەکێکە لە ناوازەترین هۆکارەکانی برەوسەندنی بزووتنەوەی وەرگێڕان و پێشخستنی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا.

---

(١) جاك.س. ريسلر: الحضارة العربية، ص١٢٠ – ١٢١ " الجميلي: م.س، ص٥٨، ٥٩.

(٢) صبح الأعشى، ج٢/ص٤٧٥، ٤٧٦.

## باسی دووەم: دیارترین وەرگێڕکاران و بەرهەم و شێوازەکانیان:

یەکێك لە گرنگترین کارەکتەرەکانی بزووتنەوەی وەرگێڕان، ئەو وەرگێڕکارانەن کە لەو بوارەدا کاریان کردووە، چونکە ئەگەر ئەمانە نەبوونایە ئەوا هەرچەندە هەوڵەکانیش زۆر بوونایە لە پێناوی بەدەستخستنی کەلتووری شارستانیەتی یۆنانیی، نەدەتوانرا کە سوودیان لێوەربگیرێت، ئەمە لەلایەك، لە لایەکی دیکەیشەوە ئەم وەرگێڕکارانە ڕاستەوخۆ مامەڵەیان لەگەڵ دەقەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوادا دەکرد و وەریان دەگێڕایە سەر زمانی عەرەبیی، بۆیە لەم باسەدا وای بە باش دەزانین بە پوختیی باس لە دەستەبژێرێك لە گرنگترین وەرگێڕکارانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان و بەرهەم و شێوازەکانی وەرگێڕانی هەریەکەیان، بکەین.

دیارترین ئەو وەرگێڕاکارانەش:

**١- یوحەننا بن بەتریق:**

یەکێکە لە وەرگێڕە سەرەتاییەکانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، کە لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور)ەوە بابەتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خەلیفە (أبوجعفر المنصور) داوای لێکردووە کە کتێبی کۆنی بۆ وەربگێڕێتە سەرزمانی عەرەبی و ئەویش چەندین کتێبی بەنرخی لە بواری پزیشکییدا لە کتێبەکانی (أبقراط و جالینوس) بۆ وەرگێڕاوە[1].

هەروەها لە سەردەمی خەلیفە (المأمون)دا زۆر لێیەوە نزیك بووە، بە جۆرێك کە زۆرێك لە سەرچاوەکان بە (مولى المأمون) ناوی دەبەن، لە ڕووی وەرگێڕانەوە کەسایەتییەکی ڕاستگۆ بووە لە وەرگێڕاندا و هەوڵیشداوە وشەکان جوان دابڕژێتەوە، هەروەها یەکێك بووە لەو وەرگێڕکارانەی کە خەلیفە (المأمون) ناردوویەتی بۆ وڵاتی

---

(١) إبن أبي أصيبعة: عيون الأنباء، ج١/ص٢٨٢ " أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة العربية في القرن الثالث الهجري، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٢م، ٢٦٩.

ڕۆم بە مەبەستی هێنانی کتێب و وەرگێڕانیان، ئەم کەسایەتییە لە ساڵی (٢٠٠ك) کۆچی دوایی کردووە[١].

لە دیارترین بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی بریتیە لە چەند کتێبێکی ئەرستۆتالیس، لەوانەش ئەو کتێبەی کە ئەرستۆ بۆ ئەسکەندەری نووسیوە، بە ناوی (سر الأسرار)، ئەم کتێبە کتێبێکی سیاسییە لە بارەی ڕێکخستنی جەنگەکانەوەیە، پێدەچێت لە بەدەستخستنیدا زۆر گەڕابێت و پاشان بە داواکردنی خەلیفە وەریگێڕاوە، هەروەها هەریەك لە کتێبەکانی (السماء والعالم و کتاب النفس و کتاب الحیوان) و چەندین بابەتی دیکەی بەتایبەتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی[٢].

**٢- حەججاج بن مەتر:**

(الحجاج بن یوسف بن مطر)، ئەم وەرگێڕە لە بنەچەدا خەڵکی (کوفە) بووە و لە بەغداد ژیاوە، یەکێکە لە وەرگێڕە پێشینەکانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، لە یەکەمینی ئەو کەسانەش بووە کە لە (بیت الحکمة)دا کاریان کردووە، (إبن الندیم) لە کتێبەکەیدا لە لیستی ئەو کەسە پێشینانە ناوی هێناوە کە کاری وەرگێڕانیان کردووە [٣].

لە گرنگترین کارەکانی لەم بوارەدا وەرگێڕانی کتێبی (الأصول)ی (أقلیدس) بووە کە دوو جار ئەم کتێبەی وەرگێڕاوە، جاری یەکەم بە هارونیی ناسراوە، واتە لە سەردەمی خەلیفە (هارون الرشید) وەرگێڕدراوە، جاری دووەم بە (المأموني) ناسراوە، واتە لە سەردەمی خەلیفە (المأون) وەرگێڕدراوە، هەروەها چەند

---

(١) إبن جلجل: طبقات الأطباء، ص٦٧ " إبن العبري: تاريخ مختصر الدول، ص٢٣٩ " القنوجي: أبجد العلوم، ج٢/ص٢٥٤.

(٢) إبن جلجل: م.س، ص٦٧ " إبن النديم: الفهرست، ص٣٦٥ " القفطي: تاريخ العلماء، ص٤١.

(٣) إبن النديم: م.ن، ص٣٤٠ " القفطي: م.ن، ص٦٤ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١ / ص٢٨٠ " زهير حميدان: أعلام الحضارة العربية الاسلامية، مج١ / ص٢٩٤.

بەرهـەمێکی دیکەیـشی هەیـە، لەوانـە بـاس لـەوە دەکرێـت کـە کتێبـی (المجـسط)ی (بطليموس)ی وەرگێڕاوە[1].

٣- یوحەننا بن ماسویە:

ئـەم وەرگێڕکـارە کەسـایەتییەکی مەسـیحیی سـریانیی بـووە، یـەکێك بـووە لـە وەرگێڕ و پزیشك و فەیلەسوفە ناودارەکانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، ڕۆڵی ئەم کەسایەتییە بە تایبەتی وەك وەرگێڕ، لە سـەردەمی خەلیفـە (هـارون الرشـيد)دا دەردەکەوێت، کاتێك دەیکات بە بەرپرسـی خانـەی وەرگێـڕان و ڕای دەسـپێرێت کـە ئـەو کتێبـە پزیـشکییە کۆنانـەی لـە هـەردوو ناوچـەی (عموريـة و أنقـرة) و تـەواوی ناوچـەکانی دیکـەی ئیمپراتۆرییـەتی ڕۆمـانیی لـە پـاش پرۆسـەی فتوحـات بـۆ ئـەو ناوچـانە دەسـتيان بەسـەردا گرتـوون، وەريانبگێڕێتـە سـەر زمـانی عـەرەبی، ژمارەیەکیشی لە نووسەری تایبەتی خستە بەردەستی بـە مەبەسـتی نووسـینەوەی بابەتە وەرگێڕدراوەکان، لێرەوە کارەکانی لە بواری وەرگێڕاندا بـەردەوام دەبێـت تـا سەردەمی پاش خەلیفە (المأمون) درێژ دەبێتەوە[2].

ئەمـە سـەرباری ئـەوەی لـە سـەردەمی خەلیفـە (المـأمون) کـە سـەردەمی نێردەرەکانـە بـۆ وڵاتـی ڕۆم بـە مەبەسـتی پەیـداکردن و بەدەستخـستنی بابـەتی دەستنووسی زانستیی یۆنانیی و وەرگێڕانیان بۆ زمانی عـەرەبیی، چـەندین جـار بـە سـەرۆکایەتی ئـەو نێردەرانـە نێردراوەتـە وڵاتـی ڕۆم، ئـەم کەسـایەتییە لەلایـەن خەلیفەکانی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکانەوە زۆر ڕێـزی لـێگیراوە، بەتایبـەتی لەلایەن هەردوو خەلیفە (المأمون و الواثق) و خـاوەنی پلـە و پایـەی تایبـەتی بـووە لەلایان[3]، بۆ نموونە (إبـن أبـي أصـيبعة) ڕووداوێـك دەگێڕێتـەوە کـە لـە سـەردەمی

(١) إبن النديم: م.ن، ص٣٤٠ " القفطي: م.ن، ص٦٤ " إبن أبـي أصـيبعة: م.ن، ج١ / ص٢٨٠ " أحمد عبدالباقي: م.س، ص٢٦٨.

(٢) إبن جلجل: م.ن، ص٦٥" القفطي: م.ن، ص٢٤٩ " أدورد فنديك: إكتفاء القنـوع، دار صـادر، بيروت، ١٨٩٦م،ص٢١٥.

(٣) أحمد أمين: ضحى الاسلام، ج٢/ ص٦٢.

خەلیفــە (الواثــق)دا ڕوی داوە، کــە لــە مەجلــسی خەلیفــەدا خزمەتگوزارەکــەی خواردنەوەیەکی بێکەڵك دەداتە (یوحنا بن ماسویە) کاتێك ئەمە بە خەلیفـە دەڵێـت، زۆر تـووڕە دەبێـت و بڕیـار دەدات بـە زیـاتر لـە (٣٠٠) هـەزار درهـەم قـەرەبووی بـۆ بکرێتەوە[1].

سەرباری ئەمانەش، ئەم کەسایەتییە گەورەترین کۆڕبەندی زانستیی هەبووە لـە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا کە چەندین خوێنـدکاری تایبـەتیی وانـەیان تیـادا خوێنـدووە، بەتایبـەتی لـە بـواری پزیـشکییدا[2]، بەهـەرحاڵ، (یوحنـا بـن ماسـویە) چەندین کتێبی لە شارستانیەتی یۆنانییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی کە بە زیاتر لە (٤٠) کتێب مەزەندە دەکرێت، لەو کتێبانەش:

کتاب الکمال والتمام، کتاب الکامل، کتاب الحمام، کتاب دفع ضرر الأغذية، کتاب الاسهال، کتاب عج الصداع، کتاب السدر و الدوار، کتـاب لم إمتنـع الأطبـاء عـن عـلاج الحوامل في بعض شهور حملهن، کتاب محنة الطبيين، کتاب الصوت البحة، کتـاب مـاء الـشعير، کتـاب الفـصد و الحجامـة، کتـاب مـرة الـسوداء، کتـاب عـلاج النـساء اللاتـي لايحبلن، کتاب إصلاح الأدوية المسهلة، کتاب الحميا تمشجر، کتـاب القـولنج، چـەندین کتێبی دیکە کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ناویان هاتووە[3].

**٤- حونەین بن ئیسحاق ئەلعیبادی:**

ناسـراوە بـە (أبـو زيـد العبـادي)، یـەکێك بـووە لـە دیـارترین و شـارەزاترین وەرگێڕکارانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان، کـە ژمـارەی وەرگێڕدراوەکـانی بـە زۆرترین بەرهەمی، نـەك سـەردەمی خـۆی، بگـرە سـەردەمانی دواتـریش دادەنرێـت، بەتایبەتیش لە وەرگێڕانی کتێبی یۆنانییدا بـۆ زمـانی عـەرەبیی و سـریانیی، چـونکە زمانی یۆنانیی زۆر بە باشیی زانیوە، ئەمە سـەرباری ئـەوەی کـە زمانـەکانی دیکـەی وەك (عـەرەبی و فارسـی و سـریان)یـشی بـاش زانیـوە، لـە پێنـاوی بەدەستخستنی

---

(١) عيون الأنباء، ج١، ص٣٤٦ " الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٢٩/ ص٣٠-٣١.

(٢) إبن العبري: م.س، ص٢٢٧.

(٣) إبن جلجل: م.س، ص٦٥ – ٦٦ " إبن النديم: م.س، ص٤١١ " القفطي: م.س، ص٣٨١.

دەستنووسی گرنگ، چەندین جار گەشتی کردووە بۆ سەرجەم ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی[1].

(حنين بن إسحاق العبادي) لە ساڵی (١٩٤ك – ٨٠٩ز) لە ناوچەی (حيرة*) لە دایك بووە، لە تەمەنی هەرزەکارییدا چووەتە بەغداد بە مەبەستی خوێندنی پیشەی پزیشکیی لە کۆڕی (يوحنا بن ماسويه)، بەڵام هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن لەبەر ئەوەی (حنين) زۆر پرسیار لەسەر بابەتەکان دەکات، هەروەها لەبەر ئەوەشی کە (جنديسابور)ی نەبووە، چونکە لەو سەردەمەدا بیروباوەڕ وا باو بوو کە ئەگەر یەکێك خەڵکی ئەو شارە نەبێت بە کەڵکی ئەوە نایەت کە ببێت بە پزیشك، یان پیشەی پزیشکیی بخوێنێت، بۆیە لەلایەن (يوحنا بن ماسويه) لە کۆڕەکەی دەردەکرێت و پێی دەڵێت کە ئەو بەکەڵکی پیشەی پزیشکیی نایەت[2].

ئەم ڕووداوە کاریگەریی زۆر لە (حنين) دەکات، بۆیە بڕیار دەدات کە هەتا بەتەواوەتی فێری زمانی یۆنانیی نەبێت نەچێتەوە بەلای پزیشکییدا، بۆ ئەم مەبەستەش دەست دەکات بە گەشتکردن بە ناوچەکانی شام و میسر و

(١) البيهقي: تتمة صوان الحكمة، ص١٦ " إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٢ / ص٢١٧ " أحمد بن محمد بن عبدالله الدبيان: حنين بن إسحق العبادي، مج١/ ل ٧٥ " أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة في القرن الثالث الهجري، ص٢٧٤ " محمد رجب السامرائي: علم الفلك عند العرب، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٤م، ص٨٣ – ٨٤.

* الحيرة: شارێکی کۆنی ئارامییەکانە و بە نزیکەی سێ میل دەکەوێتە باشووری شاری کوفەوە، لە ساڵی (٢٠٤ پ.ز) بنیات نراوە، دانیشتوانی ئەم شارە لە مەسیحییە (نسطوري)ەکان بوون و چەندین دێر و خوێندنگایان هەبووە، هەر لە سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحیی، دانیشتوانی ئەم شارە بوون بە مەسیحیی و پێش هاتنی ئیسلامیش ئەم شارە پایتەختی دەوڵەتی (المناذرة) بووە کە ئەمانیش مەسیحیی بوون. أحمد بن محمد بن عبدالله الدبيان: حنين بن إسحق العبادي، مج١/ ل ٧٥.

(٢) القفطي: م.س، ص١٧٤ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٥٧ – ٢٥٨ " زيغريد هونكة: شمس العرب، ص٣٨٠.

ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیی و لەم ماوەیەدا سەردانی ئەسکەندەریە دەکات وەك یەکێك لە ناوەندە گرنگەکانی شارستانیەتی یۆنانیی، لەوێ زۆر بە باشی فێری زمانی یۆنانیی و پیشەی پزیشکیی دەبێت، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هێندە شارەزا بووە لە زمانی یۆنانییدا کە بۆ خۆی زۆربەی شیعرە یۆنانییەکانی (هۆمیرۆس)ی لە شێوەی گۆرانی لەبەر بووە و وتونیەتیەوە [(١)].

(البیهقي) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((یەکەم کەس بووە کە زمانی یۆنانیی شیکردبێتەوە و بابەتی لێوە وەرگێڕابێتە سەر زمانی عەرەبیی و سریانیی و ناتوانرێت لە ماوەی پاش ئەسکەندەردا کەسێك بدۆزرێتەوە کە لە ئەو (حنین) شارەزاتر بووبێت لە زمانی عەرەبی و گریکیدا[(٢)])).

بەهەرحاڵ، پاش ئەمە بە کۆمەڵێك دەستنووسی یۆنانییەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد و لەوێ سەرەتا نەوەکانی (موسى بن شاكر) پەیوەندیی پێوە دەکەن و داوای لێدەکەن کە کتێبی یۆنانیان بۆ وەرگێڕێت، هەروەها دەینێرن بۆ ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانیی بە مەبەستی هێنانی کتێب و دەستنووسی یۆنانیی، لەم پێناوەشدا چەندین بڕی زۆر پارەی پێدەدەن[(٣)].

پاش ئەمان (جبرائيل بن بختيشوع بن جبرائيل) پەیوەندیی پێوە دەکات و داوای لێدەکات کە کتێبی لە بواری پزیشکییدا بۆ وەربگێڕێت، شایەنی باسە کە (جبرائیل) زۆر لە (حنین) ڕازی دەبێت هەرچەندە کە لە تەمەندا لە سەرەتای لاوێتیدا دەبێت، بەڵام (جبرائیل) بە (رب حنين) واتە (مامۆستا حنين) بانگی دەکات[(٤)].

---

(١) إبن النديم: م.س، ص٤٢٣" إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٥٧ – ٢٥٨ " إسماعيل مظهر: الفكر العربي نشوئه و تطوره بالترجمة عن الحضارة اليونانية، منشورات مجلة العصور لنشر المعرفة و الآداب،القاهرة، ١٩٢٨م، ص٥١ " زيغريد هونكة: م.س، ص٣٨٠.

(٢) تتمة صوان الحكمة، ص١٥.

(٣) إبن النديم: م.س، ص٤٢٣" إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٥٧ – ٢٥٨ " أحمد بن محمد بن عبدالله الدبيان: م.س، ص٨٤ – ٨٥ " زهير حميدان، م.س، ص٤٠٦.

(٤) القفطي: م.س، ص١٧٤ - ١٧٥ " إبن أبي أصيبعة: م.ن، ج١، ص٢٥٨ – ٢٥٩.

هەروەها کاتێك کە (یوحنا بن ماسویه)ی کۆنە مامۆستای هەست بە زیرەکیی و لێوەشاوەیی (حنین) دەکات، بە تایبەتی کە یەکێك لە وەرگێڕانەکانی دەبینێت، پەیوەندیی پێوە دەکات و لەسەر ڕووداوەکانی ڕابردوو پۆزشی بۆ دەهێنێتەوە و داوای لێدەکات کە کتێبی لە بواری پزیشکییدا بۆ وەربگێڕێت، لێرەوە ئیدی ئەستێرەی (حنین) ڕوو لە گەشانەوە دەکات، بەجۆرێك کە لە داهاتوودا دەبێتە بەناوبانگترین و کاریگەرترین وەرگێڕکاری، نەك تەنها سەردەمی یەکەمی عەبباسیەکان، بەڵکو سەرجەم سەردەمەکانی دواتری شارستانیەتی ئیسلامیی [1].

پاشان لەلایەن خەلیفە (المأمون)ەوە پەیوەندیی پێوە دەکرێت و فەرمانی پێدەدات کە هەرچیەکی لە کتێبی کۆنی یۆنانیی بەردەست دەکەوێت لە بواری (حکمة)دا وەریبگێڕێتە سەر زمانی عەرەبیی، ئەمە سەرباری ئەوەی کە داوای لێکرد کە هەرچییەکی لە وەرگێڕدراوە کۆنەکانی سەردەمی هەیە پیایدا بچێتەوە، زۆر نابات کە خەلیفە (حنین) دەکات بە بەرپرسی بەشی وەرگێڕان لە (بیت الحکمة) لێرەوە ئیدی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە کتێبی یۆنانیی وەردەگێڕێتە سەر هەردوو زمانی عەرەبیی و سریانیی، بە تایبەتی لە بواری پزیشکییدا لە کتێبەکانی (جالینوس) و هەروەها لە بواری فەلسەفەدا لە کتێبەکانی (ئەرستۆتالیس)[2].

شایەنی باسە کە خەلیفە هێندە لە کارەکانی (حنین) ڕازی بووە کە بە هێندەی کتێبەکانی زێڕی پێداوە، بۆیە ئەمیش لە وەرگێڕانەکانیدا بە نووسەرەکانی ڕادەگەیاند کە بە خەتی گەورە بنووسن و دێڕ زۆر بەجێبهێڵن و لەسەر لاپەڕەی

---

(١) القفطي: م.س، ص١٧٤ - ١٧٥ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٥٨ — ٢٥٩ " أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة: ص٢٧٥" الدبيان: م.س، ص٨٣ — ٨٤" زهير حميدان: م.س، ص٤٠٦ — ٤٠٧.

(٢) إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٢/ ص٢١٧ " أوليري: إنتقال علوم الإغريق الى العرب، ص٢٢٠ " الزركلي: مج٢/ ص٢٨٧.

قورسیش بنووسنەوە، دیارە ئەمەش لەبەر ئەوەی کە بابەتەکانی قورستر و گەورەتر بنوێنێت[1].

ئەمە جگە لەوەی کە خەلیفە (المأمون) چەندین جار لەگەڵ نێردراوەکاندا ناردوویەتی بۆ ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیی بە مەبەستی بەدەستخستنی دەستنووسی گرنگی یۆنانیی و وەرگێڕانیان بۆ زمانی عەرەبی، هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خەلیفە (المأمون) سەرباری ئەوەی تەواوی کارەکانی (حنین)ی دەخوێندەوە، هەمووکات نیشانەیەکیشی لەسەر بابەتە وەرگێڕدراوەکانی دادەناو گرنگیی بابەتەکەی دەردەخست، هەروەها (حنین) بۆخۆیشی سەرباری وەرگێڕانی بابەتەکان، زۆرجار پەراوێزی بە یۆنانی لەسەر دەستنووسەکان نووسیوە و ڕوونکردنەوەی بۆ داون[2].

لە وەرگێڕاندا (حنین) بەوە ناسرابوو کە هەمیشە حەزی بەوە کردووە کە دەستنووسی ڕەسەنی دەست بکەوێت و کارەکەی تیادا ئەنجام بدات، ئەگەر ئەمەش نەبوایە ئەوا زۆرجار چەندین دەستنووسی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە و بەراوردی کردوون و ڕاستترینیانی هەڵبژاردووە و ئەوکات وەرگێڕانی تیادا کردووە، هەروەها بەوە ناسراوە کە شێوازی لە وەرگێڕاندا شێوازێکی ئاسان و جوان بووە لە داڕشتنەوەی ماناکانی بابەتەکەدا[3].

پاش خەلیفە (المأمون) ئەم کەسایەتییە لەسەر کارەکانی خۆی بەردەوام دەبێت و بگرە زیاتریش پەرە بە کارەکانی خۆی دەدات و بەرەو پێشەوە دەچێت، لەم ماوەیەدا (محمد بن عبدالملك الزيات)ی وەزیری خەلیفە (المعتصم) پەیوەندیی پێوە دەکات و چەندین کتێبی بۆ وەردەگێڕێ، لەوانەش کتێبی (الصوت)، پاشان لە

---

(١) إبن قتيبة: فضل العرب و التنبيه على علومها، ص١٤٩ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٧٠ – ٢٧١ " د.أحمد فريد الرفاعي: عصر المأمون، ص٣٧٧ " الزركلي: م.س، مج٢، ص٢٨٧ " زهير حميدان: م.س، ص٤٠٦.

(٢) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٧٠ – ٢٧١ " زهير حميدان: م.س، ص٤٠٦.

(٣) أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة، ص٢٧٧.

سەردەمی خەلیفە (الواثق) دووبارە کارەکانی لە (بیت الحکمة) بەرەو گەشانەوە دەچێت و ئیدی کارەکانی لەم ماوەیەشدا هەر بەردەوام دەبێت، دیارە ئەمەی کە لێی دواین وەك قۆناغی یەکەمی ژیانی (حنین بن إسحاق العبادي) و کارەکانی لە بواری وەرگێڕاندا کە کەوتۆتە ناو سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانەوە، کە لەم ماوەیەدا گەلێك کاری گرنگی کردووە و بە کارەکانی توانی قۆناغێکی باش لە بەرەوپێشچوونی بزووتنەوەی وەرگێڕان لەم قۆناغەدا پاڵ پێوە بنێت، قۆناغی دووەمی کارەکانی لە سەردەمی خەلیفە (المتوکل علی الله) و خەلیفەکانی دیکەی پاش ئەم زیاتر دەردەکەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی لەماوەی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەدا نییە، لێی نادوێین[1].

هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن، ئەم کەسایەتییە ژمارەیەکی زۆری لە کتێب وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی کە سەرجەم بابەتە وەرگێڕدراوەکانی نزیکەی (٩٧) کتێبە بۆ زمانی عەرەبی و بۆ زمانی سریانی (٢١) کتێبە و کتێبە نادیارەکانیشی (١٠٨) کتێبە و ئەو کتێبانەشی کە پیاداچوونەوەی بۆ کردوون (١٥) کتێبە، ئەمە جگە لەوەی کە زیاتر لە (٥٣) کتێبی دانراوی هەیە بە زمانی عەرەبیی و هەروەها (٣٠) کتێبیشی بە زمانی سریانیی داناوە[2]، ئەمانەی خوارەوە ناوی هەندێك لە بەرهەمەکانییەتی:

لە بواری پزیشکییدا بابەتە وەرگێڕدراوەکانی زیاتر کتێبەکانی (جالینوس) و هەروەها ئەو شیکارانەن کە بۆ بابەتەکانی (أبقراط) کردوویەتی، لەوانەش:

(کتاب الفرق، کتاب الصناعة، کتاب النبض، کتاب في التأتي لشفاء الأمراض، کتاب المقالات الخمس في التشريع، کتاب الاستقصاء، کتاب المزاج، کتاب القوى

---

(١) أحمد بن محمد بن عبدالله الدبيان: م.س، ص٨٥.

(٢) بۆ زیاتر شارەزایی لە بارەی سەرجەم بەرهەمەکانییەوە، بڕوانە: عامر رشيد السامرائي، عبدالحميد العلوضي: آثار حنين بن إسحاق، مطبوعات مجمع اللغة السريانية، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٤م، ص٢٠٥ – ٢١٩.

الطبيعية، كتاب العلل و الأعراض، كتاب الحميات، كتاب البحران، كتاب أيام البحـران، كتاب علل الأعضاء الباطنة) [1].

هەروەها لەو کتێبانـەی (أبقـراط) کـە (جـالینوس) شـیکاری کـردوون، ئەمانـەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عـەرەبیی: (کتـاب عهـد أبقـراط، کتـاب فـصول علـى طریـق المسألة والجواب) ئەم کتێبەیان حەوت بەشە، سەرەتا بۆ سریانی وەرگێـڕاوە، بـەڵام چوار بەشی سەرەتایی بۆ (محمد بن موسی بن شـاکر) کـردووە بـە عـەرەبی، (کتـاب تقدمة المعرفة عن طریق المـسائلة والجـواب، کتـاب القـاطریون، کتـاب المـاء والهـواء، کتاب طبیعة الانـسان، کتـاب ثمـار تفـسیر جـالینوس لکتـاب أبقـراط لتـدبیر لأمـراض الحادة)[2].

ئەمانە سەرباری چـەند بابـەتێکی دیکـەی جیـاواز لـە سـەرجەم بوارەکانـدا، بـۆ نموونە، وەك:

(کتاب الصوت کە بۆ (محمد بـن عبـدالملك الزیـات)ی وەرگێـڕاوە: کتـاب أفـضل الهیئات، کتاب سود المزاج، کتاب الأدویة المنفردة، کتاب المولود لسبعة أشهر، کتـاب رداءة التنفس، کتاب الزبول علی طریق المسألة والجواب، کتاب تدبیر الملطـف، کتـاب قـوی الأغزیـة، کتـاب تـدبیر أبقـراط للأمـراض الحـادة، کتـاب في أن الطبیـب الفاضـل الفیلسوف، کتاب في کتب أبقراط الصحیة و غیر صحیة، کتاب محنة الطبیین، کتـاب في أن المحرك الأول لایتحـرك، کتـاب الـسبعة عـشرة مقالـة موجـودة في کتـاب جـالینوس، أبیذیمیا لأبقراط عن طریق المسألة والجواب..... هتد)[3].

هەروەها لە کتێبەکانی (ئەرستۆتاڵیس) ئەم بابەتانەی وەرگێڕاوە:

(١) إبن النديم: م.س، ص٤١٧ " القفطي: م.س، ص١٢٩.

(٢) إبن النديم: م.س، ص٤١٥ - ٤١٦" إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٧٢.

(٣) إبن النديم: م.ن، ص٤١٨ - ٤١٩ " القفطي: م.س، ص١٣٠-١٣١.

(كتاب قاطيغورياس (المقولات)، كتاب باريامانياس أو بايرميناس (العبارة)، أنولوطيقيا الأول (التحليل)، أنولوطيقيا الثاني (البرهان)، كتاب الكون والفساد، كتاب النفس، كتاب الاخلاق، كتاب تبيان لأرسطو)[1].

هەروەها چەندین بابەتی دیکەی جیاوازی وەرگێڕاوە، لەوانەش:

(كتاب المترادفات لأوربياسيوس، المسمى سبعين مقالة كتاب السبعة لبولص الأجنيطي، شرح بروقلس على جمهورية أفلاطون، كتاب الأخلاط، كتاب في أفعال الشمس و القمر، كاب قرعة المناظر لأقليدس.....هتد)[2].

بەم جۆرە دەبینین کە (حنين بن إسحق العبادي) بەو ژمارە زۆرەی کتێبەکانیەوە کە وەریگێڕاوە، یەکێکە لە وەرگێڕە سەرەکییەکانی شارستانیەتی یۆنانیی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی و کاریگەریی بەدیار کەوتووە، هەرچەندە هەندێك لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەم بەرهەمانە سەرجەمیان هی (حنين) نییە، بەڵکو کاری ئەو وەرگێرکارانەن کە لە (بيت الحكمة)دا لەبەردەستیدا کاریان کردووە، وەك (حبيش بن الأعسم، عيسى بن يحيى، إسحق بن حنين) بوون، چونکە ئەو نووسەرانەی کە لەوێدا کاریان کردووە لەبەر ناوبانگی (حنين) و سەرۆکبوونی بۆ (بيت الحكمة)، کارەکانیان داوەتە پاڵ ئەو[3]، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە لە پلەی (حنين) کەم ناکاتەوە، چونکە ئەم کەسایەتییە یەکێك بووە لە وەرگێڕە سەرەکییەکانی ناو شارستانیەتی ئیسلامیی و بەرهەمەکانی و پشتگیرییەکانی بۆ بزووتنەوەی وەرگێڕان و دانپیادانانەکانی لەلایەن گەورە فەیلەسوفانی سەردەمی خۆیەوە سەرجەم بوونەتە مایەی ئەوەی کە ئەم کەسایەتییە بە کۆڵەکەی وەرگێڕانی شارستانیەتی یۆنانی دابنرێت بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی و سەرباری ئەوە ئەم کەسایەتییە جگە لە کاری وەرگێڕان بۆخۆی پزیشکێکی لێهاتووش بووە و لە بواری

---

(١) إبن النديم: م.ن، ص٣٦١ - ٣٦٢" القفطي: م.ن، ص٣٥ — ٣٦.

(٢) أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة، ص٢٧٩.

(٣) إبن النديم:م.س، ص٤١٧" القفطي: م.س،ص١٧٧.

پزیشکییدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە سەردەمی خۆیدا، بەڵام ئێمە لێرەدا پێمان باش بوو کە وەك وەرگێڕکارێك باسی بکەین.

**٥- یەعقوب بن ئیسحاق ئەلکیندی:**

ناوی (أبو یوسف یعقوب بن إسحاق بن صباح الکندي)ە، لە بنەچەیەکی ڕەسەنی عەرەبییە، بنەماڵەکەی لە خانەدان و میرەکانی عەرەب بوون، باپیری والی ولایەتەکانی (بني هاشم) بووە و باوکیشی ئەمیری (کوفە) بووە لە سەردەمی هەردوو خەلیفە (المهدي و الرشید)دا، ئەم کەسایەتییە بە بەناوبانگترین و کاریگەرترین زانا و فەیلەسوفی شارستانیەتی ئیسلامیی دادەنرێت کە بنەچەی عەرەب بووبێت و کاریگەر بووبێت بە شارستانیەتی یۆنانیی و هەروەها هەوڵی ڕەنگدانەوە و ئاوێتەبوونی ئەو شارستانییەتەشی دابێت لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا[١].

لەم بارەیەوە (إبن جلجل) دەڵێت: ((زانا بووە بە بواری پزیشکیی و فەلسەفە و زانستی حساب و لۆژیك و دانانی مۆسیقا و ئەندازیاریی و سروشت و ژمارە و گەردووناسیی و زانستی ئەستێرەکان، لە ئیسلامدا هیچ فەیلەسوفێك نییە جگە لە ئەو کە هاوشێوەی بێ و لە نووسینەکانیدا پشت ئەستوور بێت بە ئەرستۆتاڵیس و ژمارەیەکی زۆر نووسراوی هەیە لە هونەرەکان و لە زانستدا[٢])).

هەروەها (إبن أبي أصیبعة) دەڵێت: ((زۆرێکی لە کتێبی فەلسەفیی وەرگێڕاوە، هەروەها گرفتەکانی چارەسەرکردوون و قورسەکانی کورت کردۆتەوە و ناڕۆشنەکانی ڕوونکردۆتەوە، (أبومعشر) لە کتێبی (الشاذاني)دا دەڵێت پێشەنگانی وەرگێڕان لە ئیسلامدا چوارن، حنین بن إسحاق و یعقوب بن إسحاق الکندي و ثابت بن قرة الحراني و عمر فرخان الطبري....[٣])).

ئەم کەسایەتییە لە زۆرینەی زانستەکانی سەردەمی خۆی شارەزا بووە و بە فەرهەنگێکی کۆکراوەی ئەو زانستانە دادەنرێت، هەروەك لە سەرچاوەکاندا بە

---

(١) إبن جلجل: م.س، ص٧٣ " إبن العبري: م.س، ص٢٥٩ " إبن أبي أصيبعة، ج١، ص٢٨٥.

(٢) طبقات الأطباء، ص٧٣.

(٣) عيون الأنباء، ج١، ص٢٨٦.

(فيلسوف العرب) ناسراوه، (الكندي) له بواری فەلسەفەدا زۆر ڕۆچووە، بە جۆرێك كە هەوڵیداوه لەسەر ڕێگای (ئەفلاتۆنی نوێ) یەكانگیرییەك بكات له نێوان (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ)دا، هەروەها پێی وابووە كە (فیساگۆرسی نوێ) بنەمای سەرجەم زانستەكانە، هەروەها نزیكەی سێ بۆ چوار كتێبی لەبارەی تیۆری مۆسیقاوە داناوە، كە ئەم بەرهەمانەی بە كۆنترین كتێبی عەرەبی دادەنرێت لەو بوارەدا، ئەمەش زیاتر بەڵگەیە لەسەر چەندێتی كاریگەریی ئەم كەسایەتییە بە كتێب و بابەتەكانی شارستانیەتی یۆنانیی، بەتایبەتی یۆنانیی، چونكە ئەم كەسایەتییە شارەزاییەكی تەواوی هەبووە لە زمانی یۆنانییدا، بە جۆرێك كە چەندین (مصنفات)ی گەورەی لەو زمانەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی[1].

دیارترین كارە وەرگێڕدراوەكانی (الكندي) لە ئەو كاتەوە دەست پێدەكات كە لەلایەن خەلیفە (المأمون)ەوە هەڵدەبژێردرێت و پەیوەندیی پێوە دەكات بۆ ئەوەی چەند بابەتێكی (ئەرستۆتالیس) و بیریارانی دیكەی یۆنانیی بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبیی، دیارە بابەتە وەرگێڕدراوەكانی (الكندي) هەر لە بواری فەلسەفەدا نەبوو، بەڵكو زۆرێكی لە بابەت و لایەنەكانی دیكەیشی گرتبوویەوە، ئیدی لێرەوە ئەم كەسایەتییە لە سەردەمی هەرسێ خەلیفەی عەبباسی (المأمون و معتصم و الواثق) بەكاری وەرگێڕانەوە خەریك دەبێت و لە زۆرێك لە خەلیفەكانەوە نزیك بووە، ئەمەش وەك وەرگێڕ و زانا و فەیلەسوف لە هەمان كاتدا، چونكە هەروەك ئاماژەمان پێی دا ئەم كەسایەتییە بە تەنها هەر وەرگێڕكار نەبووە، بەڵكو بەهۆی ئەو شارەزاییە زۆرەی كە هەیبووە لە زمانی یۆنانییدا، توانیویەتی خزمەتێكی گەورە لە بواری وەرگێڕاندا بكات بە شارستانیەتی ئیسلامیی، دیارە سەرباری وەرگێڕان، (الكندي) بە بابەتە وەرگێڕدراوەكانیشدا چووەتەوە كە لەپێش ئەمدا ئەنجام دراون،

---

(١) أحمد عبدالباقي: من أعلام علماء العرب في القرن الثالث الهجري، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٠م، ص٣٢ — ٣٣ " فليب حتي: تاريخ العرب مطول، تر.محمد مبروك نافع، القاهرة، ١٩٤٨م،ط٢، ص٤٦٨.

ئەمــە ســەرباری ئــەوەی کــە بــە بابەتــە فەلــسەفییەکانی وەك (ئەرســتۆتاڵیس)دا چووەتەوە کە بە مامۆستای خۆی دادەنرێت لە بواری زانستی فەلسەفەدا[1].

بەهەرحاڵ، (الکندي) ژمارەیەکی یەکجار زۆر کتێبی هەیە، جا ئەمانە چ بە دانان بێت بە سوود وەرگرتن لە کتێبە یۆنانییەکانەوە، یان بە وەرگێڕانی ڕاسـتەوخۆ بێـت لە شارستانیەتی یۆنانییەوە، کە سـەرجەم بوارەکـانی وەك: (فەلـسەفە و مۆسـیقا و لۆژیك و پزیشکیی و گەردووننانسیی و جوگرافیا و سروشتناسیی و بیرکـاریی...هتـد) دەگرێتەوە.

(إبن الندیم) لە کتێبەکەیدا ناوی ژمارەیەکی یـەکجار زۆری لـە کتێبـی (الکنـدي) هێناوە، لەوانەش:

(٢٢) کتێب لە بواری فەلسەفە، وەك کتێبەکانی: کتاب ترتیب کتب ارسـطالیس، کتاب في قصد ارسطالیس في المقولات ایاها قصدا والموضوعة لها... هتـد، (٩) کتێـب لە بواری لۆژیکدا، وەك کتێبـی: کتـاب رسـالته في الإبانـة عـن قـول بطلیمـوس في أول کتابه المجسطي عن قول أرسطالیس في أنالوطیقا، کتاب رسالته في الاحتراس من خدع السوفسطائین... هتد، (١١) کتێب لە بواری حسابدا وەك کتێبـەکانی: کتـاب رسـالته في المدخل الی الارثماطیقی، کتاب رسالته في الإبانة عن الاعداد التي ذکرهـا أفلاطـون في کتابه السیاسة... هتد، (٨) کتێب لە بواری الکریات وەك کتێبەکانی: کتاب رسالته في أن العالم وکلما فیه کري الشکل، کتـاب رسـالته في ان الکـرة أعظـم الاشـکال الجرمیـة والدائرة أعظم من جمیع الاشکال البسیطة... هتد.

(١٩) کتێب لە بواری مۆسیقادا، وەك کتێبەکانی: کتاب رسـالته في ترتیـب الـنغم الدالة علی طبائع الأشخاص العالیة وتشابه التـألیف، کتـاب رسـالته في الایقـاع، کتـاب

---

(١) القفطي: م.س، ص٧٣ - ٧٤" إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١، ص٢٨٦" الجميلي: حركة الترجمة، ص٢٨٥ " قـدري حـافظ طوقـان: تـراث العـرب العلمـي في الرياضـيات و الفلـك، القـاهرة، ١٩٤١م،ص٩١ " علمـاء العـرب ومـاأعطوه للحـضارة، دار الكتـاب العربـي، بـيروت، (د.ت)، ص١١٤ — ١١٥ " وت.ج.ديبور: تاريخ الفلسفة في الإسلام، تر.محمد عبدالهادي أبو ريدة، القاهرة، ١٩٥٧م، ط٤،ص١٧٨.

رســالته في المــدخل الى صــناعة الموســيقى... هتــد، (١٩) كتێــب لــه بــوارى ئەستێرەناسییدا، وەك كتێبەكانى: كتاب رسالته في إيضاح علة رجوع الكواكب كتـاب رسالته في الشعاعات، كتاب رسالته في سرعة ما يـرى مـن حركـة الكواكـب إذا كانـت في الأفق وإبطائها كلما علت... هتد.

(٢٣) كتێب له بـوارى ئەندازيارييـدا وەك كتێبـەكانى: كتـاب رسـالته في أغـراض كتاب إقليدس كتاب رسالته في إصلاح كتـاب إقليـدس، كتـاب رسـالته في تقريـب قـول ارشميدس في قدر قطر الدائرة من محيطها، كتاب رسالته في تصحيح قول اسـقلاوس في المطالع، (١٦) كتێب له بوارى گەردوونناسییدا، وەك كتێبەكانى: كتاب رسـالته في أن طبيعة الفلك مخالفة لطبائع العناصر الأربعة وأنه طبيعة خامسة، كتاب في امتناع الجـرم الأقصى من الاستحالة، كتاب رسالته في صناعة بطلميوس الفلكية... هتد.

(٢٢) كتێـب لــه بــوارى پزيــشكييدا وەك كتێبــەكانى: كتــاب رســالته في الطــب البقراطي، كتاب رسالته في الغذاء والدواء المهلك... هتد.

(١٠) كتێب له بوارى (أحكاميات)دا: كتاب رسـالته في تقدمـة المعرفـة بالاسـتدلال بالأشـخاص العاليــة علــى المــسائل، كتــاب رســالته في الاســتدلال بالكــسوفات علــى الحوادث... هتد.

(١٧) كتێب له بوارى (جدليات)دا، وەك كتێبەكانى: كتـاب رسـالته في الـرد علـى المنانية كتاب رسالته في الرد على الثنوية... هتد، (٥) كتێب له بوارى (نفـس)دا، وەك كتێبەكانى: كتاب رسالته في أن النفس جوهر بسيط غير داثر مؤثر في الأجسام، كتـاب رسـالته في مائيــة الإنــسان والعــضو الــرئيس منــه... هتــد، (١٢) كتێــب لــه بــوارى (السياسة)دا وەك كتێبەكانى: كتاب رسالته في خبر فضيلة سـقراط، كتـاب رسـالته في ألفاظ سقراط، كتاب رسالته في محاورة جرت بين سقراط وارشيجانس، كتاب رسالته في خبر موت سقراط، كتاب رسالته في ما جرى بين سقراط والحرانيين... هتد.

(١٤) كتێب له بوارى (أحداثيات)دا، وەك كتێبەكانى: كتاب رسالته في الإبانة عـن العلة الفاعلة القريبة للكون والفساد في الكائنات الفاسدات، كتاب رسـالته في العلـة الـتي لها قيل ان النار والهواء والماء والأرض عناصر لجميـع الكائنـة الفاسـدة وهـي وغيرهـا

يستحيل بعضها إلى بعض، (٨) كتێب لە بواری (الأبعاديات)دا، وەك كتێبەكانی: كتاب رسالته في ابعاد مسافات الأقاليم، كتاب رسالته في استخراج بعد مركز القمر من الأرض.. هتد، (٥) كتێب لە بواری (تقدم المعرفة)دا، وەك كتێبەكانی: كتاب رسالته في أسرار تقدمة المعرفة، كتاب رسالته في تقدمة المعرفة بالأحداث... هتد، (٣٣) كتێب لە بواری (الأنواع) (طبيعيات)دا، وەك كتێبەكانی: كتاب رسالته في أنواع الجواهر الثمينة وغيرها، كتاب رسالته في أنواع الحجارة، كتاب رسالته في تلويح الزجاج، كتاب رسالته فيما يصبغ فيعطي لونا، كتاب رسالته في أنواع السيوف والحديد، كتاب رسالته فيما يطرح على الحديد والسيوف حتى لا تتثلم ولا تكل رسالته في الطائر الانسي، كتاب رسالته في تمويخ الحمام، كتاب رسالته في الطرح على البيض، كتاب رسالته في أنواع النحل وكرائمه، كتاب رسالته في عمل القمقم النباح، كتاب رسالته في العطر وأنواعه، كتاب رسالته في كيمياء العطر، كتاب رسالته في صنعة أطعمة من غير عناصرها، كتاب رسالته في الأسماء المعماة، كتاب رسالته في التنبيه على خدع الكيميائيين، كتاب رسالته في أركان الحيل، كتاب رسالته الكبيرة في الاجرام الغائصة في الماء، كتاب رسالته في الاثرين المحسوسين في الماء، كتاب رسالته في المد والجزر... هتد[(١)].

ئەم وەرگێڕكارانەی كە لە سەرەوە لێیان دواين سەرجەم ژيانيان، يان زۆرينەی ژيانيان و كارەكانيان لە سەردەمی يەكەمی عەبباسييەكاندا بووە، بەڵام هەندێكی ديكە لە وەرگێڕ هەن سەرباری ئەوەی كە چەند ساڵێكی كەمی تەمەنيان كەوتۆتە ناو سەردەمی يەكەمی عەباسييەكانەوە كەچی زۆرێك لە مێژوونووسان وەك وەرگێڕكارانی سەردەمی يەكەمی عەبباسييەكان دەيانناسێنن.

لە ديارترين ئەو وەرگێڕكارانەش:

---

(١) الفهرست: ص٣٥٨ — ٣٦٥.

١- قیستا بن لۆقا بەعلەبەکی:

یەکێکە لە زانا و فەیلەسوفە گەورەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی کە لە ڕووی ئایینەوە مەسیحیی بووە، ئەم کەسایەتییە شارەزاییەکی زۆری لە بوارەکانی پزیشکیی و ئەندازیاریی و فەلسەفە و مۆسیقادا هەبووە، زۆر بەباشی زمانەکانی یۆنانی و سریانی و عەرەبی زانیوە، ڕەنگە ئەم یۆنانی زانینەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە بۆ خۆی ماوەیەکی زۆر لە ولاتی ڕۆمان ژیاوە، هەرچەندە هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە بۆخۆیشی لە بنەچەدا یۆنانیی بووە(١)، پاش ئەوەی لە ڕۆماوە دەگەڕێتەوە بۆ شام و لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەکی زۆر لە دەستنووس و کتێبی یۆنانیی لەگەڵ خۆیدا دەباتەوە بۆ ئەوێ، پاشان لە بەغدادەوە بانگ دەکرێت و لەوێش دەبێتە یەکێك لە دیارترین وەرگێڕکارەکانی ئەوێ و لە (بيت الحكمة)دا بە پاڵ (حنين بن إسحق)ەوە دەست دەکات بە وەرگێڕان و وەرگێڕانەکانی زۆر ڕێکوپێك و ناوازە بووە، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە بۆخۆی لە ولاتی ڕۆمان خوێندوویەتی، هەروەك ئاماژەمان پێدا(٢)، بەجۆرێك کە لە پێش (حنين بن إسحاق)ەوە بووە، لەم بارەیەوە (إبن النديم) دەڵێت:((پێویست بوو لە پێش (حنين بن إسحاق) دایبنێم لە کتێبەکەم دا، بەڵام لەبەر ئەوەی پێش ئەو هەندێك کەس پرسیاریان لەبارەی

---

(١) إبن جلجل: م.س، ص٧٦ " أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة العربية في القرن الثالث الهجري، ص٢٨٣ " إسماعيل مظهر: م.س، ص٥٢ " الجميلي: م.س، ص٣١٠" د.علي عبدالله الرفاع: رواد علم الفلك في الحضارة العربية الاسلامية، الرياض، ١٤١٤هـ - ١٩٩٣م، ص٥٧ " د. محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية، عويدان للنشر والتوزيع، بيروت، ٢٠٠٧م، مج١، ص٣٠٨.

(٢) إبن النديم: م.س، ص٣٤٠ " القفطي: م.س، ص٢٦٢" إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ ص٣٢٩" حاجي خليفة: كشف الظنون، ج١/ص٣٢٩،٦٨١ " أحمد عبدالباقي: معالم الحضارة، ص٢٨٣ " أدور فنديك: م.س، ص٢٣٠.

حەنینەوە لێکردم بۆیە ئەوم پێش خستووە[1])). ئەم کەسایەتییە لـەماوەی تەمنیـدا چەندین کتێبی لە یۆنانییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لەوانەش:

کتـاب شـرح الأسـكندر الافروديـسي، كتـاب شـرح علـى كتـاب الـسماع الطبيعـي لأرسـطو، شـرح الأسـكندر علـى كتـاب الكـون والفـساد لأرسـطو، كتـاب آراء الفلـسفة المنسوبة الى فلوطين، الرياضة فلوطين، الفلاحة الرومانية له دانـانی الحكـيم قـسطوس بن اسكولر، كتاب النوادر اليونانيين، كتاب شرح مذاهب اليونانيين، كتـاب ديـوقنطس لة المسائل العددية[2].

**٢- حبيش بن ئەلحەسەن ئەلئەعسەم:**

حبيش بن الحسن الأعسم الدمشقي، یەکێکی دیکەیە لە وەرگێڕکارە کارامـەکانی شارستانیەتی ئیسلامیی، لە خوێندنگای (حنين بن إسحاق العبـادي)دا پێگەیـشتبوو، لەسەر دەستی (حنين)دا فێری پیشەی پزیشکیی بووە، چونکە خوشـکەزای (حـنين) بووە، ئەم کەسایەتییە زمانەکانی سریانیی و یۆنانیی و عەرەبیی بـە باشـی زانیـوە، بەڵام زۆربەی کارەکانی لە بواری وەرگێڕاندا لە زمانی سریانییەوە بووە بۆ عەرەبیی، هەرچەندە لە زمانی یۆنانییشەوە بابەتی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عـەرەبیی، (حـنين بـن إسـحاق) زۆر لـە کـارەنی لـە بـواری وەرگێڕانـدا ڕازی بـووە و بـەردەوام وەسـفی وەرگێڕانەکانی کردووە، هەروەها لەو کەسانە بووە کە بابەتی بۆ نـەوەکانی (موسـی بن شاکر) وەرگێـڕاوە[3]، هـەروەها لـە ڕووی چـاکیی و شـێوازی وەرگێڕانـەوە تـەواو هاوشـێوەی (حـنين) بـووە، لـەم بارەیـەوە (إبـن أبـي أصـيبعة) دەڵێـت: ((حبـیش خوێنـدکاری حـنين بـن إسـحاق بـووە و وەرگێڕێکـی چـاك بـووە، لـە ڕووی کـاری

---

(١) الفهرست، ص٤١٠.

(٢) بن النديم: م.ن، ص٣٥٠، ٣٥٥ " القفطـي: م.س، ص٣٨، ٤٠، ٥٧ " حـاجي خليفـة: كـشف الظنون، ج١/١٤٢" وت.ج.ديبور: م.س، ص٣٧.

(٣) إبــن النــديم: م.س، ص٤١٤ " القفطــي: م.س، ص١٧٧" إبــن أبــي أصــيبعة: م.س، ج١/ ص٢٧٦" زهير حميدان: م.س، مج١/ ص٢٩٢.

وەرگێڕکاریەوە لە پاش حنین و إسحاقەوە دێت، پیشەی پزیشکیی لە حنینـەوە فێـر بووە، لە ڕووی قسەکردن و هەڵسوکەوت و وەرگێڕانەوە ڕێگای حنینی گرتووە[1])).

شـایەنی باسـە ئـەم کەسـایەتییە هـەر بـە تـەنها وەرگێـڕ نـەبووە، بـەڵکو وەك پزیـشکێکی دیـاریش دەرکـەوتووە و ئەمـەش بووەتـە هـۆی ئـەوەی کـە پـشتگیریی وەرگێڕکار بکات بۆ ئەوەی کە کاری وەرگێڕانی بۆ بکات لە بواری پیشەکەی خۆیدا، لەم بارەیەوە (البیهقـي) دەڵێـت: ((حبـیش لـە پزیـشکە پێـشکەوتووەکان بـووە کـە چـەندین دانـراوی زۆری هـەبووە لـە بـواری پزیـشکییدا و لێهـاتووش بـووە لـە چارەسەرکردندا[2])).

بەهەرحاڵ، ئـەم کەسـایەتییە چـەندین کـاری گرنگـی وەرگێڕانـی ئـەنجام داوە، بەتایبـەتی لـە بـواری پیـشەکەی خۆیـدا کـە پزیـشکیی بـووە، بـەڵام هـەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن کە زۆرینەی ئەم بەرهەمانەی دراونەتە پاڵ (حنین) و بەناوی ئەوەوە تۆمار کراون، هەروەك (إبن الندیم) دەڵێت: ((لـە بـەختی حـنین بـن إسحاق ئەوەیە کە ئەو کارانەی کە لەلایەن حبـیش بـن الحـسن الأعـسم و عیـسی بـن یحیی ئەنجامی داون دراونەتە پاڵ حنین[3])). ئەمـەش لەبـەر چـەند هۆکارێـك بـووە، لەوانـەش نزیکیـی هـەردوو نـاوی (حـنین) و (حبـیش) لـە یەکترییـەوە و هـەروەها بەناوبانگ بوونی (حنین)، وای لە نووسەرەکان (کاتب)ەکانی (بیـت الحکمـة) کردبـوو کە لە کاتی نووسینەوەی بابەتە وەرگێڕدراوەکاندا بیدەنە پاڵ (حنین)[4].

بەم جۆرەش دیارترین ئەو بابەتانەی کە بە ناوی ئەم وەرگێـڕەوە تۆمـار کـراون بریتین لە:

کتاب النبض الکبیر، کتاب تـدبیر الأصـحاء، کتـاب حیلـة الـبرء، کتـاب التـشریح الکبیر، کتاب إختلان التشریح، کتاب تشریح الحیـوان المیـت، کتـاب تـشریح الحیـوان

(١) عیون الأنباء في تاریخ طبقات الأطباء، ج١/ ص٢٧٩.

(٢) تتمة صوان الحکمة، ص١٧.

(٣) الفهرست، ص٤٠٣.

(٤) الجمیلي: م.س، ص٣٠٧.

الحي، كتاب تشريح الرحم، كتاب علم أبقراط بالتشريح، علم أرسطوطاليس في التشريح، كتاب تركيب الأدوية، كتاب الحث على تعليم الطب، كتاب تقدمة المعرفة، ناسراو بة أفوريزما لأبقراط... هتد، ئەمانە و چەندین کتێبی تر(1).

دیارە هەریەك لەم وەرگێڕکارانە بە یەك شێواز و بە هاوواتایی کاری وەرگێڕانیان نەکردووە، بەڵکو جیاوازیی لە نێوانیاندا هەبووە لە ڕووی مانا دەربڕین و شێوازی نووسینەوە و داڕشتنەوەی دەقەکاندا، ئەمەش وای کردووە جیاوازیی هەبێت لە نێوان ئەو وەرگێڕکارانەدا، دیارترین ئەو شێوازانەش:

**١- شێوازی وەرگێڕانی حەرفیی:**

ئەم شێوازە زیاتر وەرگێڕە سەرەتاییەکان پێوەی خەریك بوون، کە بریتییە لە وەرگێڕانی وشە بە وشەی بابەتەکان، ئەمەش دیارە خراپیی زۆری هەیە لەسەر پڕۆسەی وەرگێڕان، چونکە لە لایەك بابەتەکە ماناکەی خۆی لەدەست دەدات، لەلایەکی دیکەیشەوە زۆر وشەی نەناسراوی زمانی یۆنانیی، یان سریانیی کە واتای نەبووە لە زمانی عەرەبییدا وەك خۆی دەنووسرایەوە، بەتایبەتی لە بوارەکانی فەلسەفە و مۆسیقا و پزیشکییدا، کە ئەم زانستانە بە زمانی عەرەبیی نوێ بوون، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە وشەی نوێ تێکەڵ بە شارستانیەتی ئیسلامیی بوو، کە سەرلەنوێ کێشەی تێگەیشتنی لەو زاراوانە دروست کردەوە و بابەتەکەی گرانتر کردبوو، لەو وەرگێڕکارانەی بەم شێوازە کاری وەرگێڕانیان دەکرد، (یوحنا بن بطريق و یوحنا بن ماسوية و عبدالمسيح بن ناعم الحمصي) بوون (2).

بۆیە ڕەنگە بابەتێکی وا بووبێت کە پاڵی بە (جاحظ)ەوە نابێت وەك ڕووناکبیرێکی دیاری سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان کە متمانەی بە

---

(١) إبن جلجل: م.س، ص٦٠ " القفطي: م.س، ص١٢٩ – ١٣٢" أحمد عبدالباقي: معالم حضارة،ص٢٨٢.

(٢) د. أميرة حلمي مطر: الفكر الاسلامي و التراث اليوناني، ص١٧ – ١٨"جورج حداد:مدخل الى تاريخ الحضارة، ص٤١٩ " د.عمر الفروخ:تاريخ الفكر العربي، ص١٩٩" د.محمد عبدالرحمن برج: م.س، مج١، ص٣١٥.

وەرگێڕانەکانی سەردەمی خۆی نەبووبێت و بە وەرگێڕانی نائەمین و بێمانا لە قەڵەمی دابێتن، هەروەها کۆمەڵە مەرجێکی داناوە بۆ ئەوەی کە وەرگێڕکاران لە سەری بڕۆن تا وەرگێڕانەکانیان مانادار بێت، لەوانەش پێیوایە کە پێویستە وەرگێڕ لە ڕووی ئاستی زانستییەوە هاوواتای ئاستی نووسەرەکە بێت کە بابەتەکەی وەردەگێڕێت، زانیاریی تەواوی سەبارەت بەو بابەتە هەبێت کە وەریدەگێڕێت، هەروەها شارەزایی تەواوی هەبێت لە هەردوو ئەو زمانەی کە لێوەی و بۆی وەردەگێڕا[1].

شایەنی باسە کە هەر ئەم شێوازەی وەرگێڕان بوو کە زۆرێك لە هەڵەی وەرگێڕانی خستە ناو شارستانیەتی ئیسلامییەوە، بەڵام پاش دروستبوونی (بیت الحكمة) کە پێدەچێت (جاحظ) لە پێش ئەم ماوەیەوە کتێبەکەی نووسیبێت، ڕاستکرانەوە و زۆرێکیان سەرلەنوێ وەرگێڕانیان بۆ کرایەوە.

**٢- شێوازی مانایی بۆ وەرگێڕان:**

مەبەست لەم شێوازە ئەوەیە کە کەسی وەرگێڕ بابەتەکە بەتەواوەتی دەخوێنێتەوە و لە واتاکەی تێدەگات و ئەوجا لە زمانەکەی دیکە بە هەمان واتا ئەو بابەتە دادەڕێژێتەوە، ئەمەش یەکێکە لە باشترین شێوازەکانی وەرگێڕان، چونکە لەم شێوازەدا سەرباری ئەوەی کە وەرگێڕ بابەتەکە وەك خۆی و بە مانادارییی دادەڕێژێتەوە، بۆخۆیشی لەناویدا قوڵ دەبێتەوە و لە بابەتەکە تێدەگات، بەم جۆرەش جیاوازیی سەرەکیی لە نێوان ئەم شێوازە و شێوازی پێشوودا ئەوەیە کە لەم شێوازەدا ڕستەیەك بەسەر یەکەوە واتا دەکرێت و دەنووسرێتەوە، نەك وشەیەك.

---

(١) الحيوان، تح. عبدالسلام محمد هارون، دار الجيل، بيروت، ١٤١٦هـ - ١٩٩٦م، ج١/ ص٧٦ - ٧٧.

له دیارترین پێڕەوکارانی ئەم شێوازەش (حنين بن إسحاق العبادي و الكندي و قسطا بن لوقا) بوون [1].

بەهەرحاڵ، لە کۆتایی ئەم باسەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئەم وەرگێڕکارانە سەرباری ئەوەی کە کاری وەرگێڕانیان کردووە، ڕۆڵێکی زۆر گەورەشیان هەبووە لە برەودان و بەرەوپێشبردن و بڵاوکردنەوە و کاریگەریی بوونی شارستانیەتی یۆنانیی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، ئەمەش چ لە ڕێگای وتنەوەی وانەکانیانەوە بێت لە کۆڕ و مەجلیسە زانستییەکانی تایبەت بە خۆیان، یان لە ڕێگای پێڕەوکردنی ئەو زانستانەوە بێت لە ناو شارستانیەتی ئیسلامیی و هەروەها دانانی کتێب بێت بەو زانستانەی کە لە وەرگێڕانەکانەوە دەستیان کەوتووە، یاخود بە بڵاوبوونەوەی ڕاستەخۆی وەرگێڕانەکانیانەوە بێت، بۆیە پێمانوایە کە ئەمانە یەکێك بوون لە کۆڵەکەکانی گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانیی بۆ شارستانیەتی ئیسلامیی و دەکرێت بە باڵیۆزانی گواستنەوەی شارستانیەتی یۆنانییان دابنێین لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا، کە کارەکانیان لە سەردەمەکانی دواتری عەبباسییەکاندا بە تەواوەتی ڕەنگیدایەوە و لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا بەهۆیەوە و لە ڕێگای ئەو زانستە بەدەستهاتووانەی شارستانیەتی یۆنانیی و پاش داهێنانکاری کردن تیایاندا لەلایەن زانا مسوڵمانەکانەوە، ڕابوونی شارستانیەتی ئیسلامیی پێکرا.

---

(١) الجميلي: م.س، ص٤٠ – ٤٨ " د.عمر الفروخ: م.س، ص٢٠٠ " د.محمد الصادق عفيفي: م.س، ص٤١ – ٤٢.

## بەشی چوارەم : ڕەنگدانەوەی زانستە وەرگێراوەکان لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا :

### باسی یەکەم : زانستە پەتییەکان :

یەکەم : پزیشکیی :

دووەم : زانستەکانی بیرکاریی :

ئەندازیاریی :

زانستی سێگۆشەکاریی :

سێیەم : گەردووناسیی :

چوارەم : فیزیک ( فیزیا ) :

پێنجەم : زانستی میکانیک ( علم الحیل ) :

شەشەم : زانستی زیندەوەرزانی ( ئاژەڵ – ڕووەك ) :

### باسی دووەم : زانستە مرۆڤایەتییەکان :

یەکەم : فەلسەفە :

دووەم : جوگرافیا :

سێیەم : مۆسیقا :

## باسی یەکەم: زانستە پەتییەکان:

سەردەمی عەبباسی یەکەم بە سەردەمی ئاوێتەبوون و تێکەڵبوونی شارستانیەتی یۆنانیی بە شارستانیەتی ئیسلامیی دادەنرێت، لەم سەردەمەدا هەروەك لە بەشەکانی پێشوو لێی دواین زیاتر سەردەمی وەرگرتنی ئەو شارستانییەتە بووە و لە سەردەمەکانی دیکەی پاش ئەم سەدەیە ڕەنگدانەوەی ئەو زانستانە دەردەکەوێت، بەڵام سەرباری ئەوەش چەند ڕەنگدانەوەیەك بەدی دەکرێت، کە بە بنەمای ڕەنگدانەوەی تەواوی ئەم زانستانە دادەنرێت لە سەردەمەکانی پاشتردا، بۆیە لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەین بە پوختیی لەو زانستانە و ڕەنگدانەوەیان بدوێین کە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا کاریگەرییان هەبووە، دیارترین ئەو زانستانەش بریتین لە:

**یەکەم: پزیشکیی:**

لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور ١٣٦ – ١٥٨ك / ٧٥٣ – ٧٧٤ز)دا، کاتێك کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا تووشی نەخۆشییەك دەبێت لە (گەدە)یدا، پاش ئەوەی پزیشکەکانی بەردەستی ناتوانن چارەسەری بکەن، دەنێرێت بە شوێن سەرۆکی خوێندنگای پزیشکیی لە (جندیسابور)، کە ناوی (جورجیوس بن بختیشوع) دەبێت، ئەم پزیشکە چارەسەری دەکات.

بۆیە لێرەوە ڕۆڵی بنەماڵەی (آل بختیشوع) لە بواری پزیشکییدا لە سەردەمی عەبباسی یەکەم و سەردەمەکانی پاشتریشدا بە ڕوونی دەردەکەوێت وەك کارەکتەرێکی گرنگی ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانیی لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا، لێرەوە خەلیفە داوای لە (جورجیوس) کرد کە کتێبی لە بواری پزیشکییدا بۆ وەربگێڕێت و ئەویش پاش وەرگێڕانی چەند کتێبێك و چەند کارێکی دیکەی بواری پزیشکیی لە ساڵی (١٥٢ك / ٧٦٩ز) بەغدادی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ (جندیسابور) و (عیسی بن شهلا)ی کە خوێندکاری خۆی بوو لە جێی خۆی، لە دەرباری خەلافەتدا دانا، هەروەها لە سەردەمی خەلیفە (المهدي ١٥٨ – ١٦٩ ك /

٧٦٩ — ٧٨٥ز)، ناردی بە شوێن (البختیشوع) لە (جندیسابور) و پاش ئەمیش (جبرائیل بن بختیشوع) شوێنی گرتەوە و لە کارکردن بەردەوام بوو تا لە ساڵی (٢١٣ك / ٨٢٨ز) کۆچی دوایی دەکات، سەرباری کاری پزیشکیی کردن، (جبرائیل) کتێبێکی گرنگی لە بواری پزیشکییدا بە ناوی (روضة الطبية) داناوە[١]، هەروەك لە بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەمان باسمان لە ڕۆڵی ئەم بنەماڵەیە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا کرد.

هەروەها یەکێکی دیکە لە دیارترین پزیشکانی ئەم سەردەمە (یوحنا بن ماسویە)یە، ئەم کەسایەتییە سەرباری ئەوەی کە پزیشك بوو، هەروەك لە بەشی پێشوودا باسمان کرد، بۆخۆیشی وەرگێڕ بووە، ئەمەش کاریگەری گەورەی شارستانیەتی یۆنانیی لەسەر بووە و بە یەکێکی دیکە لە ڕەنگدانەوەکانی ئەم شارستانییەتە دادەنرێت، هەروەك چۆن بزووتنەوەی وەرگێڕان ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە گواستنەوە و ڕەنگدانەوەی لایەنی پزیشکیی شارستانیەتی یۆنانیی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا[٢]، ئەمەش پاش دامەزراندنی (بیت الحکمە) زیاتر ڕەنگیدایەوە و بەتایبەتیش کاتێك کە کەسایەتییەکی وەك (حنین بن اسحاق العبادی) بوو بە بەرپرسی وەرگێڕان لەم ناوەندەدا، چونکە ئەم کەسایەتییە زۆرینەی هەوڵەکانی بەردەوام بە لای وەرگێڕانی بابەتی پزیشکیدا بووە، کە زۆرینەی کتێبە بەردەستکەوتووەکانی (أبقراط و جالینوس)ی وەرگێڕاوە، بەم جۆرە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی (حنین) و بەردەستەکانی لە بواری پزیشکییدا زیاتر بوو لە (٣٦) کتێب.

---

(١) إبن جلجل: طبقات الأطباء، ص٦٤ " إبن صاعد الأندلسي: طبقات الأمم، ص٣٦ " إبن العبري: مختصر تاريخ الدول، ص٢١٥" إبن النديم: الفهرست، ص٢٩٦" القفطي: تاريخ الحكماء، ص١٠٠" د.أحمد فؤاد باشا: م.س، ص١٦٧ " د.محمد الصادق عفيفي: تطور لفكر العلمي عند المسلمين، ص١٧٥ — ١٧٦ " د.محمد حسين محاسنة: م.س، ص٢٠٨.

(٢) إبن جلجل: م.س،ل ٦٥ — ٦٦ " حكمت نجيب عبدالرحمن: م.س، ص ٤٢.

دیـارترین ڕەنگدانـەوەی ئـەم کتێبانـە لـەوەوە دەردەکـەوێت کـە بـوو بوونـە پرۆگرامی خوێندن بۆ ئەوانەی کە بیانویستایە لەبارەی بواری پزیشکییەوە بخـوێنن، کە بریتی بوو لە (١٦) کتێبی (جالینوس)، پاش ئەوەی ئەم کتێبانەی تەواو دەکـرد، چەند کتێبێکی دیکەیان پێی دەدا کە ئەنجام ژمـارەی ئـەو کتێبانـەی کـە دەیخوێنـد دەبووە نزیکەی (٥٠) کتێب، لە کتێبەکانی (أبقـراط و جـالینوس و ئـەو لێکدانـەوە و شیکارانەی بۆ ئەو کتێبانـە دەکـران) کـە زۆرینـەی لقـە پزیـشکییە زانراوەکـانی ئـەو سەردەمەی دەگرتەوە[1].

لێرەوە لە ئەنجامی ئـەم ڕەنگدانەوەیـەوە ژمارەیـەکی زۆری پزیـشکی کارامـەی خاوەن زانیاریی بە زانـستی پزیـشکیی شارسـتانیەتی یۆنـانیی، دەرکـەوتن، چـونکە مسوڵمانان لە سەرەتای ئیسلامدا هیچیان لەبارەی زانـستی پزیـشکییەوە نـەدەزانی، (إبن صاعد) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((عەرەب لە سەرەتای ئیسلامەوە جگە لـە زمـانی خۆیان و بنەماکانی ئایینەکەیان هیچیان نەدەزانی، ئەوە لـە بـواری پزیـشکییدا هـەر هیچ، کە لەلای چەند تاکێکی کەم هەبوو[2])).

بەهەرحاڵ، ڕەنگدانـەوەی زانـستی پزیـشکیی لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا لـە پاشدا چەند دیاردەیەکی تایبەتی بەخۆیەوە بینی، لەوانەش:

١- دەرکەوتنی بابەتی خۆپارێزیی پزیشکیی، ئەمـەش یەکـەم بـۆ لـەش سـاغ، پاشان بۆ نەخۆش، کـە مەبەسـت پێـی پارێزگـارییکردن بـوو لـە لاشـەی مـرۆڤ، ئـەم بابەتـە سـەرباری ئـەوەی کـە زانیارییـە (یۆنانییـەکان) وەك خۆیـان مانـەوە، بـەڵام لەلایەن پزیشکانی مسوڵمانیشەوە چەند زیادەیەکیان خستەسەری و داهێنانکارییـان

(١) إبن النديم: الفهرست، ص٤١٧ - ٤١٩" كمال السامرائي: مختصر تاريخ الطب العربي، دار الحرية، بغداد، ١٩٨٥م،ج١/ص٣٧٨ - ٣٧٩" د.ماكس مايرهوف: العلم والطب، دراسة في كتاب تراث الاسلام، بإشراف السر توماس آرنولد، تر.جرجيس فتح الله، المطبعة العصرية، الموصل، ١٩٥٤م، ج١/ص١٧٥ - ١٧٦.

(٢) طبقات الأمم، ص١٧٤.

تيادا كرد[1]، بۆيه به پشت بەستن بەو زانيارييه پزيشكييانه، چەند كتێبێك به زمانى عەرەبى دانران، لەوانەش:

(يوحنا بن ماسويه) كتێبى (في تـدبير الأصـحاء) و (كتـاب تفسير كتـاب حفـظ و الصحة لروفس الأفس) و (رسالة في تدبير الأصحاء بالمطعم والمشرب، مقالـة في حفـظ الأسنان واللثة[2])، داناوه، (بختيشوع بن جبرائيل) كتێبى (رسالة في تدبير البدن[3])ى داناوه، (الكندي) كتێبـى (رسـالة في تـدبير الأصـحاء[4])ى دانـاوه، (قـسطا بـن لوقـا) كتێبى (رسالة في حفـظ الـصحة وإزالـة الأعـراض) و (رسـالة في تـدبير أبـدان في الـسفر للسلامة من المرض و الخطر) و (كتاب في تدبير الأبـدان في سـفر الحـج[5])، (حـنين بـن إسحاق) (كتاب تفسير كتاب حفظ الصحة لروفس الأفـسي، رسـالة في تـدبير الأصـحاء بالمطعم و المشرب، مقالة في حفظ الأسنان و اللثة[6]).

٢- يەكێكى ديكه له دياردەكانى ڕەنگدانەوەى شارستانيەتى يۆنـانيى، بريتييـه له بابەتى دەرمانكردن و سوودوەرگرتن له بابـەتى دەرمـانكردن بـۆ چارەسـەركردنى نەخۆشـەكان، كـه بـه (عقـاقير الطبيـة) ناسـراوه، ئـەم بابەتـه سـەرەتا لـه ڕێگـاى ڕووەكەوه بوو، ئەمەش كاتێك فراوان بوو كه كتێبەكەى (ديسقورديوس)يان له بارەى (الحشائش)ەوه دەستكەوت، ئيتر له پاش ئەمەوه زانيارييەكانيان له بابەتى دەرمان دروستكردندا گەشەى كرد و كـه بابـەتى ئـاژەڵى و كانزايـشى گرتـەوه و لـه پيـشەى دەرمانـسازييدا بـەكاريان دەهێنـا، ديـاره لـەم سـەردەمەدا ئـەم بابەتـه بـه جۆرێـك

(١) المـسعودي: مـروج الـذهب و معـادن الجـوهر، ج٤/ص٨٠ " كمـال الـسامرائي: م.س، ج١، ص٣٧٥.
(٢) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٣٠٨.
(٣) كمال السامرائي: م.س، ج١/ص٤٢٧.
(٤) كمال السامرائي: م.ن،ج١/ص٣٩٣.
(٥) إبن النديم: م.س،ص٣٧٥" القفطي: م.س، ص٢٩١.
(٦) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج٢/ص٢٧٣.

پێشکەوت کە هەر ئەم هەوڵانە بوو کە لە دواجاردا بوونە بنەمایەك و لێیەوە زانستی (الصیدلة) لە سەردەمەکانی دواتردا دامەزرا.

لێرەوە چەند زاراوەیەك داهات، بۆ نموونە بە دەرمانە بنەچەییەکانیان دەگوت (الأدویة المنفردة) و بەدەرمانی کۆکراوە، واتە ئەگەر چەند دەرمانێکیان پێکەوە کۆبکردایەتەوە، پێیان دەگوت (الأقربـاذین)[1]، لێرەوە بە سوودوەرگرتن لە شارستانیەتی یۆنانیی چەند دانراوێکیان لە بواری دەرمانسازیی دا، دانا، لە دیارترینی ئەوانەش:

(یوحنا بن ماسویه) لە بواری تێکەڵکردنی دەرماندا کتێبێکی بەناونیشانی (الأدوية المسهلة و إصلاحها وخاصية كل دواء منها[2])، هەروەها چەندین بابەتی دیکە وەك (الكندي) کە چەندین بابەت (رسائل)ی لەم بوارەدا هەیە، وەك: (رسالة الأدوية الممتحنة، وكتاب الأقرباذين، وكتاب جوامع الأدوية لجالينوس، رسالة في كيفية اسهال الأدوية وإنجذاب الأخلاط[3])، (یوحنا بن بختیشوع)یش چەند دانراوێکی لەم بوارەدا هەیە، وەك: (كتاب تقويم الأدوية فيما أشتهر من الأعشاب، العقاقير و الأغذية[4]) و (حنين بن اسحاق) ئەم دانراوانەی هەیە: (إختصار كتاب جالينوس في الأدوية المنفردة، كتاب أسماء الأدوية المنفردة على حروف المعجم، كتاب في أسرار الأدوية المركبة، كتاب تفسير الأدوية المكونة لجالينوس، كتاب أقرباذين، كتاب تركيب الأدوية حسب مواضيع الألمة، كتاب إختبار الأدوية المحرقة[5])، هەروەها (علي بن ربَن

(١) إبن أبي أصيبعة: م.ن، ج١/ص٤١٤" د.أحمد فؤاد باشا: م.س،ل ١٦٦" د.محمد حسين محاسنة: م.س، ص٢٠٩.

(٢) إبن أبي أصيبعة: م.ن، ج١/ص٢٥٥.

(٣) إبن النديم: م.س، ص٣٧٥ " القفطي: م.س، ص٣٧٢.

(٤) كمال السامرائي: م.س، ج١، ص٣٩٧.

(٥) إبن النديم: م.س، ص٤٢٤" القفطي: م.س، ص١٧٤" إبن أبي أصيبعة: م.س، ص٢٧٢، ٢٧٣ " كمال السامرائي: م.س، ج١، ص٣٩٧.

الطبري[*]) چەند کتێبێکی لەم بارەیەوە داناوە، ئـەوانیش (منـافع الأدویـة والأطعمـة و العقاقیر، الأدویة المنفردة و العقـاقیر[1])، هـەروەها (قـسطا بـن لوقـا) ئـەم کتێبانـەی داناوە: (رسالة في الأدویة المسهلة و العـلاج بالأسـهال، رسـالة في ذکـر إصـلاح الأدویـة المسهلة ونفي ضررها ومقدار الشربة منها وجزوب استعمالها[2])، و(اسـحاق بـن حـنین) ئەمانەی هەیە (کتاب الأدویـة المنفـردة، کتـاب الأدویـة الموجـودة بکـل مکـان، کتـاب إصـلاح الأدویـة المـسهلة[3]) ئەمانـە و چـەندین بەرهـەمی دیکـەیش کـە لـەم بـوارەدا ناکەونە بابەتی سەردەمی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە.

٣- یەکێکی دیکە لە بوارەکانی ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی بریتییـە لـە بابـەتی گرنگیدان بە لایـەنی خـۆراکیی نـەخۆش، کـە لایەنـەکانی وەك پاقلـەوات و گۆشـت و میوە و شیرەمەنی دەگرتەوە، کە بە (خواص الأغذیة) ناسرابوون[4].

لەم بوارەشدا پشتی بەست بە بابەتە وەرگێڕاوەکان، زانایانی ناو شارسـتانیەتی ئیسلامیی چەند کتێبێکیان دانا لەوانەش:

---

[*] أبو حسن علي بن سهل ربَن الطبري لە شاری (مرو)ی سەر بە (طبرستان) لـە سـاڵی ١٥٣، یـان ١٦٤ك /٧٧٠ – ٧٨٠ز لە دایـك بـووە، لـە بنەماڵەیـەکی فارسـیی مەسـیحیی، لەسـەر دەسـتی خەلیفە (المعتصم) مسوڵمان دەبێت، نازناوی (ربَن)ی بە زمانی سریانیی بە واتـای (أسـتاذ) دێـت، هەیە، ئەم کەسایەتییە زمانەکانی (فارسی و سریانیی و عـەرەبیی) زۆر بـە باشـی زانیـوە، یـەکێك بووە لە پزیشکە بەناوبانگەکانی سەردەمی عەبباسی یەکەم و لەم بوارەشـدا ناوبـانگێکی گـەورەی دەرکردووە، کە سەرەتا لە خوێندنگای شاری (الري) پیشەکەی خـۆی مومارەسـە کـردووە و پاشـان چووەتە شاری (سر من رأی – سامەڕا) و لەوێ نیشتەجێ بووە، (کاتبی) هەرسێ خەلیفە (المعتصم و الواثق و المتوکل) بـووە. حلیمـة الغـراري: بنـاة الفکـر العلمـي في الحـضارة الاسـلامیة، الربـاط، ٢٠٠١م، ص٩-١١.

(١) أبو الحسن علي بن سهل الطبري بن ربَّن: فردوس الحکمة، تح.محمد زبیر الصدیقي، برلین مطبعة آفتاب، ١٩٢٨م، ص٣٦٩ – ٤٠٤.

(٢) کمال السامرائي: م.س، ج١، ص٤٨٣.

(٣) القفطي: م.س، ص٨٠" إبن أبي أصیبعة: م.س، ج١/ص٢٧٥.

(٤) د.أحمد فؤاد باشا: م.س،ص١٦٧" کمال السامرائي: م.س، ج١/ص٤٢٢.

(يوحنا بن ماسويه) چەند بابەتێكی هەیە، وەك: (في خواص الأغذية و البقول والفواكه و اللحوم و الألبان و أعضاء الحيوان و الأفاوية، وكتاب دفع ضرر الأغذية، كتاب إصلاح الأغذية[1]) و (جبرائيل بن بختيشوع) ئەم بابەتانەی هەیە: (رسالة في الطعام والشراب ومنافع كل واحد منهما و مضاره في حالتي الصحة و المرض)، كە بۆ خەلیفە (المأمون ١٩٨–٢١٨ك / ٨١٣ – ٨٣٣ز[2]) و (حنين بن إسحاق) ژمارەیەكی زۆری كتێبی لەم بارەیەوە وەرگێڕاوە و داناوە وەك: (كتاب في طبائع الأغذية و تدبير الأبدان، مقالة في ماء البقول، كتاب في قوى الأغذية، كتاب في اللبن، الفواكه ومنافعها، كتاب إصلاح الجبن ومنافعه وما يستعمله منه، شرح كتاب الغذاء لأبقراط[3])، هەروەها (الكندي) چەند بابەتێك (رسائل)ێكی هەیە لەم بوارەدا، وەك: (رسالة في الغذاء و الدواء المهلك، رسالة في تدبير الأطعمة[4])، و (قسطا بن لوقا) ئەمانەی هەیە: (رسالة في الأغذية عن طريق القوانين الكلية، كتاب قوانين الأغذية[5])، و (علي بن ربَن الطبري) ئەم بابەتانەی هەیە (في تركيب الأغذية، كتاب فردوس الحكمة في الطب، في قوى الأغذية وقوامها، قوى الأشربة والعصارات و المربيات و الخل و الكوامخ، وفي قوى السمك و في قوى الحلاوات و الألبان و الأبازير[6]).

٤– سەرباری لایەنی جەستەیی، لەم سەردەمەدا و لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانییەوە، بابەتی گرنگیدان بە لایەنی دەروونیی كە لەم بوارەشدا چەندین بابەتیان دانا[7]، لەوانەش (يوحنا بن ماسويه) كتێبێكی بە ناونیشانی

(١) إبن النديم: م.س، ص٤٢٥" إبن صاعد: م.س، ص٣٦" كمال السامرائي: م.س، ج١/ص٤٢٢.

(٢) كمال السامرائي: م.س، ج١/ص٣٩١.

(٣) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٧٣،٢٧٢" كمال السامرائي: م.س، ج١/ص٤٤٢.

(٤) إبن ابي أصيبعة: م.ن،ج١/ ص٢٩١.

(٥) إبن النديم: م.س، ص٤٢٥" القفطي: م.س، ص٢٦٣" إبن أبي أصيبعة: م.س،ج١/ ص٣٣٠.

(٦) علي بن ربَن: م.س، ص١١٤، ١٢٠، ٣٧٤، ٣٩٨.

(٧) الجميلي: حركة الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنين الثالث والرابع للهجرة، ص٣٥٥، ٣٥٦.

(المانيخوليا أسبابها و علاماتها و علاجها[1]) داناوە، هەروەها (حنين بن إسحاق) چەند بابەتێکی داناوە، لەوانەش (کتاب تفسير جالينوس لکتاب طبيعة الإنسان لأبقراط[2]) و (الکندي) بابەتێکی بە ناونيشانی (رسالة في الحياة لدفع الأحزان، رسالة الی يوحنا بن ماسويه في النفس وأفعالها[3]).

٥- یەکێکی دیکە لە دیارترین بابەتەکانی پێشکەوتنی بواری پزیشکیی، کردنەوەی بیمارستان (نەخۆشخانە) بوو، ئەم بیمارستانانە سەرباری ئەوەی کە ناوەندی چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بوون، گرنگییەکەی لەوەدا دەردەکەوێت، کە ناوەندی گرنگی فێربوونی پزیشکیی و بابەتی پزیشکیی و تاوتوێکردنی بابەتە پزیشکییەکان و زانستەکانی بوو[4]، تا کۆتایی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکان دوو بیمارستان لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا هەبوو، ئەوانیش یەکەمیان ئەوە بوو کە لە سەردەمی خەلیفە (وليد بن عبدالملك)ی ئومەوییەکاندا دروست کرا، وەك لە پێشەوە لێی دواین، دووەمیشیان لە سەردەمی عەبباسی یەکەم و لەلایەن خەلیفە (هارون الرشيد ١٧٠ - ١٩٣ك / ٧٨٦ - ٨٠٨ز) بە پێشنیازی (جبرائيل بن بختيشوع) دروستکرا، ئەوەبوو خەلیفە (ماسويه الخوزي) باوکی (يوحنا بن ماسويه)ی کردە لێپرسراوی ئەم بیمارستانە لە بەغداد، هەروەها کتێبخانەیەکیشی بۆ دامەزراند کە پاڵپشتی کارەکانی ئەم بیمارستانە بوو، هەرچەندە هەندێك سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە (البرامکة)کان لە بەغداد دایانمەزراندووە و (إبن الدهني)یان کردۆتە پزیشکی تایبەتی ئەو بیمارستانە[5]، شایەنی باسە کە لە

---

(١) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٥٥.

(٢) م.ن،ج١/ ص٢٧٣.

(٣) م.ن،ج١/ ص٢٩١، ٢٩٢.

(٤) حکمت نجيب عبدالرحمن: م.س، ص٧٢ " محمد حسين محاسنة: م.س، ص١٦٥" محمد الصادق عفيفي: م.س، ص١٨٤.

(٥) أحمد عيسى بك: م.س، ص١٧٨.

سەردەمەکانی دیکەی پاش عەبباسیی یەکەم، چەند (بیمارستان)ێکی دیکە دروستکرا، کە زیاتر ڕەنگدانەوەی ئەم بابەتە بوون.

بەمجۆرەش دەبینین کە لایەنی پزیشکیی لە سەردەمی عەبباسی یەکەم بە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی چەندین ڕەنگدانەوەی گرنگی دەرکەوتن و بەهۆیەوە داهێنانکاریی لەم بوارەدا کراوە و ئەمەش بووە بنەمایەك کە بەهۆیەوە شارستانیەتی ئیسلامیی دواتر لە بواری پزیشکییدا ڕەنگدانەوەی گەورەی بە خۆیەوە بینی.

**دووەم: زانستەکانی بیرکاریی:**

زانستەکانی بیرکاریی بە یەکێکی دیکە لە گرنگترین ئەو زانستانە دادەنرێن، کە بەشێکی گرنگیان لە شارستانیەتی یۆنانییەوە وەرگرتووە، لە شارستانیەتی ئیسلامییدا ڕەنگدانەوەی زانستەکانی بیرکاریی چوار بەشی سەرەکیی دەگرێتەوە، کە ئەوانیش (علم الحساب، علم الجبر والمقابلة، هندسة، المثلثات)، هەرچی یەکەم و دووەمە زیاتر ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی (هندی)یە لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی و لێیەوە زۆرینەی شێوازی داڕشتنەوەی ژمارەکان بوو، هەروەها هەر لە زانستی (علم الحساب)ەوە، (علم الجبر و المقابلة) لەلایەن (محمد بن موسى الخوارزمي [*])یەوە

[*] أبو عبدالله محمد بن موسى الخوارزمي لە (خوارزم) لە دایك بووە، ئەم کەسایەتییە شارەزاییەکی گەورەی دەبێت لە بواری گەردووناسیی و بیرکاریی دا، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە خەلیفە (المأمون) نزیك ببێتەوە و خەلیفەش دەیکاتە لێپرساوی گەنجینەی (بیت الحكمة)، ئەمیش یەکەم کاریْ کە لەم بوارەدا دەیکات بریتی دەبێت لە کورت کردنەوەی کتێبی (السند هند)، بەڵام سەرباری زۆرینەی بەرهەمەکانی دیکەی (الخوارزمي) بە کتێبی (الجبر و المقابلة) ناوبانگ دەردەکات کە بە سوودوەرگرتن لە زانستی ژمارەی هندییەکانەوە ئەم بابەتەی نووسیوە، بەمەش دەبێتە دامەزرێنەری (الجبر) لە بیرکارییدا، لە ساڵی (٢٣٢ك)، کۆچی دوایی کردووە. القسطنطيني الرومي الحنفي: هدية العارفين أسماء المؤلفين و آثار المصنفين، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٣هـ/١٩٩٢م، ج٦/ص٩.

دامەزرا[1] كە بە گرنگترین بابەتی پێشكەوتنی بیركاریی دادەنرێت لـە شارسـتانیەتی ئیسلامییدا.

بەهەرحاڵ، لێرەدا ئێمە تەنها مەبەستمانە باس لە ڕەنگدانـەوەی ئـەو بەشـانەی زانستەكانی بیركاریی بكەین لە شارستانیەتی ئیسلامیی كە كاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی بەسەرەوەیە، ئەوانیش:

١– ئەندازیاریی (الهندسة):

لە گرنگترین ئەو زانستانە دادەنرێت كە لـە ئـەنجامی كاریگـەریی شارسـتانیەتی یۆنانییـەوە ڕەنگدانـەوەی دروسـت بـووە، دیـارترین ڕەنگدانـەوەی شارسـتانیەتی یۆنانیی لەم بوارەدا لەم شێوازانەی خوارەوە دەردەكەوێت:

أ– وەرگێڕانی كتێبی (الأصول)ی (ئەقلیدس):

هەروەك لە بەشی سێیەمی ئەم لێكۆڵینەوەیەدا ئاماژەمان پێی كرد، ئـەم كتێبـە چەند جارێك وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی كە سەرەتا لەلایەن وەرگێڕ (حجاج بن یوسف بن المگر)، كە یەكەم جار لە سەردمی خەلیفە (هارون الرشید)دا بووە و بە (الهارونی) ناسـراوە و دووەمیـشیان لـە سـەردەمی خەلیفـە (المـأمون)دا بـووە و بـە (المأمونی) ناسراوە، لە پاش ئەمەوە، ئەم كتێبە چەندین جار وەرگێڕانی دیكـەی بـۆ كراوە و شیكار كراوە و لایەنەكانی باس كراوە، لەوانەش لەلایەن (إسـحاق بـن حـنین بن اسحاق) جارێكی دیكە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی[2].

وەرگێڕانــی ئــەم كتێبــە بــە گــرنگترین ڕەنگدانــەوەی بــواری ئەنــدازیاریی شارستانیەتی یۆنانیی دادەنرێت لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، كـە لێیـەوە سـەرباری وەرگرتنــی زانیارییــەكانی نــاوی، چـەندین زاراوەی ئەنـدازیاریی نـاو ئـەم كتێبـەیان دەرهێنا و شیكاریان كرد، لەوانەش وەك زاراوەكانی:

---

(١) برِوانة إسماعيل مظهر: تاريخ الفكر العربي، ص١٢٣ – ١٢٤" أنور الرفاعي: تاريخ العلـوم في الاسـلام، دار الفكـر، بـيروت، ١٩٨٣م، ص١٥٧" قـدري حـافظ طوقـان: تـراث العـرب العلمـي في الرياضيات و الفلك، مطبعة المقتطف، القاهرة، ١٩٤١م، ص٢٢، ٢٩، ٣٠.

(٢) إبن النديم: م.س، ص٣٨٥، ٣٨٦ " القفطي: م.س، ص٥٤، ٦٥.

(هێـڵ، قـەبارە، کۆتـایی هێـڵ)، ئەمانەشـیان دابـەش کردبـوو بـۆ (ڕاسـتەهێڵ و چەماوە و یەکسان و تەریب)، هەروەها بەم جـۆرە گۆشەکانیـشیان دابـەش کردبـوو، ئەمە سەرباری ئەوەی کە چـەند شـێوەیەکی ئەنـدازەیی ناسـران، لەوانـەش (شـەش پاڵو، قوچەك، لولەك و سێگۆشە و چوارگۆشە و بازنە و نیوەبازنە و تیرە و نیوەتیرە و.... هتد[1]).

ب- لە ئەنجامی کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانییەوە، چـەندین بابـەتی دیکـەی گـرنگ ڕەنگیدایـەوە کـە سـوودی گـەورەی هـەبوو لـە ژیـانی ڕۆژانـەدا، لەوانـەش: سەرخستنی ئاو بۆ بەرزاییـەکان، هـەروەها هەڵکەنـدنی بـیر و کـارێز و گواسـتنەوەی ئاوەکەی و هەڵکەندنی نۆکەند و دروستکردنی بەنداو، ئەمە سەرباری ئەوەی توانیـان بـە شـێوەیەکی ئەنـدازیاریی ئـاو بـۆ نـاو مزگـەوت و کۆشـکەکانیان ببـەن، هـەروەها چەندین نافورەی جوان دروست بکەن، ئەمە جگە لەوەی کـە ڕێـچکەی ئاوەکـەیان وا ڕێکدەخست کە بچێتەوە ناو ڕووباری دیجلەوە، لێرەوە چەند کەسێك پەیـدابوون کـە بـەم کارانـەوە تایبەتمەنـد بـوون، هـەروەها لـە بـواری ئەنـدازیاریی و دروسـتکردنی شارەکاندا لایەنی ئەنـدازیاریی چـەندین ڕەنگدانـەوەی گرنگـی بەخۆیـەوە بینـی، لـە دیارترین نموونەش لەم سەردەمە بنیاتنانی شاری سامەڕا (سر من رأى) بوو لەلایـەن خەلیفـە (المعتــصم ٢١٨ – ٢٢٧ك / ٨٣٣ – ٨٤١ز)ەوە، ئەمــەش لــە چــۆنیەتی دروسـتکردنی مزگـەوت و کۆشـکەکانی و ڕێکخـستنی شـەقامەکانی و خانووەکـانی و گۆڕەپانــەکانی پێــشبڕکێ و چــەندانی دیکــەیش کــە نموونــەی دیــاری ئــەو ڕەنگدانەوەیەن[2].

---

(١) لە بارەی ئەم زاراوانەوە بڕوانە: الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ص١١٨ – ١١٩" حـاجي خليفـة: كشف الظنون، ج١/ص٤٠٣" قدري حافظ طوقان: م.س، ص٤٧.

(٢) اليعقوبي: كتاب البلدان، ص٣١٤" أحمد سوسة: ري سامراء في عهد الخلافة العباسية، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٩م، ج٢/ص٣٣٥، ٣٣٦، ٣٣٧ " حكمت نجيب عبـدالرحمن: م.س، ص١٤٧، ١٥١، ١٥٢" صالح أحمد العلي: دراسـة العلـوم الرياضـية ومكانتهـا في الحـضارة الاسـلامية، مجلـة المورد، مج٣/العدد٤، ١٩٧٤م، ص٤٥، ٤٦.

**٢- زانستی سێگۆشەکاریی (علم المثلثات):**

ئەم زانستە بە یەکێك لە لقەکانی سەر بە زانستەکانی بیرکاریی دادەنرێت، کە داهێنانی ئەم زانستە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ناوەڕاستی سەدەی دووەمی پێش زاین، کە لەلایەن گەردووناسی یۆنانیی (أبراخس)ەوە لە ساڵی (١٦٠ پ.ز) دامەزراوە، ئەم کەسایەتییە کە مامۆستای (بطلیموس) بووە، بەتایبەت لێکۆڵینەوەی لەسەر سێگۆشە (المثلثات) کردووە، لە بۆچوونەکانی (أبراخس) لە بواری (المثلثات)دا ئەوە بوو کە پێی وابوو سێگۆشە لە هیچ شێوەیەکی دیکە ناچێت کە گۆشەکانی وەستاو بێت، چونکە ئەم یەك گۆشە لەسەر دوو گۆشە وەستاوە، ئەمەش وایکردووە کە سێگۆشە کردارێکی سەرەکیی بێت لە تیۆری هاوشێوەبووندا[1].

لە ئەنجامی گەیشتنی ئەم زانیارییانەشەوە بە زانایانی مسوڵمان، توانییان چەند داهێنانکارییەکی تیادا بکەن، لە دیارترینیان زانستی (المثلثات)یان کردە زانستێکی سەربەخۆ و چەندین لقی نوێیان لێوە داهێنا، لەوانەش: (المثلثات المستویة – المثلثات الکرویة) بەم جۆرەش لە بایەخدان بەم زانستە بەردەوام بوون تا لە کۆتایی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا گەیشتە ترۆپك[2].

**سێیەم: گەردووناسیی (علم الفلك – علم الهیئة):**

یەکێکی دیکە لە گرنگترین و دیارترین ئەو زانستانەی کە بە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی، ڕەنگدانەوەیەکی گەورەی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی هەبووە، زانستی گەردووناسیی بووە، لە بارەی ئەم زانستەوە (الخوارزمي) دەڵێت: ((زانستی ئەستێرەکان بە عەرەبی پێی دەگوترێت (التنجیم) و بە یۆنانیی پێی دەگوتێت (أصطرنومیا)، أصطر: بریتیە لە ئەستێرە و نومیا بریتییە لە زانست، کە

---

(١) إبن الندیم: م.س، ص٣٩٠" الفريد نورث وابتهيد: مقدمة للرياضيات، تر. محي الدين يوسف، المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٥٢م، ص١٦٣، ١٦٤، ١٦٨" حكمت نجيب عبدالرحمن: م.س، ص١٦٧، ١٦٨.

(٢) قدري حافظ طوقان: م.ن، ص٥١.

مەبەست پێی زانستی هەسارە گەڕۆکەکانی وەك زوحەل و مشتەری و مەریخ و خۆر و زوهرە و عەتارد و مانگ و.....هتد[1])).

ئەم زانستە لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا چەند ناوێکی هەبووە کە دەتوانین سەرجەمیان لە مرۆڤدا لە زاراوەی (علم الفلك) گەردووناسیی دا کۆبکەینەوە، ئەوانیش (علم النجوم، علم الهیئة، علم أحکام النجوم، علم صناعة النجوم، علم التنجیم، صناعة التنجیم).

هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێی کرد کە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی لەسەر بەشێکی زۆری ئەم زانستە هەبووە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، دیارترین ئەو ڕەنگدانەوانەش لە چەند شێوازێکدا دەردەکەوێت:

**١- وەرگێڕانی چەند کتێبێکی بواری گەردووناسیی (یۆنانیی) و ڕەنگدانەوەی ئەم کتێبانە لە سەرشارستانیەتی ئیسلامیی:**

سەرەتای گرنگیپێدان و ڕەنگدانەوەی زانستی گەردووناسیی لە شارستانیەتی یۆنانیی لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئومەوییەکان کاتێك کتێبی (مفتاح العلوم)ی (هرمس الحکیم) لە کۆتایی سەردەمی ئومەوییەکاندا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی[2]، هەروەها لە پاش ئەم، لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا و هەر لە سەردەمی خەلیفە (أبوجعفر المنصور)ەوە گرنگی پێدانی گەورە بە بواری زانستی گەردووناسیی دراوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە بزانین کە خەلیفە (أبوجعفر المنصور) بۆخۆی ئارەزووی بەلای گەردووناسییدا هەبووە، لەم بارەیەشەوە لە سەردەمیدا چەندین کتێب وەرگێڕدران لە دیارترینیان: (الأربع مقالات)ی (بطلیموس) بوو لە لایەن (أبو یحیی البطریق[3])ەوە وەرگێڕدراوە، بەلام

---

(١) مفاتیح العلوم: ص١٢٢.

(٢)السنیور کرلو نیللو: علم الفلك و تاریخه عند العرب في القرون الوسطی، روما، ١٩١١م، ص١٤٣ " د.علي عبدالله الرفاع: رواد علم الفلك في الحضارة العربیة الاسلامیة، الریاض، ١٤١٤هـ/ ١٩٩٣م، ص٣٣" محمد حسین محاسنة: م.س، ص٢٠٣.

(٣) القفطي: م.س، ص٢٤٢.

گرنگترین ڕەنگدانەوەی شارستانیەتی یۆنانیی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی لەو کاتەوەیە کە کتێبی (المجسطي)، گەردووناسی گەورەی یۆنانی (بطليموس) وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی، وەرگێڕانی ئەم کتێبە ڕەنگدانەوەی گەورەی هەبوو کە بووە باشترین سەرچاوەی وەرگێڕدراو، کە زۆرێك لە زانستەکانی خۆیان لەسەر ئەم کتێبە داڕشتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە توانییان چەندین نوێکاری تیادا بکەن و هەڵەکانی ناوی ڕاست بکەنەوە و زۆر زانیاری نوێی بخەنە سەر، بە جۆرێك کە هەرکەسێك بیویستایە بە بواری گەردووناسییەوە خەریك بێت، دەبوو سەرەتا ئەم کتێبەی بخوێندایە، ئەمەش بۆخۆی لە دیارترین ڕەنگدانەوەکانی شارستانیەتی یۆنانیی دادەنرێت لەناو ئەم شارستانییەتەدا.

بۆیە وەرگێڕانی ئەم کتێبە وەك شۆڕشێك وابوو لە بواری گەردووناسییدا، ئەمە سەرباری ئەوەی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، (المجسطی) بە گرنگترین بەرهەمی وەرگێڕدراوی شارستانیەتی یۆنانیی دادەنرێت کە وەرگێڕدرابێتە سەر زمانی عەرەبیی، هەروەك چەند جارێك لە بەشەکانی پێشوودا ناومان هێناوە، ئەم کتێبە لە سیانزە وتار پێکهاتووە، کە سەرجەمیان باس لە چۆنییەتی گۆی زەوی و ناوەندێتی و چەقبوونی زەوی و هەروەها جووڵەی هەسارەکان و مانگ و هێڵەکانی پانی و درێژی وڵاتان و کەش و هەواو و چەندان بابەتی دیکە دەکات[1].

ئەم کتێبە چەندین جار وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی، بەڵام باشترینیان وەرگێڕانی (حجاج بن يوسف المطر) بووە و پاشان (حنين بن اسحق العبادي)یە کە زۆر وردترە و بە باشترین وەرگێڕان دادەنرێت.

**٢- ناوەندەکانی چاودێرییکردنی گەردوون:**

یەکێکی دیکە لە شێوازەکانی ڕەنگدانەوەی کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، بریتییە لەو ناوەندە زانستییانەی لەم سەردەمەدا دروست بوون کە بە (مراكز الإرصاد الفلكي) ناسرابوون، سەرەتای

(١) اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ج١/ص١٣٣" القفطي: م.س، ص٩٦" قدري حافظ طوقان: م.س، ص٦٠.

دروستبوونی ئەم ناوەندانەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلیفە (المـأمون)، ئـەویش پاش ئەوەی کە خەلیفە زانیارییـەکانی نـاو کتێبـی (المجسطي) خوێنـدەوە و باسـی ئامێرەکانی لێکدانەوەی گەردووناسیی تیادا بینی، بۆیە فەرمانی دا بە ژمارەیەك لـە بیرکاریزان و گەردوونزانەکانی سەردەمی خۆی کە هەستن بە لێکدانەوەی (إرصـاد)ی هەسارەکان و ئەو زانیارییانە ڕاست بکەنەوە کە لەو کتێبەدا هاتووە، ئەو ئامێرانەش پەیدا بکەن و لێکدانەوەیان لەسەر بکەن کە لەو کتێبەدا ئاماژەیان بـۆ کـراوە، ئـەوە بوو لـە سـاڵی (٢١٥ك / ٨٣٠ز) ناوەنـدێکی لێکدانـەوەی گەردووناسـیی لـە ناوچـەی (الشماسية) لە بەرزاییـەکی بەغـداد دانـاو بـە (المرصـد المـأموني) ناسـرا، (سـند بـن علـي)ش کـە یـەکێك بـوو لـە گـەورە بیرکـاریزان و ئەنـدازیار و گەردووناسـەکانی سەردەمی (المأمون)، کردیە سەرۆکی ئـەو ناوەنـدە، شـایەنی باسـە لـەم ناوەنـدەدا دیارترین و بـەناوبانگترین گەردووناسـانی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکانی تیـادا کۆبووبوویەوە، لەوانەش: (یحیی بن أبي منصور و عباس بن سعید الجـوهري و خالـد بن عبدالملك و أبناء موسی بن شاکر) و چەندانی دیکەیش[١]، هـەروەها هـەر خەلیفـە (مأمون) فەرمانی دا بە دامەزراندنی ناوەندێکی دیکەی لێکدانەوەی گەردووناسیی لە (دیمەشـق) و لەسـەر چـیای (القاسـیون)[٢] و هـەروەها چـەند ناوەنـدێکی دیکـەیش هەبوون کە لە پاش خەلیفە (المأمون) دروستکران.

**٣- ئامێرەکانی لێکدانەوەی گەردووناسیی (آلات الرصد):**

ئاشکرایە کە هەر لـەخۆوە و بـە سـەیرکردنێکی ئاسـایی ناتوانرێـت لێکدانـەوەی گەردووناسیی و هەسارەکان و جووڵـەکانیان و دووریـی و نزیکیـان دیـاریی بکرێـت، ئەگەر چەند ئامێرێکی دیارییکراویان نەبێت کە ئەو کارەیان بـۆ بکـات، پەیـداکردن و دروسـتکردنی ئـەم ئامێرانـە و بـەکارهێنانیان بۆخـۆی بـووە یـەکێکی دیکـە لـە

(١) القفطي: م.س، ص٢٧١ " الأندلسي: م.س، ص٧٩،٨٠ " د.غوستاف لوبون: حضارة العـرب، تر.عادل وعيتر" جاك. س. ريسلر: الحضارة العربية، تر.غنيم عبدون، ص١٧٦.

(٢)إبن النديم: م.س، ص٣٩٧ " القفطي: م.س، ص٣٥٧ " ناجي معروف: المراصد الفلكية ببغداد في العصر العباسي، دار الجمهورية، بغداد، ١٩٦٨م، ص٨.

ڕەنگدانــەوە بــەهێز و کاراکــانی شارســتانیەتی یۆنــانیی لــە ســەردەمی یەکــەمی عەبباسییەکاندا، دیارترین ئامێرێکیش کە لەم بوارەدا سوودی لێوەردەگیرا ئـامێری (الإسطرلاب*) بوو کە ناوەکەی بۆخۆی وشـەیەکی یۆنانییـە، ئـەم ئـامێرە بـە یەکـەم ئامێری باوەڕپێکراوی گەردوونناسان دادەنرا، هەروەها بەهۆی ئەو سـوودە زۆرانـەی کە هەیبوو بەتایبەتی لە هەردوو بـواری گەردوونناسـیی و کەشـتیوانی دا، مـسوڵمانان ناویان نابوو (الآلة الشريفة)، بۆیە لـەپاش ئەمـەوە تـوانرا کـە زانـستێکی تایبـەت بـە بەکارهێنانی ئەم ئامێرە دابنرێت کە بـاس لـە چـۆنیەتی بـەکارهێنانی ئـەم ئـامێرە و هــەروەها چــۆنیەتی ســوودلێوەرگرتنی دەکــات تــا بــە ئاســانترین شــێوە بتوانرێــت باشترین زانیاریی لە بواری گەردوونناسییدا کۆبکرێتەوە[1].

(الاسطرلاب) پێکدێت لە قاپێك (قرص)ێکـی کـانزایی کـە دابـەش کـراوە بەسـەر چەند پلەیەکدا و بە دەوری ئەم پلانەدا دوو ژمێرەر دەخولانەوە کـە لـە هـەردوولاوە دوو سـەری تیـژیان هـەبوو، ئـەم ئـامێرە لـە شـێوەی سـتوونی هەڵدەواسـراو ڕووی دەکرایە خۆر، هەرکاتێك کە تیشکی خۆر بە دوو سەرە تیژەکەدا تێپەڕ ببوایـە، ئـەوا بەرزیی هەسارەکانی دەخوێندەوە، لەو ئاستەی کە ژمێرەرەکەی لەسـەر دەوەسـتا، گرنگترین بەشەکانی (الاسطرلاب) بریتی بوون لە: (أم الاسطرلاب، الحجرة، الـصفائح، العنكبوت، العضدة، المحور)، هەروەها دیوی پـشتەوەی ئـەم ئـامێرە دابـەش دەبـوو بەسـەر (٣٦٠) پلـە و یـەك لەسـەر چـواری بازنـەدا، کـە لەسـەر هەنـدێکیان نـاوی بورجەکان و ئاماژە پێویستەکانی کارکردنی تیادا دەنووسرا[2].

هەروەها لـە بـارەی دروسـتکردن و بـەکارهێنانی ئـەم ئـامێرەوە، لـە سەرچـاوە مێژوویەکانـدا چـەند بابـەتێك بەرچـاو دەکـەون کـە لەلایـەن زانایـان و فەیلەسـوفانی سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانەوە دانراون، لەوانەش: (الكندي) کە چەند بابـەتێك

* بڕوانە وێنەی ئامێری (الإسطرلاب) لە پاشکۆکان.

(١) اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ج١/ص١٣٩، ١٤٠" أنور الرفاعي: م.س، ص١٧٦.

(٢) حـاجي خليفـة: م.س، ج١/ص١٤٥، ١٤٧" الكـوروي: م.س، ص٣١٩" أنـور الرفـاعي: م.س، ص١٧٨" قدري حافظ طوقان: م.س، ص١٣٣" ناجي معروف: م.س، ص٢٧.

(رسائل)ێکی داناوه وەك: (في صنعة الاسـطرلاب)[1]، و (عطـارد بـن محمـد) بابـەتێکی بەناوی (عمل الاسطرلاب)[2]، هـەروەها (محمـد بـن موسـی الخـوارزمي) کتێبـی (عمـل اسطرلاب و کتاب عمل بالاسـطرلاب)[3] دانـاوه، شـايەنی باسـه کـه زۆرينـەی ئـامێری (الاسطرلاب) له شاری (الحران) دروست دەکرا[4]، ئاشکراشه هـەروەك باسمـان کـرد، ئـەم شـاره يەکێکـه لـه ناوەنـده گرنگـەکانی شارسـتانيەتی (یۆنـانيی) و ئـامێری دروستکراوی ئەم شارەش لەلايـەن گەردووناسـانەوه جێگـای بـاوەڕ بـووه، لێـرەوه دەتوانين ڕێژەی ئـەو ڕەنگدانـەوه گرنگـەمان بۆ دەربکـەوێت کـه لـه ئـەنجامی ئـەم کاريگەری شارستانيەتی یۆنانييەوه دەرکەوتووه و بڵاوبۆتەوه.

**چوارەم: فيزيك (فيزيا):**

يەکێك لـەو زانسته گرنگانـەی کـه بـه کاريگـەريی وەرگرتنـی لـه شارسـتانيەتی یۆنانييەوه ڕەنگدانەوەی هەبوو، زانستی فيزيايه کـه لـه ئـەنجامی وەرگێڕانـی چـەند کتێبێکی گرنگی ئەو بواره له یۆنانييەوه ئەم ڕەنگدانەوەيە دەرکـەوت، لـه ديـارترين ئەو کتێبانەش لەم بوارەدا:

(کتاب إختلاف المناظر)ی (أقليدس)[5]، (کتاب آلات المصوتة) ناسراو بـه (أرغـن البوقي و الأرغن الزمري، کتاب الآلة المصوتة تسمع على ستين ميلا لمورطس، کتـاب الإيقاع)ی (أرسطلکاس)[6]، (کتـاب الـصوت)ی (جـالينوس)[7]، و چـەندانی ديکـه کـه کاريگـەری گـەورەيان لەسـەر ڕێـچکەگرتن و ڕەنگدانـەوەی ئـەم زانـسته هـەبووه لـه

---

(١) إبن النديم: م.س، ص٣٧٣، ٣٧٥.

(٢) م.ن، ص٤٠١.

(٣) م.ن، ص٣٩٧.

(٤) م.ن، ص٤١٠.

(٥) إبن النديم: م.ن، ص٣٩٠" القفطي: م.س، ص٣٢٢.

(٦) إبن النديم: م.ن، ص٣٩١.

(٧) م.ن، ص١١٨ " القفطي: م.س، ١٣٠.

شارستانیەتی ئیسلامییدا، دیارترین ئەم ڕەنگدانەوانەش دەتوانین لە چەند خاڵێکدا بەرجەستەی بکەین:

**١- ڕووناکی (تیشك):**

ئەم زانستە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا بە (البصريات) ناسراوە، یان زانستی (المناظر)یشی پێدەگوترێت، دیارترین زانا لە سەردەمی عەبباسییەکاندا کە بەم بوارەوە خەریك بووبێت و ڕەنگدانەوەی پێوە دیار بووبێت (فیلسوف العرب کندي) بووە، ئەم کەسایەتییە لەسەر هەمان ڕێچکەی (أرسطوطاليس) بووە، ئەو بوارەش کە زیاتر کاری تیادا کردووە بریتی بووە لە ڕووناکیدانەوە، یان ڕووناکیدانەوەی تەنەکان، کە ناوی نابوو (مطرح الشعاع)، هەروەها لە بارەی خێرایی ڕووناکی (تیشك)، پێیوابووە کە ڕووناکی (تیشك)، پێویستی بە کات نییە، چونکە خێراییەکەی زۆر زۆر گەورەیە[1]، هەروەها لەبارەی بینینەوە هەمان بۆچوونی (أقليدس)ی هەیە کە پێیوابووە، چاو تیشکەکانی خۆی دەنێرێت بۆ هەر تەنێك کە بیەوێت ببینێت، ئەمەش جیاوازیی چاوە لەگەڵ تەواوی هەستەکانی دیکەدا، کە لەکاتێکدا چاو تیشك دەنێرێت بۆ بینینی تەنەکان و دەیبینێت، بەڵام هەستەکانی دیکە بە بەرکەوتن هەستیان پێدەکرێت[2]، دیارترین ئەو بابەتانەشی کە (الکندي) لەم بوارەدا دایناون بریتین لە: (رسالة في إختلاف المناظر، رسالة في عمل المحرقة، رسالة في البرهان الحثية السائر وماهية الأضواء و الظلام... [3]).

**٢- دەنگ:**

بە هەمان شێوە، (دەنگ)یش یەکێکی دیکەیە لەو لقانەی فیزیا کە لە ئەنجامی ڕەنگدانەوەی کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانییە، (الکندي) ئەم بوارەش یەکێکی

---

(١) طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، مطبعة الحوادث، بغداد،١٩٧٧م، ص٢٣٥.

(٢) لە بارەی بیروبۆچوونەکانی (الکندي) سەبارەت بە (الضوء و البصريات) بڕوانە: فاضل أحمد الطائي: أعلام العرب في الكيمياء، دار الحرية، بغداد، ١٩٨١م، ص٧٧،٧٦.

(٣) إبن النديم: م.س، ص٣٧٤، ٣٧٥ " القفطي: م.س، ص٣٧١، ٣٧٤،٣٨٢ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٩٠، ٢٩١.

دیکەیە لە ڕەنگدانەوە گرنگەکانی شارستانیەتی یۆنانیی کە چەندین بەرهەمی لەم بوارەدا هەیە، بۆ نموونە لە یەکێك لە (رسائل)ەکانیدا بە ناونیشانی (رسالة في علة البرد و الثلج و البرق و الصواعق و الزمهرير) دەڵێت: ((ئێمە بە چاومان هەست بە لێدانی تەنێك دەکەین، بەڵام گوێمان لە دەنگی نابێت تا ماوەیەك، ئەمەش بە پێی دووریی تەنەکە دەگۆڕدرێت، ئەگەر گەورە بێت ئەوە دەنگەك درێژ دەبێت، بەڵام ئەگەر کەم بێت، ئەوا دەنگەکە کورت دەبێت[1])).

**٣- جووڵەی تەنەکان - موگناتیس - هێزی کێشکردن:**

یەکێکی تر لەو بوارە گرنگانەی کە دەچێتە بواری فیزیاوە بابەتی (جووڵەی تەنەکان و ڕاکێشانی موگناتیسیی و هێزی کێشکردنی زەوییە، لەم سەردەمەدا لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی فەیلەسوفێکی وەك (کندي) گەیشتە ئەو ئەنجامەی هەرگیز تەنەکان وەستاونین، بەڵکو لە جووڵەی بەردەوامدان، ئەمەش لە چەند بابەتێکیدا ڕەنگی داوەتەوە وەك: (كتاب في الرد على من زعم أن للأجرام في هويتها في الجو توقفات، كتاب في بطلان قول من زعم أن بين الحركة الطبيعية والمرضية سكون، كتاب في أن الجسم في أول ابداعه لا ساكن ولا متحرك ظن باطل)[2].

هەروەها لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا زانایانی مسوڵمان موگناتیسیان دۆزیەوە و زانیان کە ئەمە ئاسن ڕادەکێشێت، بۆیە لێیەوە توانیان کە ئامێری (قیبلەنما) بدۆزنەوە ئامێری زانینی لاکان[3].

سەرباری ئەمانە، زانایانی مسوڵمان لە ڕێگای بیردۆزی (بطليموس)ەوە توانیان ئاگایان لە کێشکردنی زەوی هەبێت، چونکە (بطليموس) پێیوابوو کە ئەگەر هەر تەنێك بە ئاسماندا هەڵبدەیت، ئەوا ڕاستەوخۆ دەکەوێتەوە ناوەندەکەی خۆی، هەروەها پێیوابووە کە هەسارەکان بەیەکەوە بەستراون، ئەمەش کاریگەری گەورەی

---

(١) الكندي: رسائل الكندي الفلسفية، تح.محمد عبدالهادي أبو ريدة، القاهرة، دار الفكر العربي، ١٩٥٠ - ١٩٥٣م، ج٢/ ص٨٢.

(٢) إبن النديم: م.س، ص٣٧٦، ٣٧٧ " إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ص٢٩١.

(٣) أنور الرفاعي: م.س، ص١٥٤.

هـەبوو لەسـەر زانایـانی مـسوڵمان، بـە تایبـەتی ئـەم ڕەنگدانەوەیـە لـە پـاش ئـەم سەردەمە بە باشتر لەلای زانایـانی مـسوڵمان دەرکـەوت، کـە بیردۆزەکانیـان لەسـەر داڕشتەوە، بەم جۆرەش دەبینین لە سەردەمی یەکەمی عەبباسـییەکاندا، فیزیـا وەك یـەکێك لـە زانـستە دیارەکـانی بـواری سروشـت لـە ئـەنجامی ئـەو کاریگەرییـەی شارستانیەتی یۆنانییەوە ڕەنگدانەوەی باشی بۆ دەرکەوت، ئەگەر ئەو ڕەنگدانەوەیە کەمیش بووبێت، کە لە دواجاردا لە سەردەمەکانی دوای ئەم ماوەیەدا زیـاتر بـەرەو ڕەنگدانەوە و داهێنان چوو[1].

**پێنجەم: زانستی میکانیك (علم الحیل):**

یەکێکی دیکە لە زانستە گەیەنراوەکانی شارستانیەتی یۆنانیی بـە شارسـتانیەی ئیسلامیی، کە ڕەنگدانەوەی بەرچاوی هەبوو، زانستی (الحیل) میکانیك بـوو، کـە لـە ئـەنجامی وەرگێڕانـی چـەند کتێبێکـەوە هـەر لـە سـەرەتاوە ئـەم ڕەنگدانەوەیـە دەرکەوت، لە دیارترین ئەو کتێبانەش: (کتاب شیل الأثقال، کتاب الحیل الروحانیة)ی (هیرن الأسکندري)[2] بوو، چەند کتێبێکی دیکەی وەك (الثقل الخفیة) (أقلیـدس)[3] و (کتاب آلة ساعات الماء التي ترمي بالبنادق)ی (أرخمیدس)[4] و (کتاب دوائر الـدوالب) ی (هرقل البحار)[5]، ئەمانەو چەندانی دیکەیش، لە دیارترین ئەو ڕەنگدانەوانەش لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

**١- ڕاکێشان و بەرزکردنەوەی قورسایی بە هێزێکی کەم:**

بـۆ ئـەوەی قورسـایی بەرزبکرێتـەوە، یـان ڕابکێـشرێت بـە ئاسـانی و بـەبێ بەکارهێنانی هێزێکی زۆر، تـوانرا چـەند ئامێرێـك دروسـت بکرێـت، لـە دیـارترین ئـەو

---

(١) عمر رضا کحالة: العلوم البحتة في العـصور الاسـلامیة، مطبعـة الترقـي، دمـشق، ١٩٧٢م، ص٢٢٣ " قدري حافظ طوقان: م.س، ص٩٩.

(٢) إبن الندیم: م.س، ص٣٩٠.

(٣) القفطي: م.س، ص٦٤، ٧٣.

(٤) إبن الندیم: م.س، ص٣٨٦.

(٥) م.ن، ص٣٩١.

ئامێرانەش ئامێری (الكثيرة الرفع) بوو، لە بارەی ئەم ئامێرەوە (الخوارزمي) دەڵێت: ((لە چەند پارچەیەك پێكهاتووە، لەوانەش بەكرە و حەبلی زۆر بەهێزی ئەستوور لەوانەی كە كەشتیان پێ ئەبەستەوە و لە عەرەبانەیەكی گەورەی تەختە كە بە (البرطيس) ناسرا بوو، لە ناوەكەیدا باڵێك هەبوو كە تەنەكانی پێ ڕادەكێشرا، هەروەها (المخل) كە تەختەیەك بوو دەخرایە ژێر باری قورسەوە لە شێوەدا قورس بووە، سەرێكی خراوەتە ژێر بارە قورسەكەوە و سەرەكەی دیكەیشی ڕاكێشراوە))[1].

٢- كێشانە (الموازين):

یەكێكی دیكە لە بابەتەكانی میكانیك، بابەتی كێشانەی تەنەكان بوو، لە سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكاندا وەك ڕەنگدانەوەیەكی شارستانیەتی یۆنانیی، چەند ئامێرێك داهێنران و دروست كران، كە زۆرینەیان لەسەر هەمان شێوەی ئامێرە یۆنانییەكان بوون، تەنانەت هەندێكیشیان هەمان ناوی ئەو ئامێرانەیان هەبوو، وەك ئامێری (القرسطون)، ئەم ئامێرە بۆ كێشانەی تەنی زۆر قورس بەكار دەهات[2].

هەروەها چەند ئامێرێكی دیكە داهات كە كارەكانیان بۆ بابەت و تەنە بچووكەكان بوو، شایەنی باسە لە دروستكردنی ئەم ئامێرانەشدا شاری (حران) بە هەمان شێوە بووە ناوەندی دروستكردنی ئەم ئامێرانە كە ئامێرەكانیان بە وردیی و ڕاستیی لە خوێندنەوەدا ناوبانگی دەركردبوو[3]، جگە لەمانەش لەلایەن فەیلەسوف و زانایانی شارستانیەتی ئیسلامییەوە چەند كەسێك دەركەوتن لە دیارترینی ئەوانەش لەم سەردەمەدا (قسطا بن لوقا)[4] بوو.

---

(١) مفاتيح العلوم: ص١٤١، ١٤٣.

(٢) حكمت نجيب عبدالرحمن: م.س،ص٢٨٥، ٢٨٦ " الجميلي: م.س، ص٤٣٣.

(٣) المقدسي: أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، ص١٤١، ١٤٥.

(٤) القفطي: م.س، ص٢٦٣.

٣- کاتژمێر:

یەکێکی دیکە لەو بابەتانەی کە دەچێتە بواری زانستی میکانیکەوە و بە ڕەنگدانەوەی ئەو بوارە دادەنرێت لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، بابەتی دروستکردن و داهێنانی کاتژمێری ئاوی (المزولة) خۆری بوو، ئەم بابەتە بە جۆرێك پێشکەوتبوو لەم سەردەمەدا کاتێك کە خەلیفە (هارون الرشید) نوێنەری خۆی لە ساڵی (١٩٢ك /٨٠٧ز) دەنێرێت بۆ لای (شارلمان) ئیمپراتۆری ڕۆم، یەکێك لەو دیاریە بەنرخانەی بۆی دەنێرێت بریتی دەبێت لە کاتژمێرێکی ئاوی[(١)].

جۆری (المزولة) خۆری، کە لە ڕۆژدا بەکاردەهات، ئامێرێکی تا ڕادەیەك ورد بوو، ئەم ئامێرە لە ڕێگەی ئەو سێبەرەی کە دەکەوتە سەر هێڵە کێشراوەکانی لاپەڕەی ئامێرەکە کاتەکانی پێدەزانرا، سەرەتا پلەکانی ئەم ئامێرە دابەش کرابوو بەسەر دوانزە بەشدا، بەپێی کاتژمێرەکانی ڕۆژ، بەڵام کاتێك کەسایەتییەك بەناوی (أحمد بن عبدالله بن حبش) کتێبێکی دانا بە ناوی (الرخائم و المقیاس)، ئەم کەسایەتییە پلەکانی سەر پەڕەی ئامێرەکەی کرد بە شەست بەشەوە و بەمەش ئامێرەکەی وردتر کردەوە کە بتوانێ کاتەکانی ڕۆژ دیاریی بکات[(٢)].

شایەنی باسە کە کاتژمێر لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا چەند جۆرێك بووە، لەوانەش (لمی و ئاوی)، هەروەها جۆرێکی دیکەیشی هەبووە کە (الدوریة)ی پێگوتراوە، کە پێکهاتووە لە چەند بازنەیەك بەدوای یەکدا سووڕاونەتەوە، لێرەوە زانستێکی تایبەت بە سەرجەم جۆرەکانی کاتژمێر هاتە کایەوە، کە کاتەکانیان پێ دەزانی، بەتایبەتی بۆ کاتەکانی نوێژکردن بەکاریان دەهێنان بێئەوەی کە تێبینی جووڵەی هەسارەکان بکەن[(٣)]، لەم بوارەشدا چەندین کتێب نووسرا لەوانەش: (محمد

(١) مجيد خدوري: الصلات الدبلوماسية بين هارون الرشيد و شارلمان، مطبعة التفيض الأهلية، بغداد، ١٩٣٩م، ص٣٦، ٣٧.

(٢) د.محمد حسن محاسنة: م.س، ص٢٣١.

(٣) حاجي خليفة: م.س،ج١/ص٢٥٥.

بـن موسـى الخـوارزمي) كتێبـی (الرخامـة)[1]ی دانـا، و (الكنـدي) بابـەتی (رسـالة في إستخراج خط نصف النهار وسمت القبلة، رسالة في عمل الرخامـة بالهندسـة، رسـالة في إستخراج الساعات على صحيفة تنص على السطح الموازي للأفق خير من غيرها)[2].

بەم جۆرە دەبینین کە بـواری میکانیـك یەکێکـە لـە دیـارترین ڕەنگدانـەوەکانی شارسـتانیەتی یۆنـانیی لەسـەر شارسـتانیەتی ئیـسلامیی، لـە دیـارترین ئـەو کەسایەتییانەش کە لـەم بـوارەدا بەگـشتیی خـەریك بـوون و ناوبانگیـان دەرکردبـوو (أحمد بن موسی بن شاکر) بوو، لە بەشی پێشوو باسمان لە ڕۆڵی ئەم بنەماڵەیە کرد لە چۆنیەتی هاندان و پشتگیرییکردنی وەرگێڕان و چۆنیەتی بەدەستخستنی کتێبـی گرنگ لە ئیمپڕاتۆرییەتی ڕۆمانی و هەروەها بەکارهێنان و داهێنانی زانستەکاندا، کـە ئەم کوڕەیان بە جیاواز لە ئەوانی دیکە بۆخۆی بە تایبەت خەریکی زانستی میکانیـك (الحیل) بوو و توانیبووی چەند ئامێرێك لەم بـوارەدا دروسـت بکـات و هـەروەها ئـەم بوارەش پێش بخات[3].

**شەشەم: زانستی زیندەوەرزانیی (ئاژەڵ ـ ڕووەك):**

زینـدەوەرزانیی لـە سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکاندا بـە یـەکێکی دیکـە لـە گـرنگترین ئـەو زانـستانە دادەنرێـت کـە بـە کاریگـەریی شارسـتانیەتی یۆنانییـەوە ڕەنگدانەوەی دەرکەوتووە، بەتایبەتی بۆ هەردوولایەنی ئاژەڵیی و ڕووەکیی.

لە دیارترین ئەو کتێبانەی کە هەر لە سەرەتاوە وەرگێڕدران و ڕۆڵیان هەبوو لەو بوارەدا: کتێبـی (کتـاب الحیـوان)ی (أرسـطوطالیس) بـوو، کـە لـە لایـەن (یحیـی بـن البطریـق) وەرگێڕدرایـە سـەر زمـانی عـەرەبی[4]، هـەروەها لـە بـواری ڕووەکزانییـدا ژمارەیەکی باش لە کتێب وەرگێڕدرا، لەوانەش کتێبی (الحشائش و النبات)یان کە بـە (الأدویة المنفـردة أو الهیـولي عـلاج الطـب)ی (دیسقوردیوس)ناسـراوە، گرنگـی ئـەم

---

(١) إبن الندیم: م.س، ص٣٩٧.

(٢) م.ن، ص٣٧٥ " القفطي: م.س، ص٣٧١.

(٣) القفطي: م.س، ص٤٤٢" أنور الرفاعي: م.س، ص١٢٨، ١٢٩.

(٤) إبن الندیم: م.س،ص٣٦٦ " القفطي: م.ن، ص٢٤٦.

کتێبـه لـەوەوە دەردەکـەوێت کـە وەك لیکۆڵینەوەیـەکی زانـستیی وایـە کـە لەلایـەن (دیسقوردیوس)ەوە ماوەی (٤٠) ساڵی خایانـدووە، کـە تیایـدا لێکۆڵینـەوەی لەسـەر ڕووەك و جۆرەکانی و سوودەکانی کردووە، وەك وانە بە خوێندکارەکانی وتۆتەوە[1].

کتێبێکی دیکەی گرنگ لەم بوارەدا کتێبی (الفلاحة الرومیـة)ی (حکـیم قـسطوس بـن أسـكندر) بـوو، کـە لەلایـەن (قـسطا بـن لوقـا)ەوە وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عەرەبیی[2].

لـــە ئـــەنجامی بڵاوبوونـــەوەی ئـــەم کتێبانـــە و زانیارییەکانیانـــەوە، وەك ڕەنگدانەوەیەك، لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا چەند کتێب و بابـەتێك دانـرا، لەوانەش:

(العتبي أبـو عبـدالرحمن محمـد بـن عبـدالله) کـە لـە سـاڵی (م. ٢٢٨ك / ٨٤٢ز)، کتێبی (کتاب الخیـل)ی دانـاوە[3]، (إبـن الأعرابـي محمـد بـن زیـاد (١٥٠م. – ٢٣٠ك / ٧٦٧–٨٤٤ز) (کتاب صفة الخیل، کتـاب النبـات، کتـاب النبـت و البقـل، کتـاب صـفة الزرع، کتـاب الخیـل)[4]، (أبـو نـصر حـاتم البـاهلي) کـە لـە سـاڵی (م.٢٣١ك /٨٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە، کتێبەکانی (کتاب الشجر والنبات، کتاب الزرع و النخـل، کتـاب الابل، کتاب الخیل، کتاب الطیر، کتاب الجراد)[5]، هەروەها (یعقوب بـن الـسکیت ١٨٦ – ٢٤٤ك / ٨٠٢ – ٨٥٨ز)، کتێبـەکانی (کتـاب النبـات والـشجر، کتـاب الابـل، کتـاب الوحوش، کتاب الحشرات)[6]، هەروەها (أبوعثمان الجـاحظ م. ١٦٣ – ٢٥٥ك / ٧٧٩

(١) إبن جلجـل: م.س، ص٢٢" حـاجي خليفـة: م.س، ج٢/ ص١٤١٢" عمـر رضـا كحالـة: م.س، ص٢٩٧.

(٢) حاجي خليفة: م.س، ج٢/ ص١٤٤٧.

(٣) إبن النديم: م.س، ص١٨٢.

(٤) يـاقوت الحمـوي: معجـم الأدبـاء، دار الكتـب العلميـة، بـيروت، ١٤١١هــ / ١٩٩١م، ج٥/ ص٣٤٠" إبن خلكان: وفيات الأعيان، ج٣/ص٤٣٣.

(٥) إبن النديم: م.س، ص٨٩" ياقوت الحموي: م.ن، ج١/ص٣٣٩.

(٦)م.ن، ص١١٤" م.ن، ج٥/ص٦٤٤.

– ٨٦٨ز) كتێبـەكانی (كتـاب الحیـوان، كتـاب الـزرع و النخـل، كتـاب الابـل، كتـاب البغـل)ی دانـاوە[1]، (الكنـدي) چـەند بابـەتێكی هەیـە، لەوانـەش (كتـاب في الخیـل و البیطرة، رسالة في أنواع النخل و الكرائمة، رسالة في أجساد الحیوان إذا أفسدت، رسالة في الحشرات)[2].

ئەگەر بە شێوەیەكی ورد لە ناونیشانی ئەم بابەتانەی سـەرەوە بڕوانین، ڕادەی ڕەنگدانەوەی ئەو زانستە لە شارستانیەتی ئیسلامیی و هەروەها ئەو كاریگەرییـەمان بۆ دەردەكەوێت.

(١) یاقوت الحموي: م.ن، ج٤/ص٤٩٣.

(٢) إبن الندیم: م.س، ص٣٧٩،٣٧٦ " القفطي: م.س، ص٢٩٣،٢٩٢.

## باسی دووەم: زانستە مرۆڤایەتییەکان:

لە باسی پێشووی لێکۆڵینەوەکەماندا باسمان لە ڕەنگدانەوەی گرنگترین ئەو زانستانە کرد کە بە (العلوم الصرفة) زانستە پەتییەکان، ناسراون، لەم باسەشدا هەوڵ دەدەین کە لە ڕەنگدانەوەی ئەو زانستانە بدوێین کە دەچنە چوارچێوەی زانستە مرۆڤایەتییەکانەوە، هەروەك لە باسی پێشوو ئاماژەمان پێدا، ئەم زانستانە بەگشتیی ڕەنگدانەوەیان لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا کەم بووە، چونکە ئەم سەردەمە زیاتر سەردەمی وەرگرتنی ئەو زانستانە بووە بە ڕێگا جیاوازەکان و لە سەردەمەکانی پاش ئەم سەردەمە ڕەنگدانەوەکە زیاتر ڕەنگیداوەتەوە و دەرکەوتووە. لێرەدا هەوڵ دەدەین بە پوختیی لە دیارترین ڕەنگدانەوەی زانستە مرۆڤایەتییەکان بدوێین، ئەوانیش:

**یەکەم: فەلسەفە:**

فەلسەفە لە بنەچەدا بۆخۆی زاراوەیەکی یۆنانییە، کە لە زاراوەی (فیلاسۆفیا)وە وەرگیراوە، (فیلا) بە واتای خۆشەویستی و (سۆفیا) بە واتای دانایی (الحكمة) دێت، بەمەش (فیلاسۆفیا) دەبێت بە خۆشەویستی دانایی (حب الحكمة)، کاتێکیش ئەم زاراوەیە چووە ناو زمانی عەرەبی یەوە بوو بە فەیلەسوف و پاشان لەمەوە زاراوەی فەلسەفەیان داتاشی، بەڵام واتا گشتییەکەی ئەم زاراوەیە بریتیە لە زانستی ڕاستیی شتەکان و کارکردن بەوەی کە کامەیان باشترینە[1].

فەلسەفە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا بە یەکێك لە لقەکانی (العلوم العقلیة)ی سەر بە (العلوم الأوائل) دادەنرێت، سەرلەبەری فەلسەفە لە شارستانیەتی ئیسلامییدا بە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی ڕەنگیداوەتەوە، چونکە لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا تا کاتی وەرگرتنی شارستانیەتی یۆنانیی لە سەردەمی

---

(١) الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ص٧٩.

یەكەمی عەبباسییەكاندا شتێك نەبووە ناوی فەلسەفە بێت[1]، دیارترین ڕەنگدانەوەی ئەم زانستەش لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی بە دوو شێواز دەردەكەوێت:

١- لە ڕێگای ناوەندەكانی شارستانیەتی یۆنانییەوە وەك شارەكانی (أسكندرية و حران أنطاكية و الروها و نصيبين و جنديسابور) كە لە بەشی دووەمی لێكۆڵینەوەكەمان لێی دواین، ئەم شارانە هەر لە پاش هێرشی ئەسكەندەری مەكدۆنییەوە بۆ ڕۆژهەڵات بوو بوونە ناوەندی گرنگ و بەهێزی شارستانیەتی یۆنانیی لە ڕۆژهەڵاتدا، كە لە هەریەك لەم شارانەدا كەنیسە و دێر و خوێندنگا هەبوو كە سەرباری لاهوت و بیروباوەڕی مەسیحیی، چەندین زانیاریی و بابەتی گرنگ، بە تایبەتی وەك فەلسەفە، دەخوێندرا، ئەمەش یارمەتی پیاوانی ئایینی و ڕۆشنبیرانی ئەو شارانەی دەدا كە شارەزایی تەواویان هەبێت لە بواری فەلسەفەی یۆنانی كۆندا و باش لە بابەتە فەلسەفییەكانی هەندێك لە دیارترین فەیلەسوفانی یۆنانیی بزانن، وەك (ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و سوكرات و أبقراط و فیساگۆرس و جالینوس و....هتد)، هەرچەندە زمانی زۆرینەی ئەم شارانە بە هۆی كەنیسەوە زمانی سەرەكییان سریانیی بوو، بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا زمانی (یۆنانی)یش دەخوێندرا، كە یارمەتیدەرێكی باشیان بوو بۆ ئەوەی لە فەلسەفەی یۆنانیی تێبگەن و قووڵ ببنەوە و چەندین كتێبیشیان وەرگێڕایە سەر زمانی سریانیی، كە دواجار هەر لە نەوەكانی ئەم شارانەش بوون كە بوونە باشترین وەرگێڕكارەكانی سەردەمی عەبباسیی یەكەم، هەروەك لێی دواین[2].

---

(١) علي سامي النشار: نشأة الفكر الفلسفي في الاسلام، ج١/ص٨١، ٨٢ " دى. بور: تاريخ الفلسفة الاسلامية " د.محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية، ج٢/ ص٢٩٤.

(٢) فيصل السامر: الفكر العربي في مواجهة الفكر الغربي، بغداد، ١٩٧٢م، ص١٣" محمد زيادة مصطفى: تاريخ العرب و الاسلام، القاهرة، ١٩٦٣م، ص٨٠، ٨٣" د.محمد عبدالرحمن مرحبا: الموجز في تاريخ العلوم عند العرب، بيروت، ١٩٧٠م، ص٨٢، ٨٣ " مصطفى الرافعي: حضارة العرب في العصور الاسلامية الزاهرة، بيروت، ١٩٦٨م، ص١٢.

دیـارترین کاریگـەریی ئەمانـەش لەسـەر شارسـتانیەتی ئیـسلامیی لـەو کاتـەوە دەردەکـەوێت کـە پـەیڤین و گفتوگـۆی فەلـسەفییان لەگـەڵ مـسوڵمانانـدا دەکـرد لـە بـارەی بیروباوەڕەکانیانــەوە و فەلــسەفەیان لــە نــاو شارســتانیەتی ئیــسلامییدا بڵاودەکردەوە، لە پاش پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامییەوە بۆ ناوچەکانیان، لەمەشەوە کاریگەریی و ڕەنگدانەوەی بابەتە فەلسەفییەکان دەرکەوت، بەتایبەتیش لـە کۆتـایی سـەردەمی ئومەوییـەکان و سـەردەمی یەکـەمی عەباسـییەکاندا، لـە دیـارترین ئـەو ڕەنگدانەوانەش داهاتنی (علم الکلام) بوو، کە مەبەست لە دامەزراندنی وەڵامدانەوەی ئەو گروپ و بیروباوەڕانە بوو کە لەگەڵ ئیسلامدا پەیڤین و گفتوگۆیان دەکرد، ئەوەی کە بەم بوارەوە خـەریك بوایـە دەبـوو شـارەزایی تـەواوی لـە فەلـسەفەی یۆنـانیی و لۆژیکەکەیدا هەبوایە تا وەڵامەکەی بەهێز بێت و وەڵامی ئەو بەڵگانەی بەرامبەرەکەی بداتەوە کە پشت ئەستوور بوو بە فەلسەفەی یۆنانیی[1].

لەم بارەیەوە (الجاحظ) دەڵێت: ((المتکلم نەیدەتوانی سەرجەم بوارەکانی (علـم الکلام) بە تەواوەتی بگرێت هەتا بە هێندەی ئەوەی کە شارەزایی لە ئاییندا هـەبوو، دەبوو لە فەلسەفەشدا ببوایە[2])).

گرنگترین و دیارترین ئەو گرووپانەشی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسـییدا بـە بواری (علم الکلام) خەریك بوون و پێیان دەناسرا، (المعتزلـة) بـوون، کـە خۆیـان وا دانابوو پارێزگاریی لە ئایینی ئیـسلام و بیروباوەڕەکـەی دەکـەن لـە بـارەی یـەکتایی خوایـەتی (توحیـد الله) و پاککردنـەوەی لـە وێکـچوون و ڕاسـتی پێغەمبەرایـەتیی و پاداشت و سزا لە قیامەتدا، ئەمەش لـە بەرامبـەر گرووپـەکانی (المرجئـة و الجبریـة و

---

(١) د.عبـدالرحمن بـدوي: مـذاهب الاسـلامية، دار العلـم للملايـين، بـيروت، ١٩٩٧م، ص٧، ٨ " د.حسين الحاج أحمد: حضارة العرب في العصر العباسي، المؤسسة الجامعية للنشر و التوزيع، بيروت، ١٤١٤هــ/١٩٩٣م، ص٨٤ " د.إبـراهيم سـلمان الكـروي و د.عبـدالتواب شـرف الـدين: م.س، ص٢٨٥، ٢٨٦" محمد الحسيني عبدالعزيز: الحياة العلمية في الدولة الاسـلامية، وكالـة المطبوعـات، الكويت، ١٩٧٣م، ص٧٢.

(٢) الحيوان: ج٢/ ص١٣٤.

مەسیحییەکان و جوولەکەکان و الدهريين و المانويين)دا، (معتزلة)كان بەهۆی ئـەوەی کە لە بەڵگەهێنانەوەدا زۆر بەهێز بوون و توانایی و لێهاتوویی گەورەیان لە دەربـڕین و باوەڕپێکردندا بـە پـشتگیریی فەلـسەفە، ژمارەیـەکی زۆر لـە خـەڵکی لـە دەوریـان کۆبوونـەوە، لـە زانایـان و بیریـاران و شـاعیران و چـینە جیاوازەکـانی دیکـەی نـاو کۆمـەڵگا، سـەرەتا لـە مزگـەوتێکی (بەسـڕە)وە دەسـتیان پێکـرد، پاشـان لـە سەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچییەوە ڕوویان کردە بەغداد، ئـەم بیروبـاوەڕە بـە جۆرێـك لـە سـەردەمی یەکـەمی عەباسـییەکاندا بڵاوبووبوویـەوە کـە تـەواو ئـەم سـەردەمەی پێدەناسـرێتەوە، باسـی کـۆڕ و پـەیڤین و گفتوگـۆ و بابەتـە فەلسەفییەکانیان کـە لـەناو مزگـەوت و کـۆڕ و کۆبوونـەوە گـشتییەکاندا ئـەنجامیان دەدا، بوو بووە قسەوباسی خەڵکیی، بەتایبەتیش پاش ئەوەی لە سەردەمی خەلیفە (المـأمون)ەوە ئیـدی لەلایـەن دەسـەڵاتەوە پـشتگیرییان لێـدەکراو زۆر بـە ئازادانـە بیروباوەڕەکانیان بڵاودەکردەوە.

بڵاوبوونـەوەی بیروباوەڕەکـانی (المعتزلـة) ڕۆڵـی گـەورەی هـەبوو لـە ڕابـوونی ڕۆشـنبیریی و فەلـسەفی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکاندا، ئەمـەش گـرنگترین ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی یۆنانیی بوو لەو بوارەدا، بۆ نموونە زۆرینەی شاعیرانی ئەم سەردەمە وەك: (بشار بن برد و أبو النواس و أبان اللاحقي و أبو تمام... هتد)[1].

شـایەنی باسـە بیروباوەڕەکـانی (المعتزلـة) پێـنج بنـەمای سـەرەکییان هـەبوو، ئەوانیش: (التوحيد، العدل، الوعد و الوعيد، القول بأن مرتكب الكبيرة لـيس بالكـافر ولا بالمؤمن بل في منزلة بين المنزلتين، والأمر بالمعروف و النهي عن المنكر)، بـوون و دیارترین (متكلم)ەکانی (المعتزلة)ش لـەم سـەردەمەدا، بریتـی بـوون لـە (واصـل بـن العطاء) دامەزرێنەری گروپی (المعتزلة) کە پێیوابوو ئەنجامدەری تاوانە گەورەکان لە شوێنێکدایە لە نێوان کافری و ئیماندا دەوەستێتەوە، بـە یـەکێك لـە دیـارترینی ئـەو کەسانەش دادەنرێـت کـە زۆرتـرین گفتوگـۆ و پـەیڤیی لەگـەڵ ئەوانـە دەکـرد کـە بـە

---

(١) د.حسين الحاج حسن: م.س، ص٨٤، ٨٥.

گروپەکانی (أهل الملل و النحل) ناسرا بوون، هەروەها پاش ئەم (عمرو بن عبیدالله) شوێنی گرتەوە، کە لە ساڵی (١٤٥ك) کۆچی دوایی کردووە، ئەم کەسایەتییە زۆرترین پەیڤینی لەبارەی بیروباوەڕی (العدل) بە تایبەتی لە بواری (حریة الإرادة) کردووە[(١)]، لەپاش ئەمان، خوێندکارەکانیان، لە ئەنجامی قووڵبوونەوەیان بە بابەتە فەلسەفییەکاندا، (المعتزلة)کان بوون بە چەند گروپێکەوە، لە دیارترینیان (الهذیلیة) بوو کە بەناوی (أبي الهذیل العلاف)ەوە ناونرابوو، ئەم کەسایەتییە کە لە نێوان ساڵانی (١٣٥ – ٢٣٥ك) ژیاوە، بە بەهێزیی بەڵگە و زۆری زانیاریی و زمانپاراوی ناسرابوو، هێزی گەورەی لە باوەڕپێکردنی بەرامبەریشدا هەبووە، ئەم کەسایەتییە زۆر بابەتی لە فەلسەفەی یۆنانیی وەرگرتبوو، بە تایبەتی لە هەردوو بواری (طبیعة – الهیة)، هەروەها چەندین لێکۆڵینەوەی تایبەتی کردبوو لە بواری هەستەکانی مرۆڤ، کە سەرجەمیانی لە فەلسەفەی یۆنانییەوە وەرگرتبوو، پاشان بۆخۆی زیادەی خستبووە سەر و بۆ مسوڵمانانی ڕوون کردبوونەوە، بەگشتیی (أبي الهذیل العلاف) سوودی لە (آثار الباقیة)ی (أرسطوطالیس) و (کتاب الفصول)ی (أبقراط) و (المجسطي)ی (بطلیموس) و (الفراسة)ی (أفلیون) وەرگرتبوو[(٢)].

هەروەها یەکێکی دیکە لەوانەی کە لەم سەردەمەدا ڕۆڵیان هەبووە (نظام بن أبي الهذیل*)ە کە بە (نظام المعتزلي) ناسراوە، ئەم کەسایەتییە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە وتەکانی (المعتزلة) و فەلسەفە تێکەڵی یەکدی بکات، زیاتر مەیلی بە

---

(١) الشهرستاني: الملل و النحل، ج١/ ص٣١ " أحمد أمین: ضحى الاسلام، ج٣/ ص٩٧ " د.محمود إسماعیل: تاریخ الحضارة الاسلامیة، ص٢١٢ -٢١٧.

(٢) الأشعري: مقالات الاسلامیین وإختلاف المصلیین، ج١: ص٣٠٠، ٣٠٢، ٣٠٥ " الشهرستاني: م.س، ج١/ ص٥٧ " القاضي عبدالجبار: فضل الإعتزال و طبقات المعتزلة، تح.فؤاد السید، دار التراث، القاهرة، ١٣٨٦هـ/ ١٩٦٦م، ص٢٥٤ " إبن المرتضى: المنیة و الأمل، تح.عضام الدین محمد علي، دار المعرفة الجامعیة، الأسكندریة، ١٩٨٥م، ج٢/ ص١٥٥.

* ئەم کەسایەتییە کوڕی أبو الهذیل العلاف نییە، بەڵکو ناوی (إبراهیم بن السیار)ە و ئەمە وەك نازناوێکی وابووە.

لای فەلسەفەی سروشتیدا هەبووە، لە دیارترین بیروباوەڕەکانیشی ئەوە بووە کە ((خوای گەورە لە نێو شتەکاندا باشترین بۆ بەندەکانی هەڵدەبژێرێت))[1].

بەکورتی، دەتوانین بڵێین کە گرووپی (المعتزلة)، دیارترین ئەو گرووپە فیکرییانە بوون لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا کە ڕەنگدانەوەی فەلسەفەی یۆنانییان بە شێوەیەکی دیار پێوە دیار بووە، ئەم بابەتە نەك تەنها هەر بە ڕووخسار بووبێت، بەڵکو لە ناوەڕۆکیشدا تەواو ڕەنگیدابۆوە تیایاندا، بۆنموونە بیروباوەڕەکانیان سەبارەت بە (نفي الصفات، نفي الرؤية، نفي الجهة، نفي التشبيه، التجسيم، الحلول في مكان، القول بخلق القرآن) تەواو کاریگەر بوون بوو بە فەلسەفەی یۆنانیی، لەم لایەنەشەوە کاریگەرییەکانی (أرسطوطاليس) تەواو بەسەر (معتزلة)کانەوە دیار بوو، کە لە دوو بیری سەرەکیی خۆی دەبینیەوە، ئەوانیش (فكرة الهيولي*) و (فكرة العدم)ە کە هاوشێوەی بیروباوەڕەکانی (أرسطوطاليس)ە، لەم بارەیەوە دیارترین کەسێك کە زۆر بە بیروباوەڕەکانی (أرسطوطاليس) کاریگەر بووبێت لە نێوان (معتزلة)کاندا و هەوڵی بەکارهێنانەوەی دابێت (نظام المعتزلي) بووە، لەم بارەیەوە باس لە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ڕووداوێك دەکرێت کە جارێکیان (جعفر بن يحيى البرمكي) باس لە (أرسطوطاليس) دەکات، (نظام العتزلي) دەڵێت: من کتێبەکەیم شیکار کردووە، (جعفر بن يحيى البرمكي) پێی دەڵێت: چۆن خۆ تۆ ناتوانی بیخوێنیتەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا پێی دەڵێت: باشە، پێت خۆشە لە سەرەتاوە بۆت بخوێنمەوە، یان لە کۆتاییەوە؟ پاشان سەرجەمی بۆ دەخوێنێتەوە و بابەتەکانی بۆ ڕوون دەکاتەوە، دیارە ئەم ڕووداوە ڕادەی تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەی ئەم

---

(١) الشهرستاني: م.س، ج١/ ص٣٧ " أحمد أمين: ضحى الاسلام، ج٣/ص١٠٦.

* الهيولي: لە زمانی عەرەبییدا بە شتێك دەگوترێت کە تیشکێکی ڕووناکی بەربلاو بێت، هەروەك تیشکی ڕۆژ کاتێك کە دەچێتە ماڵێکەوە لە درزی پەنجەرەیەکەوە، زاراوەیەکی (یۆنانییە)، المنجد في اللغة، ص٨٨٢.

کەسایەتییەمان بۆ دەردەخات لە بابەتی (أرسطوطاليس) و چۆنیەتی ڕەنگدانـەوەی فەلسەفەکەی دەردەخات لەسەری[1].

شایەنی باسە هەروەك سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، ئەم کەسایەتییە تەواو بە ڕوونیی و ئاشکرا یەکێك بووە لـە نموونـە دیارەکـانی شارسـتانیەتی یۆنـانیی، کـە وتەی فەیلەسوفەکانی دەرهێناوە و هەوڵی تێکەڵکردنی داوە بە وتەی (معتزلـة)کـان، هــەروەها دەگوترێـت زۆرینــەی کتێبــەکانی ئەرسـتۆی لەبــەر بــووە، لــە دیــارترین کتێبەکانیشی (الجزء وحركة الأجسام).

بەهەرحاڵ، لایەنی فەلسەفیی و لۆژیکیی یۆنانیی یەکێك بوو لە هـەرە کۆڵەکـە و بنــەما ســەرەکییەکانی بیروبــاوەڕی (المعتزلـة) کـە ڕەنگدانــەوەی گــەورەی بــەکار و کردەوەکانیانەوە دیار بـوو، چ لـەو پــەیڤین و گفتوگۆیانــەی کـە لەگـەڵ گرووپــەکانی دیکە و بەتایبەت خاوەن ئایینانی تر دەیانکرد، یان لەو نووسـین و وانـە و وتارانـەوە بێت کە لە نێو خەڵکدا بڵاویان دەکردەوە بەمەش بەشێکی گەورەی لایەنی (عـەقڵی) ســەردەمی یەکــەمی عەبباســییەکانیان داگـیر کردبـوو، کـە فەلـسەفەی (یۆنـانیی) و شارستانیەتی یۆنانیی لەم بوارەدا ڕۆڵی کاریگەری هەبوو[2].

٢- یــەکێکی دیکــە لــە شـێوازە دیارەکـانی ڕەنگدانــەوەی لایــەنی فەلـسەفیی شارستانیەتی یۆنانیی لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا، بریتیـە لـە وەرگێڕانـی بابەتـە فەلسەفییەکان، کە سەرباری ئەوەی گرووپی (المعتزلة)، هەروەك لە خـاڵی سـەرەوە ئاماژەمان پێدا، سوودیان لەم لایەنە دەبینی، ئەوا چـەند بیریـار و فەیلەسـوفێك لـەم

---

(١) الأشعري: م.س، ج١: ص٢٣٨" القاضي عبدالجبار: م.س ص٢٥٤ " الـشهرستاني: م.س، ج١/ ص٥١ " إبن المرتـضى: م.س،ج١/ص٤٨ و ج٢/ ص١١٠"د.حـسن أحمـد محمـود و د.أحمـد إبـراهيم الشريف: العالم الاسلامي في العصر العباسي، ص٢٧٦" د. حـسن إبـراهيم حـسن: تـاريخ الاسـلام، ج٣/ ص٢٤٥ " زهــدي حــسن جــار الله: المعتزلــة، القــاهرة، ١٣٦٦هــ / ١٩٤٧م، ص٥٠ " د.عبدالحكيم بليغ: أدب المعتزلة، دار النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٧٩م، ص٩٣ " محمد أبو زهـرة: تاريخ المذاهب الإسلامية، دار الفكر العربي، ١٩٧١م، ج١/ ص١٤٥.

(٢)د.حسن محمود و د.أحمد إبراهيم الشريف: م.س، ص٢٧٦.

سـەردەمەدا دەركـەوتن كـە بـە بیروبـاوەڕە فەلـسەفییەكان كاریگـەر بـوون و ئـەو ڕەنگدانەوەیەیان پێوە دیار بوو و كارەكانیـان لـە گروپـی (المعتزلـة) جیـاواز بـوون، ئەمان كاریگەریی تەواوی وەرگێڕانەكانیان لەسەر بوو، چونكە مسوڵمانان لە كاتێكدا دەستیان كرد بە وەرگێڕان و ڕوویانكردە لایەنی فەلسەفیی كە (ئەفلاتۆنیـەتی نـوێ) باڵی بەسەر فەلسەفەی شارستانیەتی یۆنانییدا كێشا بوو، (ئەفلاتۆنییـەتی نـوێ) بـە واتای زیندووكردنەوەی بیروبۆچـوونەكانی (ئـەفلاتۆن) دێـت بـە تێكـەڵكردنی لەگـەڵ فەلسەفەی (فیـساگۆرس)دا، ئەمـەش بـە كاریگـەریی ئـاییني ڕۆژهـەلات، (أمونیـوس الأسـكندراني) بـە دامەزرێنــەری ئـەم ڕێبــازە دادەنرێـت، پـاش ئـەم یـەكێك لـە خوێندكارەكانی كەوتە پێشخستنی ئەم ڕێبازە فەلسەفییە كە ناوی (أفلـوطین) بـوو، ئەم كەسایەتییە نیوەی ژیانی خۆی لە ڕۆما بەسەر بردووە لە نێوان ساڵانی (٢٣٧ — ٢٤٥ز)، بەردەوام لەبارەی ژیانی ڕۆحییـەوە خوێنـدكارەكانی ئاگـادار دەكـردەوە بـە پـشت بەسـتن بـە فەلـسەفە، پـاش ئـەمیش یـەكێك لـە خوێنـدكارەكانی بـەناوی (فورفوریـوس) لــە (ڕۆمــا) شــوێنی گرتــەوە، كتێبــەكانی (أفلاطــون) و وانــەكانی مامۆستاكەی كۆكردەوە و هەروەها شیكاری بۆ كتێبـی (محـاورات أفلاطـون الكـبرى) كرد، هەروەك چۆن كتێبەكانی (أرسطوطالیس)ی وەك: (المقولات، الأخـلاق، الطبیعـة و الإلهیـات)ی شـیكردەوە و كتێبـی (المـدخل الى مقـولات أرسـطو)ی دانـا، كـە ئـەم كتێبانە لە سـەردەمی یەكـەمی عەبباسـییەكاندا زۆربـەیان وەرگێڕدرانـە سـەر زمـانی عەرەبیی و ڕەنگدانەوەی گەورەیان هەبوو.

شایەنی باسە بە هۆی ئەو لایەنە ڕۆحییەی كە (أفلاطـون)ی پێناسـرابوو، لـەلای مەسـیحییە یۆنانییـەكان جێگـای پەسـەند بـوو، هـەروەها (أرسـطوطالیس)یـش لـەم بوارەدا لەلای سـریانییەكانەوە ناسـرابوو، زۆرینـەی كتێبـەكانیان وەرگێڕابـووە سـەر زمانی سریانیی، بۆیە دەبینین لە كاتی وەرگێڕانـی كتێبـە فەلـسەفییەكاندا زۆرینـەی ئەوانەی كە وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبیی بریتی بوون لـە بەرهەمـەكانی هـەردوو فەیلەسوف (أفلاطون و أرسطوطالیس)، هەروەها چەندین (شـرح)ی كتێبـەكانی ئـەم دوو فەیلەسوفانە بوون، لەوانەش بابەتەكانی (الأسكندر الأفرودیسي، فورفوریـوس و

یوحنـا الدمـشقي) بـوون، هـەروەها بـاس لـەوە دەکرێـت کـە چـەند بابـەتێکی (أفلـوطین)یـش وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی عـەرەبیی وەك: (أوثولوجیـا أرسـطو، مختارات من مبادئ إلهیات)، بەرهـەمێکی (أبروقلـوس) بـەناوی (کتـاب العلـل)، بۆیـە دەبینین فەلسەفەی ئیسلامیی زیاتر بە فەلسەفەیەك دەناسرێت کـە زیـاتر بـە بـواری ڕۆحانییـەوە خەریکـە، لـەم بوارەشـدا تاڕادەیـەك سـوودیان وەرگـرت[1]، هـەروەك ڕۆژهەڵاتناسێکی وەك (جوزیف هل) دەڵێت: ((لە بەختی مسوڵمانان بوو کاتێك کە لە سەرەتاوە روویانکردە لایەنی فەلسەفەی ئەرستۆ و لقە نوێیـەکانی ئـەو فەلـسەفەیە، ئەمـەش لەبـەر تێبینییـە وردەکـانی و هەڵپـسێردراوە بـەهێزەکانی بـوو بـە نموونـە بەرزەکانـەوە،........ لەبـەر ئەمانـە ئەرسـتۆ مامۆسـتای یەکـەمی عەرەبـە و بـەبێ دوودڵیـی، زانیـاریی و تعالیمـەکانیان وەرگێـڕاو، زۆرینـەی کتێبـەکانیان کـردە عەرەبی[2])).

بەمجۆرەش دەبینین کە فەلسەفەی ئیسلامیی بە تێکەڵییەك لـە (أرسـطوطالیس و ئەفلاتۆنیەتی نوێ) دامەزرا، دیارترین ئەو کتێبانەشی لـەم بـوارەدا وەرگێـڕا چـەند دانەیەك بوو، بۆ نموونە لە بابەتەکانی ئەفلاتۆن ئەو پارێزگارییەی کە لـە (سـقراط)ی دەکات بەناوی (إحتجاج سقراط علـى أهـل أثینـا)، پاشـان کتێبـەکانی دیکـەی وەك: (کرایتـون السفـسطائي، فیـدروس، الجمهوریـة، طیمـاوس، کتـاب النـوامیس، فیـدون) بوون، پاشان (حنین بن إسحاق) شـیکاری هـەردوو کتێبـی (الـسیاسة و النـوامیس)ی کـرد و بـە وەرگێڕانـە عەرەبییەکەیـدا چـووەوە، هـەروەها (السفـسطائي) وەرگێـڕا و (یحیـی بـن عـدي) پیایـدا چـووەتەوە، هـەروەها (إبـن بطریـق) کتێبـی (طیمـاوس)ی وەرگێـڕا، هـەروەها (عبدالمـسیح بـن عبـدالله) کتێبـی (کتـاب الربوبیـة)ی وەرگێـڕا و چەندان کتێبی دیکە کە لەم بوارەدا ڕۆڵی گرنگیان بینـی لـەوەی کـە بـۆ چـوونەکانی (ئەفلاتۆنی نوێ) بە ناو مسوڵماناندا بڵاوبێتەو لەناو فەلسەفەی ئیسلامییدا، لێـرەوە

---

(١) إسماعيل مظهر: م.س، ل ١٣١" ت.ج.ديبور: م.س، ص٤٦، ٤٧ " يوسف كرم: تاريخ الفلسفة اليونانية، ص٣٢٢ – ٣٣٦.

(٢) الحضارة العربية، تر.إبراهيم أحمد عدوي، ص١٠٧.

ئیدی مسوڵمانان له خوێندنی فەلسەفەی (أرسطوطالیس)دا پشتیان دەبەست بە دانراوەکانی زانایانی (ئەفلاتۆنی نوێ) و شیکارەکانیان[1].

یەکێکی دیکە لە بۆچوونە دیارەکانی بابەتی فەلسەفەی (ئەفلاتۆنی نوێ)، بریتی بوو لەوەی کە پێیانوابوو فەلسەفەی (أرسطوطالیس) و بۆ چوونەکانی و فەلسەفەی (أفلاطون) و بۆچوونەکانی لە ناوەڕۆکدا یەك شتن، ئەم بۆچوونەش تەواو ڕەنگدانەوەی هەبوو لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا کە هەوڵی ئەوەیان دەدا بەردەوام یەکانگیرییەك بکەن لە نێوان ئەم دوو فەلسەفەیە لەلایەك و بیروباوەڕی ئیسلامیی لە لایەکی دیکەوە، لەم بوارەشدا، فەیلەسوفی گەورە (الکندي) لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا یەکەم کەس بوو کە ئەم هەوڵانەی دەداو لە هەوڵی ئەم یەکانگیرییەدا بووە[2]. لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا فەلسەفەی شارستانیەتی یۆنانیی ڕەنگدانەوە و پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، هەروەك سەرەتایەکی گەورەش بوو بۆ بنیاتنان و دامەزراندنی فەلسەفەی ئیسلامیی.

**دووەم: جوگرافیا:**

یەکێکی دیکە لەو زانستانەی کە بە کاریگەری شارستانیەتی یۆنانیی ڕەنگدانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، زانستی جوگرافیا بوو لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، جوگرافیا بۆخۆی لە بنەچەدا زاراوەیەکی (یۆنانی)یە و بە واتای وێنەی زەوی (صورة الأرض) کە مەبەستیان پێی زانینی بارودۆخی هەرێمەکانی نیشتەجێبوو لەسەر ڕووی زەوی و پانی و درێژیی وڵاتان و شوێنی شارەکان و

---

(١) ل.أ.سيدو: تاريخ العرب العام و حضارتهم، مدارس الفلسفي و العلمية و الأدبية، تر. عبدالله علي الشيخ، الأهلية للنشر و التوزيع، عمان، الأردن، ٢٠٠٢م، ص٣٨٩" د.حسين الحاج حسن: م.س، ص٤٧، ٥٠ " علي سامي النشار: م.س، ج١/ص٨١، ٨٢ " ت.ج.ديبور: م.س،ل ٢٧، ٢٨ " د.محمد عبدالرحمن مرحبا: من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية، ج١/ ص٢٩٤ " هانز هينرش لشيندر: روح الحضارة العربية، تر. عبدالرحمن بدوي، بيروت، ١٩٤٩م، ص٧٣.

(٢) إبن أبي أصيبعة: م.س، ج١/ ص٢٨٥ " د.محمد حسن محاسنة: م.س، ص٢٢٤.

چیاکان و دەریاکان و ڕووبارەکـان و جگـە لەمانـەش، هـەروەها چـۆنیەتی جیـاوازیی دانیـشتوان بـە پێـی جیـاوازیی شـوێن و ناوچـەکان، بـەم مانایـەش ئـەم زاراوەیـە گواسـترایەوە بـۆ زانایـانی مـسولمان لـە ڕێگـای کتێبـەکانی (بطلیمـوس مـارینوس الصوري)یەوە، کە ناسرابوون لە بواری جوگرافیادا[1].

لـە سـەردەمی یەکـەمی عەباسـییەکاندا ئـەو کتێبانـەی کـە لـە شارسـتانیەتی یۆنانییەوە وەرگێـڕان ڕۆڵـی گرنگیـان هـەبوو لـە کاریگـەربوون و ڕەنگدانـەوەی ئـەم لایەنە لەناو شارستانیەتی ئیسلامییدا، کە بە تەواوەتی بەو بابەتەوە کاریگەر بوون و سـوودیان لـە بۆچـوونەکانیان وەرگـرت، دیـارترین ئـەو کتێبانەشـی کـە زۆرتـرین ڕەنگدانــەوەی هــەبوو لــەم بــوارەدا، دوو کتێبــی (بطلیمــوس) بــوون، یەکــەمیان (المجسطي) بـوو کـە لـە بابەتـەکانی پێـشوودا چـەند جارێـك ئامـاژەمـان پێکـردووە، بەتایبەتی لە باسی زانستی (گەردووونناسییدا)، دووەمیـشیان بـە ناونیـشانی (کتـاب الجغرافي معمور وصفة الأرض)ە کە سـەرەتا لەلایـەن (الکنـدي) وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمانی عەرەبیی، گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە چەند خشتەیەکی تیادایـە سـەبارەت بـە نـاوی شـوێن و جێگـا و هـەروەها هێڵـەکانی درێـژیی و پـانی و پاشـان نەخـشەی جیهانی زانراوی ئەو کاتەی لە خۆگرتووە[2].

دیارترین ئەو ڕەنگدانەوە و سوودانەشی کـە خـەریکبووانی بـواری جوگرافیـا لـە کتێبەکانی (بطلیموس)ەوە وەریانگرت، لە دوو خـاڵی سـەرەکیدا خـۆی دەبینێتـەوە ئەوانیش:

أ- لێیەوە فێری چۆنیەتی درێژی و پانی ناوچەکان بوون.

ب - لەم کتێبەوە فێری ئـەوە بـوون چـۆن جیهـان دابـەش بکـەن بەسـەر چـەند هەرێمێکـدا، هەرچــەندە لــە ڕووی دابەشــکردنی هەرێمەکانــەوە لــە (بطلیمــوس) پێشکەوتووتر بوون، بەڵام لە سەرەتاوە لەوەوە فێری بابەتەکە بوو بوون [3].

---

(١) حاجي خليفة: كشف الظنون، ج١/ ص٥٩٠.

(٢) إبن النديم: م.س، ص٣٨٩ " القفطي: م.س، ص٩٨ " طه باقر: م.س، ص١٧٣.

(٣) نقولا زيادة: الجغرافيا و الرحلات عند العرب، دار الكتاب اللبناني، بيروت، ١٩٦٢م، ص١٨.

لـه سـەدەی سـێیەمی کۆچـی بەگـشتیی چـەند ڕەنگدانەوەیـەکی ئـەم بابەتـە دەرکەوت و چەند کتێبێکی گرنگ لـە بـواری جوگرافیـادا دانـران، ئـەوانیش: (صـورة الأرض– الخـوارزمي، چـەند (رسـائل)ێکـی الکنـدي، الأعـلاق النفيـسة – إبـن رسـتة، والمسالك و الممالك – إبن خرداذبة) بـوون، بـەڵام ئەوانـەی کـە دەکەونـە سـەردەمی یەکەمی عەبباسییەکانەوە تـەنها یەکـەم و دووەمـی ئـەم کتێبانـە بـوو، بۆیـە لێـرەدا تەنها لەوان دەدوێین:

**١ـ کتێبی (صورة الأرض):**

ئەم کتێبە لەلایەن (الخوارزمي)یەوە دانراوە، بە یەکەم کتێبـی بـواری جوگرافیـا دادەنرێت کە بە کاریگەریی شارستانیەتی یۆنانیی و وەك ڕەنگدانەوەیەکی گرنگ لەو بوارەدا دانرابێت، کە بە شێوەیەکی سەرەکیی سوودی لە (بطليموس) وەرگرتووە[١].

دیارە بەهۆی ئەوەی کە (الخوارزمي)، هەروەك لە پێشتردا ئاماژەمان بۆی کـرد، کەسـایەتییەکی بیرکـاریی و هـەروەها گـەردووناس بـووە، شـێوازی بیرکارییانـە بـە کتێبەکەیەوە دیارە و سەرجەم بەرهەمەکانی لە شێوەی (زيج) خشتەدا نیشان داوە، کە ڕاستەوخۆ بۆ باسەکانی پشتی بە خشتە بەستووە و بە شێوەیەکی سـتوونیی لـە هەر لاپەڕەیەکدا ئەمەی ڕوونکردۆتەوە، کە تیایدا باسی لە ناوی ئەو شـارانە کـردووە کە دەکەونە پشت هێڵـی (الأسـتواء) و ناوەڕاسـتیەوە[٢] و پاشـان دێتـە سـەر باسـی شارە دیار و زانراوەکان بەپێی (الأقاليم السبعة) دەکات تـا دەگاتـە پـاش ئـاوەدانی، هەروەها باس لە دابەشبوونی چیاکان دەکات بە پێی حەوت هەرێمەکـە[٣] و بـاس لـە دەریاکـان و زەوی کـەنار و ڕۆخـی ئـەم دەریایانـەش دەکـات[٤]، بـاس لـەو شـوێنانە

(١) بڕوانە: كتاب صورة الأرض من المدن و الجبال و البحار و الجزائر و الأنهار، إستخرجه أبو جعفر محمد بن موسى الخوارزمي، من كتاب جغرافيا الذي ألفه بطليموس القلوذي، نسخه و تصحيحه هانس فون مذيك، ڤينا، مطبعة آدولي هولزهوزن، ١٣٤٥هـ / ١٩٢٦م.

(٢) الخوارزمي: م.ن، ص٣ – ٣٥.

(٣) الخوارزمي: كتاب صورة الأرض، ص٣٥ – ٦٦.

(٤) م.ن، ص٦٦ – ١٠٠.

دەكات كە بە سنووری ولاتان ناسراون[1]، لە بەشی كۆتایی كتێبەكەدا كە فـراوانترین بەشێتی، بـاس لـەو سەرچـاوانە دەكـات كـە كەوتوونەتـە پـشت هێڵـی (الأسـتواء) و هەروەها باس لەو سەرچـاوە و (كـانی)یانـە دەكـات كـە بەسـەر حـەوت هەرێمەكـەدا دابـەش بـوون[2]، پاشـان وەك پاشـكۆ چـوار نەخـشەی لەگەڵدایـە كـە ڕوونترینیـان نەخشەی ڕووباری (نیل)ە، كە باسی لە گرنترین ئەو شارانە كردووە كە لە سـەریەتی و هەروەها بە ئاشكرا ڕێڕەوی ئەم ڕووبارەی ڕوونكردۆتەوە، هەر لە سەرچاوەكەیەوە لە چیای (القمر) هەتا دەگاتـە كۆتـایی لـە دەریـادا و ئـەو لقـە جۆراوجۆرانەشـی كـە تێكەڵی دەبێت، هەروەها لەسەر نەخشەكە هێڵی (الاستواء) و سـنووری هەرێمـەكانی یەكەم و دووەم و سێیەمی تیادایە، گرنگیی ئەم نەخشەیە لـەوەدا دەردەكـەوێت كـە بە گرنگترین نەخـشە دادەنرێـت لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا لـە ڕووی ئـەوەی كـە یەكەم نەخشەی جوگرافییە لەم شارستانییەتەدا[3].

لــە بــارەی ئــەم كتێبــەوە ڕۆژهەڵاتناســی هۆڵەنــدی (جــی. اج. كرامــز. J.H.KRAMZ)، دەڵێـت: ((ئـەو هێڵـە درێـژیی و پانییانـەی كـە الخـوارزمی لـە كتێبەكەیدا باسی كردووە، پشت ئەستوورە بە بۆچوونەكانی بطلیموس، لەم كتێبەدا ئـەو شـوێن و جێگـا جوگرافییانـە دیـارییكراون كـە لـە كـاتی فتوحـاتی ئیـسلامییدا پێیگەیشتوون، بەڵام ئەوەی جێگیر نییە لـە لامـان ئەوەیـە كـە ئـەو دیارییكردنـە بـە هۆی لێكۆڵینەوەی گەردووونناسییەوە بووە، یان نا، چونكە ئـەوەی ئاشـكرایە لـەلای ئێمە ئەوەیە كـە خەلیفـە هـارون الرشـید فـەرمانی دا بـە پێوانـەی زەوی لـە بیابـانی سـوریادا و یـەكێكیش لـە دیـارترین ئـەو زانایانـەی لـەم پێوانەكردنـەدا بەشـدار بـوو

(١) م.ن، ص١٠٠ – ١٠٦.

(٢) م.ن، ص١٠٦ – ١٥٨.

(٣) بڕوانە پاشكۆی ژمارە (٥).

الخوارزمي بووه، بۆیه ئاساییه ئەگەر بڵێین کتێبەکەی الخوارزمي کۆکراوەیەکی سەرجەم لێکۆڵینەوەکانی زانایانی مسوڵمانی پێش خۆی و هاوکارەکانیەتی[1])).

٢- لەگەڵ گەشەسەندنی بزووتنەوەی وەرگێڕاندا و هەروەها بە زۆربوونی بابەتە وەرگێڕدراوەکانی بواری جوگرافیا، گرنگیپێدان و لێکۆڵینەوە جوگرافییەکانیش لە شارستانیەتی ئیسلامییدا لەلایەن بیریاران و فەیلەسوفانەوە ڕووی لە زیادی کرد کە وەك ڕەنگدانەوەیەکی ئەم دیاردەیە دەرکەوتن، لە دیارترین ئەو بابەتانەش کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرا (قەبارەی زەوی و شێوەکەی و بەشەکانی و شوێن بەپێی ئەستێرەکان، چیاکان و باران و هەور و هەورە تریشقە و بوومەلەرزە و.......هتد) بوون کە بە پێی ئەو سەردەم لە هەردوو لقی (جوگرافیای بیرکاریی و جوگرافیای سروشتیی) کۆیان دەکردنەوە، ئەم بیریارانە باسی ئەم بابەتانەیان لە نێو کتێبە گەردووناسیی و فەلسەفییەکانیاندا دەکرد و هەندێك جاریش بە بابەتی تایبەتی لەم دیاردانە و لێکۆڵینەوەکانیان دواون.

لە دیارترین ئەو فەیلەسوفانەشی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەی کردووە و بابەتی داناوە، فەیلەسوف (الكندي)یە کە چەند (رسائل)ێکی داناوە و تیایدا باسی لە چەند بابەتێکی جوگرافی کردووە، وەك (الرسالة الكبرى في الربع المسكون، رسالة في العلة التي لها يبرد أعلى الجو و يسخن ما قرب من الأرض، رسالة في العلة التي لها تكون المواضيع لا تكاد تمطر، رسالة في علة كون الضباب و الأسباب المحدثة له، رسالة في علة كون الثلج و البرد و الصوائق و الرعد و الزمهرير، رسالة في علة الفاعلة للمد و الجزر)، ئەمە جگە لە چەندین بابەتی دیکەی گرنگ لەم بوارەدا[2].

لە دیارترین ئەو بابەتە جوگرافییانەشی کە (الكندي) پێناسراوە، دیارییکردنی جۆرەکانی (المد و الجزر)، هەڵکشان و داکشان و باسکردنێتی و هەروەها ڕۆڵی

(١) الجغرافيا و التجارة بحث من كتاب تراث الاسلام، بإشراف السر توماس آرنولد، تر. جرجيس فتح الله، ج١/ص٩٤.

(٢) الكندي: رسائل الكندي الفلسفية، ج٢/ ص١١٠ – ١٢٨ – ١٣١.

مانگی لەو بوارەدا ڕوونکردۆتەوە، بەوەی کە مانگ کاریگەری گەرمی هەیە لەسەر زەوی، ئەمەش ئەبێتە هۆی زیادبوونی گەرمیی تیشکی خۆر لەسەر زەوی، ئەم گەرمییەش لە ئەنجامی فراوانبوونی قەبارەی هەواوەیە، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی قەبارەی ئاوی دەریاکان کاتێك کە مانگ بەسەریاندا تێدەپەڕێت، ئاشکرایە سەرباری ئەوەی ئەم بۆچوونە بەهۆی پێشکەوتنی لایەنی زانستییەوە لەم سەردەمەدا تا ڕادەیەکی زۆر هەڵەیە، بەڵام بۆ ئەو سەردەمە گەلێ زۆرە کە کەسایەتییەك ئاوا بابەتە جوگرافییەکان شیکار بکات[1].

بەم جۆرە دەبینین لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، ئەگەر بە شێوەیەکی پوختیش بووبێت بە کاریگەریی لایەنی جوگرافیای شارستانیەتی یۆنانیی، ڕەنگدانەوەی دیاری جوگرافیا هەبووە، کە بووە بنەمایەکی بەهێز بۆ ئەو لایەنە فراوانەی جوگرافیا کە لە سەردەمەکانی پاش عەبباسیی یەکەمدا دەرکەوت، بەتایبەتی کە چەند لقێکی وەك (البلدانیون)ی بۆ زیاد بوو، بە جۆرێك کە جوگرافیا لە شارستانیەتی ئیسلامییدا وەك لقێکی سەربەخۆی لێهات.

**سێیەم: مۆسیقا:**

یەکێکی دیکە لە دیارترین بابەتە وەرگێڕدراوەکانی شارستانیەتی یۆنانیی، زانستی مۆسیقایە، بەتایبەتی لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، کە ڕەنگدانەوەیەکی بەرچاوی هەبوو، هەر لە بوارەکانی دانانی ئاواز و ئامێرەکانی مۆسیقا و شێوازەکانی بەکارهێنانی و هەروەها چەندان بابەتی دیکەی وەك گۆرانی وتن و شێوازی دانانی کتێب لەسەر بابەتەکانی مۆسیقا بە گشتی.

مۆسیقا بۆخۆی زاراوەیەکی (یۆنانی)یە کە بە واتای ئاواز بەکارهاتووە، هەروەها بە گۆرانی وتراوە (مۆسیقۆر، یان مۆسیقار)[2]، ئەوەی زیاتر بووە هۆی پەرەسەندنی مۆسیقا لە شتارستانیەتی ئیسلامییدا هاندانی بەردەوامی خەلیفەکانی سەردەمی عەبباسیی یەکەمدا بوو، بەتایبەتی (هارون الرشید و المأمون)، بۆ مۆسیقا ژەنان و

---

(١) م.ن، ج٢/ ص١٢٨ – ١٣١.

(٢) الخوارزمي: مفاتيح العلوم: ج١/ ص١٣٦.

گۆرانی بێژان لەلایەك و هەروەها بەردەوامی و بەهێزبوونی بزووتنەوەی وەرگێڕان كە چەند مۆسیقایەك و بابەتێكی گرنگیان لـەبارەی مۆسـیقاوە وەرگێـڕا، بەتایبـەتی لـە (یۆنانی و وە بێزەنتییەكان و فارس)ەوە[1].

لێرەوە لـە سـەردەمی یەكـەمی عەبباسـییەكاندا، چـەند زاراوەیـەكی (یۆنـانیی) كەوتـە نـاو شارسـتانیەتی ئیـسلامییەوە، وەك ڕەنگدانـەوەی ئـەو كاریگەرییـە، لـەو زاراوانەش وشـەی (مۆسـیقا)، هـەروەك باسمـان كـرد، هـەروەها وشـەی (أرغـن) كـە ئـامێرێكی مۆسـیقای (یۆنـانیی – ڕۆمـانیی) بـووە، لـە ئـەنجامی پێـشكەوتنی ئـەم زاراوەیەش لە شارستانیەتی ئیسلامییدا ئەنجام زاراوەی (أنغام)ی لێوە داتاشرا[2].

هەروەها لە ئەنجامی وەرگێڕانی بابەتە مۆسیقاییەكانەوە چەند بابەتێكی گـرنگ لەلایەن بیریاران و فەیلەسوفانەوە دانران كـە وەك ڕەنگدانـەوەی گرنگـی كاریگـەریی لایـەنی مۆسـیقا لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا دەركـەوتن، لـە دیـارترین ئـەو فەیلەسوفانەش كە بابەتی هەیە لە سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكاندا (الكندي)ە كە چـەند بابـەتێكی لـە بـواری مۆسـیقادا دانـاوە، لـەو بابەتانـەش: (رسـالة الكـبرى في التأليف، كتاب رسالته في ترتيب النغم الدالـة علـى طبـائع الأشـخاص العاليـة و تـشابه التأليف، كتاب رسالته في المدخل الى صناعة الموسيقي، كتاب رسالته في خبر صـناعة التـأليف، كتـاب رسـالته في صـناعة الـشعر، كتـاب رسـالته الأخبـار عـن صـناعة الموسيقي.....)[3].

هەروەها (الكندي) چەندین داهێنانكاری لە بواری مۆسیقادا كردووە، بـۆ نموونـە شـێواز مۆسـیقای عـەرەبی دابـەش كـردووە بەسـەر (١٢) نیـوە دەنـگ لەسـەر ئـەو شێوازەی كە لە یۆنان پەیڕەو دەكرا، هەروەها نیشانەی تایبەتیـشی بـۆ ژێ یـەكانی

(١) د.حسين الحاج حسن: م.س، ص١٤٩ " الجميلي: م.س، ص٤٥٣.

(٢) الخوارزمي: مفاتيح العلوم، ج١/ ص١٣٦" الجميلي: م.ن، ص٤٥٤.

(٣) بروانة: إبن النـديم: م.س، ص٢٥٧" إبـن العـبري: م.س، ص٢٧٢" القفطـي: م.س، ص٣٧٠ " إبن صاعد الأندلسي: م.س، ص٢٧٢.

مۆسیقا دانا و ناوێکی تایبەتیشی بۆ هەریەکێکیان لەو نیوە دەنگانە دانا بە پێی پیتەکانی ئەبجەدی[1].

هەروەها لە بارەی کاریگەریی مۆسیقای یۆنانیی لەسەر شارستانیەتی ئیسلامیی، (زیغرید هونکە) دەڵێت: ((عەرەب هەتا سەدەی سیانزدەیەم ئەو شێوازە مۆسیقیەیان بەکار دەهێنا کە فیساگۆرس داینابوو، ئەمەش بە پێی ئەو گۆڕانکارییانەی کە فارس و بێزەنتەکان بەسەر ئەو بنەچەکەیدا هێنابوویان[2])).

بەهەرحاڵ، لە سەردەمی یەکەمی عەباسییەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە مۆسیقاژەن و گۆرانیبێژ هەبوون، لە دیارترینی ئەوانە کە ناویان هەیە (إبراهیم الموصلي، إسحاق الموصلي، منصور الزلزل، سماط المغني، یزید الحوراء، إبراهیم المهدي (کوڕی خەلیفە المهدي)، علیة بنت المهدي، إبن جامع، زریاب، متیم الهاشمیة، مخارق، علویة، سلیم بن سلام، أبو زکار الأعمي، فلیح بن أبي عوراء، زبیر بن دحمان، معبد الیقطیني، فریدة الکبری، بذل، عریب، الکندي، فریدة جاریة الواثق، أحمد بن صدقة، شاریة)[3].

لە دیارترین ئەوانەی کە زۆرترین ڕۆڵیان هەبووە لەم بوارەدا و بە پێشەنگ دەناسرێن و نوێکاریی و داهێنانکاریان لەم بوارەدا کردووە، باس لە سیانیان دەکەین، ئەوانیش:

**١- إبراهیم الموصلي (١٢٥ – ١٨٨ك / ٧٤٢ – ٨٠٤م):**

ئەم کەسایەتییە ناوی تەواوی (إبراهیم بن میمون بن ماهان بن بهمن بن النسك)ە لە بنەچەدا خەڵکی ناوچەی (أرجان) بووە و فارسە، پاش ئەوەی بنەماڵەکەیان کۆچ دەکات بۆ کوفە، لەوێ لە ساڵی (١٢٥ك) لە دایك دەبێت، لە تەمەنی هەرزەکارییدا دەچێتە موسڵ و پاش مانەوەی لەوێ بە ماوەیەك بە (الموصلي) دەناسرێت، پاشان

---

(١) د.عادل البکري: صفي الدین الأرموي، مجدد الموسیقي العباسیة، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٣٩٨هـ/١٩٧٨م،ص١٠٢.

(٢) شمس العرب تسطع علی الغرب، ص٤٩١.

(٣) بۆ زیاتر شارەزایی لەم بارەیەوە بڕوانە: د.عادل البکري: م.س، ل ٨٩ - ١٠٥.

به مەبەستی زیاتر شارەزابوونی لە بواری مۆسیقادا سەردانی ناوچەی (الري) و پاشان (شام) دەکات.

پاشان دەچێتە بەغداد و لەوێ پەیوەندیی بە خەلیفە (المهدي)یەوە دەکات و دەبێتە مۆسیقاژەنی دەرباری خەلافەت لە سەردەمی هەرسێ خەلیفە (المهدي، الهادي، الرشید)دا، لێرەوە ناوبانگی گەورە پەیدا دەکات، دەگوترێت کە نزیکەی (٩٠٠) ئاوازی مۆسیقای داناوە و بەهۆی قامیشەوە توانیویەتی جۆرە ئامێرێکی مۆسیقا دابهێنێت و چەند چاکسازییەکی لە بواری ئامێری (عود)دا کردووە و چەند هەڵەیەکی تیادا ڕاستکردۆتەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە چەندین مۆسیقاری گەورە لەسەر دەستی فێری مۆسیقا و هەروەها گۆرانی وتن بوون، ئەمانەش وایکردووە کە لەلایەن خەلیفەکانەوە جێگای ڕێز بێت و بڕێکی زۆر پارەیان پێداوە، لەوانە باس لەوە دەکرێت کە جارێکیان خەلیفە (الهادي) (١٠) هەزار درهەمی پێداوە، دیارترین کەسایەتییش کە لەسەر دەستیدا فێری مۆسیقا بووبێت (إسحاق الموصلي) کوڕی بووە[(1)].

## ٢- إسحاق بن إبراهيم الموصلي (١٥٠ – ٢٣٥ك / ٧٦٧ – ٨٥٠ز):

یەکێکە لە شارەزاترین کەسایەتییەکانی بواری مۆسیقا لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا، شایەنی باسە ئەم کەسایەتییە سەرباری ئەوەی کە مۆسیقاژەنێکی شارەزابووە، هەروەها وەك کەسێکی خەریکبوو بە بواری مۆسیقاوە، ناسراوە، بەڵام شارەزایی لە زۆربەی زانستەکانی تریشدا هەبووە، ئەمەش یارمەتی ئەوەی داوە کە زۆر لە خەلیفەکانی سەردەمی خۆی نزیك بێت، تەنانەت خەلیفە (هارون الرشید) نازناوی (أبا صفوان)ی لێناوە، بەڵام بەتایبەتی لە (المأمون و الواثق) زیاتر نزیك بووە، کە ڕێزێکی زۆریان لێگرتووە، بۆیە داوای لە خەلیفە (المأمون) کردووە کە ڕێگای بدات تا لە کۆڕی زانستیی خەلیفەدا بەشدار بێت، نەك لە کۆڕی مۆسیقا و

(١) إبن خلكان وفيات الأعيان، ج١/ ص٢٠٢" الأصبهاني: الأغاني، ج٥/ ص١٦٩" الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٦/ص٦٥ " ياقوت الحموي: معجم الأدباء، ج٢/ ص١٢٩" د.حسين الحاج حسن: م.س، ص١٥٠ " البكري: م.س، ص١٥٠.

گۆرانیی، خەلیفەش ڕێگای داوە، بەم جۆرەش ئەم کەسایەتییە یەکەم کەس بووە لە مۆسیقاژەنەکانی دەرباری خەلیفە، کە بەبێ ئامێری مۆسیقا (عود)، لە کۆڕەکاندا ئامادە ببێت و هەرکاتێکیش داوایان لێبکردایە کە گۆرانیی بڵێت، داوای (عود)ەکەی دەکرد و بۆیان دەهێنا.

دەڵێن کە خەلیفە (الواثق) لەبارەیەوە گوتویەتی: ((هەرکاتێك کە إسحاق گۆرانییم بۆ دەڵێت وا دەزانم کە لە موڵکەکەم زیاد دەکات)).

شایەنی باسە ئەم کەسایەتییە لە بواری پێشخستنی مۆسیقا و داهێنانکارییدا ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە، لەوانەش توانیویەتی ڕەگەزەکانی مۆسیقا ڕاست بکاتەوە، هەروەها سەرباری ئامێری (عود)، زۆرێکی لە مۆسیقا دیارەکانی سەردەمی خۆی زانیوە، لە ساڵی (٢٣٥ك) کۆچی دوایی کردووە[(١)].

٣- زریاب (ت.٢٣٨ك / ٨٥٢ز):

ناوی تەواوی (أبو حسن علي بن نافع) بووە، یەکێکە لە گەورەترین و ناودارترین ئەو کەسانەی کە لە سەردەمی یەکەمی عەبباسییەکاندا بە بواری مۆسیقاوە خەریك بووە، چەندین داهێنراوی گەورەی لەو بوارەدا کردووە، لە بارەی ڕەچەڵەکی ئەم کەسایەتییەوە هەرچەندە هیچ یەکێك لە سەرچاوە ڕەسەنەکان ئاماژەیان بۆ نەکردووە، بەڵام هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسان، بەتایبەتی (زیگرید هونکە) بە کورد ناوی بردووە[(٢)]، هەروەها (لیفی بروفنسال) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی دیکەیە پێیوایە کە خەڵکی ناوچەی جەزیرەیە[(٣)]، بەڵام زۆرینەی سەرچاوە ڕەسەنەکان کە باس لە ژیاننامەی ئەم کەسایەتییە دەکەن دەڵێن لەبەر ئەوەی کە ڕەش پێست بووە و هەروەها دەنگی زۆر خۆش بووە و زۆر باشیش زاراوەکانی دەربڕیوە، بۆیە

---

(١) الأصبهاني: الأغاني، ج٥/ص٢٧٨ بە دواوە" إبن عساكر: تاريخ دمشق، ج٨/ل ١٤٧ – ١٦٥، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی (www.ahlalhadeeth.com) " الصفدي: الوافي بالوفيات، ج٣/ص١٦٢.

(٢) شمس العرب تسطع على الغرب، ص٤٨٨.

(٣) وەرگیراوە لە: الزركلي: قاموس الأعلام، ج٥/ص٢٨.

پێیانوتووه (زریاب) که به واتای (طائر غرد السود)[1]، ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت کەواتە کورد نەبووە، چونکە ئاشکرایە کورد و خەڵکی ئەو ناوچەیەی کە وڵاتی کوردانە، ڕەش پێست نین، بەڵام ئەگەر چاوێك بە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبییدا بگێڕین دەگەینە ئەنجامێك، ئەویش ئەوەیە ئەم زاراوەیە (زریاب) لە زاراوەی (زرآب)ی فارسی نزیکترە کە بە واتای (زێڕ ئاو)، یاخود ئاوی زێڕ، دێت کە (آ)ەکە گۆڕدراوە و بووە بە (ی)[2]، بەم جۆرەش دەتوانین بڵێین کە کورد بووە، کە بۆچوونی ئێمەش لەگەڵ ئەمەیاندا زیاتر یەك دەگرێتەوە.

بەهەرحاڵ، ئەوەی کە پەیوەندیی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت ئەوەیە کە ئەم کەسایەتییە لە سەرەتای ژیاندا کۆیلەی خەلیفە (المهدي) بووە، پاش ئەوە لە تەمەنی هەرزەکارییدا ئازادی دەکات، ڕوو دەکاتە بواری مۆسیقا و دەچێتە لای (إبراهیم الموصلي) و فێری مۆسیقا دەبێت، پاش ئەمیش لەلای (إسحاق الموصلي) وانەکانی تەواو دەکات، سەرەتای دەرکەوتنی وەك مۆسیقاژەن و خەریکبوویەك بە بواری مۆسیقاوە، لە نێو سەرچاوە مێژووییەکاندا لەو کاتەوە دەردەکەوێت کە جارێك لە کۆڕێکی خەلیفە (هارون الرشید)دا مۆسیقا دەژەنێت و خەلیفە زۆر مۆسیقا ژەنینەکەی پێخۆش دەبێت، بەتایبەتی کاتێك لە (إسحاق الموصلي) مامۆستای باشتر دەبێت، لێرەوە (إسحاق الموصلي) ترسی ئەوەی لێدەنیشێت کە لەلای خەلیفە جێگای بگرێتەوە، بۆیە دووری دەخاتەوە و بە جۆرێك دەینێرێت بۆ (أندلس)، شایەنی باسە ئەم دوورخستنەوەی بە خاڵی وەرچەرخان دادەنرێت لە ژیانی (زریاب)دا، چونکە لە (أندلس) لەلایەن (عبدالرحمن بن الحکم) کە یەکێك دەبێت لە خەلیفەکانی دەوڵەتی ئومەوی لە (أندلس) بەخێرهاتنی گەرمی لێدەکرێت و ڕێزێکی زۆری لێدەگرێت، ئەمە سەرباری ئەوەی کە مانگانە بڕی (٢٠٠) دیناری

---

(١) إبن عبد ربه: العقد الفريد، دار أحياء التراث العربي، بيروت، ١٤٢٠هـ/ ١٩٩٩م، ج٦/ص٤٢" د.محمود أحمد الحفني: زرياب أبو الحسن علي بن نافع الموسيقار الأندلسي، دار مصر للتأليف و الترجمة، (د.ت)، ص٩.

(٢) الزبيدي: تاج العروس، ج٣/ص١١" الزركلي: م.س، ج٥/ص٢٨" الحفني: م.س، ص١٠.

دەداتێ و جەژنانەش بڕی (١٠٠٠) دینـاری پێـداوە، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە چـەندین دیاریی بە نرخی دیکەی پێبەخشیوە [1].

لێرەوە ئیدی بەرە بەرە لە خەلیفەکان نزیك دەبێتەوە و بە جۆرێك نەك تەنها لە بواری مۆسیقادا، بەڵکو لە زۆرێك لە بوارەکانی دیکە کـە شـارەزایی تـەواوی هـەبووە تیایانـدا پرسـی پێدەکـەن، ئەمـە یارمـەتیی دەدات کـە لـە بـواری مۆسـیقادا بـەرەو پێشەوە بچێت و هەروها چەندین داهێنانکاریی بکات لـەو بـوارەدا، لـە دیـارترین ئـەو داهێنانکارییانەی کە کردوویەتی، ژێ (وتر)ی پێنجەمی بۆ ئامێری (عود) داناوە، کـە لە پێشدا لە چوار ژێ (وتر) پێکـدەهات، هـەروەها یەکـەم خوێنـدنگای مۆسـیقای لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامییدا دامەزرانـد کـە خوێنـدکارەکانی کاتێـك لـەم خوێندنگایـە دەردەچوون، شارەزایی تـەواویان لـە بـواری مۆسـیقا و گۆرانییـدا هـەبوو، هـەروەها خوێندکارەکانی بە شێوەی چاوپێکەوتن وەردەگیران، هەروەها لە کـارە گرنگـەکانی دیکەی بۆ یەکەم جار گرووپ و تیپی مۆسیقای دروستکرد کە سەرجەمیان یـەك جـۆر جلوبەرگیان لەبەردا بوو، ئەمانە و چـەندان جـۆری دیکـە لـە بـواری گـۆرانی دانـان و مۆسیقا و ئـاواز کـە دەدرێتـە پـاڵ ئـەم، بـەم جـۆرەش دەبیـنین کـە (زریـاب)، وەك دیارترین ڕەنگدانەوەی بواری مۆسیقا لە شارستانیەتی ئیسلامییدا، ببێتە یـەکێك لـە دیارترین کەسایەتییەکان لەم بوارەدا و ئەو کارانەی کـە تـا کۆتـایی تەمـەنی کـە لـە سـاڵی (٢٣٨ك) کۆچـی دوایـی کـردووە[2]، ببێتـە باشـترین دیـاردەی مۆسـیقا و وەك سەرچاوەیەکی گرنگی مۆسیقا لەم شارستانیەتەدا سەیری بکرێت.

---

(١) إبـن عبـد ربـه: العقـد الفريـد، ج٦/ص٤٢ " إبـن سـعيد المغربـي: المغـرب في حلـي المغـرب، تح.د.شوقي ضيف، دار المعارف، القاهرة، ج١/ص٥١" زيغريـد هونكـة: م.س، ص٤٨٨ – ٤٩٥ " البكري: م.س، ص٩٤،٩٥.

(٢) أحمد بن المقري التلماسي: نفح الطيب من غـصن الأنـدلس الرطيـب، تـح.إحـسان عبـاس، دار صادر، بيروت، ١٩٩٧م، ج٣/ص١٢٦ به دواوه" البكري: م.س، ص٩٥.

# ئەنجام:

١- لـە ڕووی زمانەوانییـەوە، چـونیەکیەکی نزیـك لـە نێـوان زۆربـەی زمانـە زیندووەکاندا هەیە، سـەبارەت بـە زاراوەی (شارسـتانیەت)، ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە، چونکە سەرەتای ئـەم زمانانـە لـە یـەك بنەچـەی لاتینـی بابەتەکـەیان وەرگرتـووە و زاراوەیەکی گریکییە.

٢- شارسـتانیەت لـە ڕووی مانـای زاراوەییـەوە بریتییـە لـە سـەرجەمی ئـەو پێشکەوتنە مـاددیی و مەعنـەویی و عەقڵییانـەی کـە بـە هـەوڵ و مانـدووبوونی مـرۆڤ بەدەست دێت و دەبێتـە هـۆی بەرەوپێشـچوونی کۆمـەڵگا لـە سـەرجەم بوارەکانـدا، بەمەش ئەو کۆمەڵگایـە بـەرەو ئاسـتێکی زۆر بـەرزتر لـەوەی کـە تیایـەتی دەڕوات و دەبێتە کۆمەڵگایەکی شارستانیی.

٣- شارســـتانیەتی گریکیـــی یەکێکـــە لـــە نـــاوەزەترین و پێـــشکەوتووترین شارستانییەتەکانی کۆن و وەك ڕەنگدانەوەیەکی شارستانییەتەکانی پێش خۆی و بە داهێنانکاریی فەیلەسوف و بیرمەندەکانی دروست بـوو، کـە پـاش کۆبوونـەوەیان لـە پایتـەختێکی وەك (ئەسـینا)دا، گەیـشتە چـڵە پۆپـە و لـق و پـەلی بـە سـەرجەم ناوچەکانی دیکەی دەوروپشتی خۆیدا کێشاو بە فەیلەسوف و بیرمەند و زانستەکانی دنیای کۆنی ڕووناك کردەوە.

٤- ئەسـکەندەری مەکـدۆنی وەك یـەکێك لـە خوێنـدکارەکانی گـەورەترین و دیارترین فەیلەسوفانی سەردەمی خۆی کە ئەرستۆ بـوو، هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی ئـەو شارسـتانیەتە درەوشـاوەی دا، بەمـەش ڕووی کـردە ڕۆژهـەڵات و چـەندین ناوچـەی داگیرکـرد و چـەند شارێکیـشی تیـادا دروسـت کـرد، لـە ئـەنجامی تێکـەڵبوون و ئاوێتەبوونیشی بە شارستانیەتی پێشینەی ڕۆژهەڵات، شارسـتانیەتێکی نـوێ سـەری هەڵدا ئەویش شارستانیەتی هیللینی بوو کـە پایتەختەکـەی ئەسـکەندەرییەی میـسر بوو.

٥- به داهاتنی سەدەکانی ناوەڕاست و دروستبوونی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمـانیی و دانانی ڕۆمانەکان بە ئایینی مەسیحییدا و زاڵبوونی کەنیسە بەسەر بڕیارەکـانی ئـەو ئیمپراتۆرییەتەدا، ئیدی سەردەمی داڕمـانی شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا دەسـتی پێکـرد، ئەم شارسـتانیەتە تووشـی پوکاندنـەوە هـات و سـەرجەم نووسـراوە زانـستییەکان و فەلـسەفییەکان و دیمەنـەکانی شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا کـە بریتـی بـوو لـە گریکیـی و سەرەتای ڕۆمانییەکان، شاردرانەوە و کۆکرانەوە و لە ژێرزەمینی کەنیـسەکاندا قـایم کران، بەڵام بەهاتنی شارسـتانیەتی ئیـسلامیی و بەتایبـەتی لـە سـەردەمی یەکـەمی عەبباسییەکان و لە کاتی ڕابوونی شارستانیەتی ئیسلامییدا، بـە سـوودوەرگرتن لـەم شارستانیەتە، توانرا شارسـتانیەتی ئیـسلامیی بـچێتە نـاو چـەرخی زێڕینـی خـۆی و بەرەو بوژاندنەوە بچێت.

٦- لە ئـەنجامی پڕۆسـەی فتوحـاتی ئیـسلامییەوە، ژمارەیـەکی زۆر لـە گـەل و نەتەوەی جیا جیا کەوتنە ژێر سایەی خەلافەتی ئیسلامییەوە، پـاش مـسوڵمانبوونی زۆرینەیان کە بە مەوالیەکان ناسران و هەندێکیشیان کە ئایینەکانیان لە چوارچێوەی (أهل الكتـاب) بـوو، وەك مەسـیحیەکان کـە بەشـێوەیەکی گـشتیی لـە سـریانەکان و بەتایبـەتی لـە (یعاقبـة و نـسطور)یـەکان و جوولەکـە و صـابیئەکان، لەسـەر ئـایینی خۆیـان مانـەوە کـە بـە (أهـل الذمـة) ناسـران و خوێنـدنگا و ناوەنـدە زانـستیی و شارستانییەتەکانیان کە هەڵگری شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا بـوون و لـە پـێش فتوحاتـدا لەژێر سایەی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانییدا بوون، وەك خۆی مایـەوە و بـە دانـی (جزیـة) لەلایـەن مـسوڵمانانەوە وازیـان لێهێنـرا، ئـەمانیش لـە ڕێگـای گفتوگـۆ و پـەیڤین و تێکەڵبوونیانەوە شارستانیەتی ڕۆژئاوایان گەیاندە شارستانیەتی ئیسلامیی.

٧- (أهل الذمة) لە ناو شارستانیەتی ئیسلامییدا تا کۆتایی سـەردەمی یەکـەمی عەبباسـییەکانیش خـاوەنی پلـە و پایـە و ڕێـزی تایبـەتیی بـوون لـەناو دەوڵـەتی خەلافەتدا و ئەمەش ڕێگەی دابوون چەند لایـەنێکی پەیوەندیـداری شارسـتانیەت بـۆ خۆیـان قـۆرخ بکـەن وەك لایـەنی پزیـشکیی و وەرگێـڕان کـە زۆرینـەی وەرگێـڕە کارامەکان سەر بە ئەمان بوون.

٨- لـه ڕۆژهەڵاتـدا چـەند شـارێك هـەبوون كـە بـە ناوەنـدەكانی شارسـتانیەتی ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵات دادەنرێن، كە هەریەكەیان و بەپێی بارودۆخێكی مێژووكرد، وەك ناوەند دەركەوتبوو، لەوانەش (ئەسكەندەریە) لـە میـسر كـە لەلایـەن ئەسـكەندەری مەكدۆنیـەوە دروسـت كرابـوو و لـە سـەردەمی هیللینیـدا بـوو بـووە پایتـەختی ئـەو شارستانیەتە و جێگای شاری (أثینا)ی گرتبـۆوە، هـەروەها (حـران) كـە پاشمـاوەی سوپاكەی ئەسـكەندەری مەكدۆنی تیـادا نیـشتەجێ بووبـوون و شارسـتانیەتەكەیان تیـادا بڵاوكردبـۆوە و (أنطاكیـا) و (نـصیبین) و (روهـا)ش بـە هـۆی نزیكیـان لـە ناوەنـدەكانی شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا و خوێنـدنی زانـستەكانیان بووبوونـە ناوەنـد، هەرچی (جندیسابور)ە لە بنەچەدا بۆ ئەو فەیلەسوف و بیریار و پزیشك و ئەندازیارە گریكییانە لەلایەن شاپوری یەكەمەوە دروستكرا كـە لـە دەست ئیمپڕاتـۆر ڤالیریـان هـەڵاتبوون كـە مەبەسـت پێـی بڵاوكردنـەوەی شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا بـوو بەمـەش جندیسابور بووە ناوەندێكی بەهێزی ئەو شارستانیەتە لە ڕۆژهـەڵات، ئـەم ناوەندانـە كاریگەریی ڕاستەخۆیان هەبوو لە گەیاندنی شارستانیەتی ڕۆژئـاوا بـە شارسـتانیەتی ئیسلامیی لەپاش فەتحكردنیانەوە.

٩- بزووتنەوەی وەرگێڕان بە یەكێك لە گرنگترین و دیارترین ڕێگا ڕاستەخۆكانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دادەنرێـت بـە شارسـتانیەتی ئیـسلامیی و پێـی كاریگـەربوونی دادەنرێت، سەرباری ئەوەی ئەم بزووتنەوەیە لە سەردەمەكانی پێشوو، بەتایبەتی لە سەردەمی خەلافەتی ئومەویەكاندا زیاتر هـەوڵی تاكەكەسـیی بـوو، بـەڵام بـە هـاتنی سەردەمی یەكەمی عەبباسییەكان چەرخی زێڕینی بزووتنەوەی وەرگێڕانیش دەسـتی پێكرد و بە هاندان و چاودێریی هەندێك لـە خەلیفـەكانی، وەك (أبـوجعفر المنـصور و هارون الرشید و المأمون و الواثق) گەیشتە ترۆپك، كە بە دامەزراندنی (بیـت الحكمـة) لـەم سـەردەمەدا ئیـدی وەرگێـڕان دەچـێتە قۆنـاغی بەدەزگاییبوونـەوە و هـەنگاوی گەورە بۆ بەرەوپێشچوونە دەنێت.

١٠- چەند هۆكارێك هـەبوون كـە بوونـە زیـاتر پاڵنـانی بزووتنـەوەی وەرگێـڕان، لەوانـەش پاڵنـەری ئـایینی كـە ئـایینی ئیـسلام بـۆ خـۆی هانـدەرێكی وەرگرتنـی

